دوو کتێب لە یەک بەرگدا:

# فەلسەفەی یاسا

# لۆژیکی یاسایی لە وێناکردندا

نووسینی

**دکتۆر مصطفى زەڵمی**

وەرگێڕانی

**کەمال شێخ محەمەد**

سەرپەرشتیاری پرۆژە
ڕێدار ڕەئوف ئەحمەد

# فلسفة القانون

# فەلسەفەی یاسا

نووسینی : دکتۆر مصطفی زەڵمی
وەرگێڕانی : کەمال شێخ محەمەد
پێداچوونەوەی : توفیق کەریم
نەخشەسازی : جمعە صدیق کاکە
نۆرەی چاپ : چاپی یەکەم ٢٠١٧

نرخی هەر بیست و شەش بەرگ
٢٥٠٠٠٠ دینار



لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٧٤٤) ساڵی ٢٠١٦ی پێدراوە

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧ ﴾

سورة الأنبياء/ ١٠٧

# ناوەرۆك

**بەندی پێنجەم**

# پێشەکی (دەست پێك)

هۆکاری کاریگەر لەهەڵبژاردنی ئەم باسەدا بۆ توێژینەوە و لەسەر نوسین ، زۆر لەوانە:

**یەکەم:** شتێکی بەڵگەنەویستە ئەوەی کەمرۆڤی پێگەیشتو (بالغ) و خاوەن ئاوەز سەرپشك و هۆشیار و ئامانجدار ئەنجامی دەدا لەگوتەو کردار هۆکاری پاڵنەری کەرەستەی (مادی) و مەعنەوی هەیە کە ئەنجامدەرەکەی پێی دەزانێت ، بەهۆیەوە ویستی خۆی ڕوبەڕوی ئەو کارە ئاڕاستەدەکات لەکاتی بەکارهێنانی هۆکارەکەیدا ، کەواتە ئەو زانراوە هەست پێکراوە کەبزوێنەری ویستە لەو ڕوەوە کەلەوێنا کردندا لەپێشەوەیە پێی دەوترێت ( ناودەبرێت ) هۆکاری پاڵنەر و مەبەست و ئامانج و هیوا و هۆکاری پێوستکەر (وجب) ، لەو لایەنەوە کەلەبوون و بەدیهێناندا لەدواوەیە پێی دەگوترێت سەرئەنجام و هۆکاری ئامانجی و ئەنجام و بەئامانج گیراو بەرژەوەندی و مەبەست وێنەی ئەوانە ، کەوابوو هەموو زاراوەیەك ئالەم زاراوانە پێی دەگوترێت فەلسەفە لای ئەو زانایانەی کەگرنگی دەدەن بەزانینی کاکڵەی شتە خۆویستەکان و ئەنجامەکانیان لەیاساکانی و شتەکانی تردا. کەوابوو بۆ هەموو داخوازی یەکی خۆویستانە فەلسەفەیەکی تایبەتی جۆریی هەیە کەدەچێتە ژێر ڕەگەزی فەلسەفەی گشتی یەوە.

**دووەم:** قورئانی پیرۆز فەلسەفەی پەیامی پێغەمبەری خوای تەنها لەچوارچێوەی بەرژەوەندی مرۆڤدا کۆکردۆتەوە ، لەبەرئەوەی خوای گەورە بێ پێویستی ڕەهایە لەکردەوەکانی مرۆڤ ئەوەتا فەرمویەتی بەرامبەر پێغەمبەرەکەی ( وما أرسلناك إلاّ رحمةً

للعالمین)[1] واتە: تۆمان بەهیچ حالێ نەناردووە بەخێر و بەرەکەت نەبێ بۆ هەموو جیهان. کەواتە وشەی ( رحمة) لەم ئایەتەپیرۆزەدا ولتای : بەرژەوەندی دەگەیەنێت ئیتر ئەرێنی بێت ( سودێکی هێنراو ) یان نەرێنی واتە: زیانی لادراو ماددی بێت یان مەعنەوی دنیایی یان قیامەتی.

**سێ یەم:** فەلسەفەی یاسا مرۆڤ کردەکان کەدروست کراوی دەستی مرۆڤن لەهەموو ولاتانی جیهاندا ، بریتی یە لەبەرژەوەندی ئەو میللەتانەی کەمل کەچن بۆی ، لەپێداویستی و داواکاری یەکانی ژیان لەهەموو بوارو کات و شوێنێکدا.

فەلسەفەی دانان و گۆڕینی یاساکان و ڕاست کردنەوەیان و هەڵوەشاندنەوەیان لەلایەن دەستەڵاتی یاسادان بریتی یە لەماف و پێداویستی یە ئەرکە سنوردارەکان بۆ کەسێك ملکەچیانە.

فەلسەفەی چەسپاندنی یاساکان لەلایەن دەستەڵاتی داوەری یەوە بریتی یە لەدادگەری (پێدانی ماف بەهەر کەسێك کەشایستەیەتی)،یەکسانی( بەرجەستەکردنی هاوسەنگی و بەسهێنانی لەنێوان ماف و ئەرکەکاندا ).

فەلسەفەی پراکتیکی کردنی یاساکان لەلایەن دەستەڵاتی جێبەجێ کردنەوە بریتی یە لەوەرگرتنەوەی مافەکان لەبابەتە شارستانی یەکاندا ، چاك کردنی تاوانکار لەبابەتە تاوانکاری یەکاندا ئەویش بەگۆڕینی زیندانەکان بەفێرگەی چاکسازی فێرکردنی پیشە لەزیندانی و گیراوەکان لەماوەی جێبەجێ کردنی بڕیارەکانی یاسادا،نەهێشتنی نەخوێندەواری لەڕیزی بەندکراواندا و پێش کەش کردنی وتار و کۆڕی ئاینی و کۆمەڵایەتی و دەرونی و پەروەردەیی ناوبەناو بۆ بەندکراوان، دابین کردنی هۆکارو ئامێری خۆش گوزەرانی بۆ هەمووان، کردنەوەی مۆڵەت پیدانی خولی بۆ ئەو بەندکراوانەی سزای زەوتکردنی ئازادییان بەسەر دا سەپێنراوە ، جگەلەوەش هەرشتێك کەبێتەهۆی چاککردنی تاوانکار و بیکاتە ئەندامێکی باش کاتێك کەگەڕایەوە ناو کۆمەڵگەکەی خۆی، لەباتی ئەوەی بێتە تاوانکارێکی خوگرتوو بەبەندینخانەوە.

---

[1] ) الأنبياء : ١٠٧

**چوارەم:** نەبوونی پێناسەیەکی کۆکەرەوەی بەرگر– ئەوەندەی من بزانم – بۆ زاراوەی ( فەلسەفەی یاسا )، پاش گەڕانەوەم بۆ دەیان پەرتوك و سەرچاوە کەلەبواری یاسادا دانراون لەژێر ناونیشانی فەلسەفەی یاسا دا پێناسەیەکم دەست نەکەوت بۆ ئەم زاراوەیە کەلۆجیکی یاسایی وەری بگرێت و پەسەندی بکات ، هەر لێکۆڵینەوە و نوسراوێك کەنوسرابێت لەژێرناونیشانی ( فەلسەفەی یاسادا ) لەمێژووی فەلسەفەی یاسا و خستنەڕوی دیدگا و ڕای هەندێك لەفەیلەسوفەکانی سەردەمی کۆن و ناوەڕاست و قسەکردن لەسەریان و ڕونکردنەوەی ئاینزافەلسەفیەکان زیاتر نیە و تێپەڕناکات ، ئەوەی بزانم و بەپێی ئاگەداریم – پراکتیزە کردنی یاسایی، یاسا نوێکانم بەرچاو نەکەوتووە یان پراکتیزە دادوەریەکان کەلەسەر بناغەفەلسەفیەکان بنیات نرابن بەچەمکە ڕاستەکەیان.

**پێنجەم:** خاڵی سەرەتا کە بوو بە سەرچاوەی ئیلهام بۆ تێگەیشتنی واتای فەلسەفە بەشێوەیەکی شتی و فەلسەفەی یاسا بەشێوەیەکی تایبەتی ، دابەش کردنەکەی ئەرستۆ بوو بۆ چوار هۆکاری شتەکان: (هۆکاری بکەری ، هۆکاری کەرەستەیی ، هۆکاری شێوەیی (وێنەیی) ، هۆکاری ئامانجی ).[1]

فەلسەفەی هەموو شتێکی خۆ ویستانە،یاسا بێت یان هەرشتێکی تر واتا ئامانجەهۆکاری یەکەی ، ئامانج و مەبەستی ئەو شتە.

**شەشەم:** ناڵێم ئەوەی دەمەوێ بینوسم لەبواری فەلسەفەی یاسادا هەمووی ڕاستە، چونکە تەواویی ڕەها بەس بۆ خوایە ، بەڵام لەبیرو باوەڕی خاکی خۆماندا ئەم کارەی من ، بەهەنگاوێك بۆ پێشەوە دەدرێتە قەڵەم ،گەشەسەندنێکە لەبواری تێگەشتنی فەلسەفەی یاسادا بەواتا ڕاستەقینەکەی ، لەخوای گەورە و باڵادەست دەپاڕێمەوە کەیارمەیتم بدات لەهەنگاوەکانی داهاتوودا، بۆ خزمەت و ڕاژەی مرۆڤایەتی ئەو بەڕاستی باڵادەستە بەسەر هەموو شتێکدا.

---

[1]) بۆ نمونە کورسی دارتاش : هۆکاری بکەری یە ، دارەکە : هۆکاری کەرەستەیی یە ، شێوەی کورسی یەکە دوای تەولو کردنی هۆکاری شێوەی یە ، دانیشتن لەسەری هۆکاری ئامانجی یە.

پلانی لێکۆڵینەوەکە:

فەلسەفەی یاسا نازناوێکی لێکدراوە لەوەپاڵنراو و پاڵنراوێك ( مضاف و مضاف إليه) ئاگەداربوون و تێگەیشتن لە هەر لێکدراوێك پێویستی بەتێگەیشتنی پارچە و بەشەکانی هەیە، لەبەرئەوەی پاژ و بەشەکانی بناغەی بنیات نانی ئەولێکردراوەن ، بۆیە دەبێت بەشەکان بناسرێت ئەمجا هەموو شتەکان دەناسرێت ، کەواتە سروشتی ئەم پێکهاتنە وادەخوازێ بەش بەش لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت بەسەر سێ بەنددا دابەش بکرێت ، بۆ پێناسەی هەربەشێك (پاژێك) بەندێك تایبەت بکرێت و بۆ لێکدراوەکەش بەندێك و بۆ گرنگی بەراوردکردنی یاسایی فەلسەفەکەی لەبەرەو پێش بردنی یاسا نیشتمانیەکاندا و ڕاڤەکردنیان و ئەمیش لەچوار چێوەی بەندێك دابێت، بۆکاریگەری ڕاجیایی فەلسەفەی ڕێچکە.

فەلسەفی و یاسایی یەکان لەبارەی ڕۆڵی ویست لەسەر دادگەری و یەکسانی لەهاوسەنگی لەنێوان ماف و پابەندبوون و ئەرکەکاندا لەلایەکەوە لەنێوان قەبارەی سزا و قەبارەی تاوان لەلایەکی ترەوە گرنگی یەکی گەورەی هەیە( بەدی دەکرێت) ، لەبەر ئەوەی بەندی پێنجەم تایبەت کراوە بۆ توێژینەوە و مشتومڕ لەسەر ئەو ڕاو بۆچونانەی کەوتمان بەئامانجی گەیشتن بەڕاستی و دادگەری لەسەر ئەنجامی کارماندا لەژێر ڕووناکی ئەو بڕیارانەی ئامارەمان پێکردن دابەش کردنەکە بەم شێوەی خوارەوە دەبێت:

بەندی یەکەم — پێناسەی فەلسەفە

بەندی دووەم — یاسا

بەندی سێ یەم — فەلسەفەی یاسا

بەندی چوارەم — بەراوردکردنی یاسایی و فەلسەفەکەی

بەندی پێنجەم — هەڵوێستی ڕێچکە فەلسەفیەکان دەربارەی ویستی مرۆڤ لەهەڵسوکەوتیدا.

# بەندی یەکەم

## پێناسەی فەلسەفە

ئـەم بەنـدە لێکۆڵـینەوەی فەلسـەفە و گەشەسـەندن و بـەرەو پێشچـون و جۆرەکانی و ڕاجیایی لەدیاری کردنی چیەتیەکەی و پاشـان ڕوونکردنەوە و ڕونکاری و باسـکردنی لەدوو بواری تیـۆری و پراکتیکی دا لـەخۆدەگرێت.

لەبەرئەوەی ئەم لێکۆڵینەوە لەبواری ڕوکاریەوە دەکرێت بەچوار جێباسەوە:

یەکەمیان: تایبەتە بەسەرهەڵدان و دروست بوون و گەشەسەندنی فەلسـەفە

دووەمیان: جۆرەکانی فەلسـەفە

سێ یەمینیان: ڕاجیای فەیلەسوفەکان لەچیەتی فەلسەفەدا

چوارەمینیان : تایبەتە بەباسکردنی گرنگی فەلسەفە.

# جێباسی یەكەم:
# سەرهەڵدانی فەلسەفە و گەشەسەندنی

لێكۆڵینەوەی ئەم دوو چەمك و ناونیشانە دەكرێت بەدوو بەشەوە:

بەشی یەكەم تایبەتە بەسەرهەڵدانی فەلسەفەو و بەشی دووەم باسی گەشەسەندنی فەلسەفەیە.

## باسی یەكەم:
## سەرهەڵدانی فەلسەفە

مرۆڤ لەقۆناغی پڕلەپێویستی و ئاتاجی یەوە ،لەژیانی پڕمەترسی یەوە بۆ بەدەست هێنانی بژێوی و مل ملانێ لەگەڵ مەترسیە یەكاندا ، پێی نایە ناو جۆرێك لەژیان كەهەندێك بیركردنەوە و هزر و داهێنانكاریی هونەری تێدایە، پاشان هەڵوێستی گۆڕا و وەك جاران بەندەیەك نەبوو كەیاسای سروشتی ژیان بیچەوسێنێتەوە ، بەڵكو هاوكار بوو لەگۆڕینی ئەم یاسایە و ڕەوت و جموجۆڵی بەرەو باشتر و كەوتە بیركردنەوە و تێڕامان لە دروست بوونی ئاسمانەكان و زەوی ، پرسیاری لەخۆی دەكرد بۆچی ئەمە ئاوایە و بەشێوەیەكی تر نی یە ؟ چۆن پەیدابووە ؟ لێرەوە تۆ و ناوكی فەلسەفە تەقی و سەوز بوو ! سەركردایەتی هزری فەلسەفە لای یۆنانیەكان هەر لەسەرەتای سەدەی دەیەمی پێش زاینی یەوە وەلەدەستی شیعر و شاعیراندا بوو. لەسەدەی شەشەمی پێش زایندا لەناو نەتەوەی یۆنانی دا كودەتایەكی ترسناك ڕووی دا كاریگەریی گەورەی خستەسەر بوارە جۆربەجۆرەكانی ژیان و ئەو مۆركەی كە ئەم كودەتایەی پێ ناسرابوو بریتی بوو لە ئازادی تاك و دەركەوتنی كەسایەتی.

پاشان کاتێك کەدەستەڵات و ئەزمونی یۆنانی یەکان فراوان بوو (پەلی هاویشت)وڵاتەهاوسێ کانی گرتەوە ، کودەتایەکی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و ئابووری و هونەری و ئاینی ڕویدا ، هەموو ئەمانە بونە فاکتەرێك بۆ دەرکەوتنی کەسایەتی تاك و گواستنەوەی مرۆڤ بەرەو بارنەیەکی هزری نوێی نەترسانە (ئازایانە) بەرەو زانست و زانیاری و بیرکردنەوە و کەوتنەلێکۆڵینەوە لە هۆکارەکانی و دیاردە گەردونی یەکان تا لۆژیك و عەقڵی تازەی ڕازی بکات،لەبواری ئەم سەرهەڵدانەگەشەییەوە مرۆڤ توانی هەندێك زانیاری بۆخۆی کۆبکاتەوە کەبێتە سەرچاوەی هەڵقوڵانی فەلسەفە لەسەدەی شەشەمی پێش زاینەوە،بەم شێوەیە هزری فەلسەفی دروست سەری هەڵدا و گەشەی کرد لای یۆنانیەکۆنەکان.

شایانی باسە کەیۆنانی یەکان ئەم هزرین و بیرکردنەوە فەلسەفیەیان لەزانین و زانستی نەتەوە کۆن و دێرینەکانی ترەوە وەرنەگرتووە لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:-

أ- چین لەبنەماناکاری یە پراکتیکی یەکان زۆر شتی دەزانی دەربارەی هونەری ژیان،بەڵام لێکۆلینەوەو سەرنجی دیاردە گەردونیەکان زانستیانەو لیکۆڵەرانە نەبوو.

ب- لەناونەتەوەی فارسدا کۆمەڵێك بیرۆکەبوو دەربارەی چاکە و خراپە زاڵ بوو بەڵام ئەم برانەی تێنەپەڕاند چونکە حەزیان لە چاکەبوو بەسەر خراپەدا لەکاتی ململانێ لەنێوانیاندا.

ج- نەتەوەی هند : پڕبوو لە ئەفسانەی ئاینی ، ئەوەش بوو بەهۆی ئەوەی کەگرنگی نەدات بەلێکۆڵینەوەی وردی دیاردە گەردونیەکان. ئاوا ( بەم شێوەیە) دەبینین کە فەلسەفەی یۆنانی بناغە و ڕیشەکانی لەنەتەوە کۆنەکانەوە وەرنەگرتووە بەڵکو کورپەلە و بەدیهێنراوی خۆیانە.[1]

---

[1]) تەماشای کتێبی - قصة الفلسفة اليونانية للأستانين - أحمد زكي ، نجيب محمود بکە ل١٠ پاش لاپەڕە ١٠.

## باسی دووەم:
## بەرەو پێشچوونی فەلسەفە

فەلسەفەی یۆنانی بەکۆمەڵێك قۆناغی بەرەو پێشچوندا تێپەڕ بووە کەگرنگترینیان ئەمانەن :

١- لەسەردەمی سوقراتدا ( ٤٦٩ – ٣٩٩ پ.ن) فەلسەفەی یۆنان مۆرکێکی ئاکاری وەرگرت لەسەر ئەو بناغەیەی کەفەلسەفەی ژیان بریتی یە لەئاکار ، ئەو تایبەتمەندی یەی مرۆڤی پێ جودا دەبێتەوە و پێویستەلەکاتی مامەڵە لەگەڵ کەسانی دەوروبەردا دەربکەوێت تەنها خاڵی ئاکار و ڕەوشتە لەبەرئەوە سوقراتی فەیلەسوف جەختی لەسەر کردۆتەوە.

٢- مۆرکی فەلسەفەی ئەفلاتون ( ٤٢٧ – ٣٤٧ پ.ن) بریتی یە لەزانین لەسەر ئەو بنەمایەی کەفەلسەفە خودی کار بەجێیی یە (الحكمة) کاربەجێیش ناسینی ڕاستێتی و ڕاستەقینەی شتەکانە لەپێناو هەڵبژاردنی باشترین و هەرە گونجاوترینیان.

٣- فەلسەفەی ئەرەستۆ ( ٣٨٤ – ٣٢١ پ.ن) خاوەنی مۆرکێکی لۆژیکی( ژیرییژی ) بوو لەسەر ئەو بناغەیەی کە لۆژیك کارکردن و هەڵسوکەوت کردنە بەگوێرەو داخوازی وێڵ و ئاوەزی ساغ و تەندروست و تەرازوی زانستەکانە ، بەهۆی ئەو و لەڕێگەی ئەوەوە مرۆڤ دەتوانێت ئاسۆی زانیاری یە پەیوەندیدارەکان بەژیانەوە فراوان بکات لەڕێگەی بەدەست هێنان و پەیوەندی کردنی نەزانراوەکان لەکلاوڕۆژنەی زانراوەکانەوە لەژێرتیشکی یاساکانی ژیرییژیدا (المنطق).

بێ گومان فەلسەفەی یۆنانی کۆمەڵێك گەشەسەندنی گرنگی بەخۆوە بینیوە لەژیانی مرۆڤدا بەجۆرێك لەم گەشەسەندنەیدا (پێشکەوتنەیدا) گەیشتە لوتکە و بەتەواوی پێگەیشت هەرلەسەردەمی سوفەستایی کانەوە تا کۆتایی یەکانی سەردەمی ئەرستۆ. پاشان توشی شکستی چەق بەستن و وەستان لەپێشکەوتن و بەرەوپێشەوە چونداهات و ئەم دیاردەیەش تاسەرەتای سەدەکانی ناوەڕاست ( سەدەی نۆیەمی زاینی – سەدەی پازدەهەم) بەردەوام بوو.

٤- فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست:فەلسەفە لەم ماوەیەدا مۆرکێکی ئاینی هەبوو ، بەجۆرێك لەهزرە ئاینی یەکاندا قالّ بو بو تەنها باسی زانینی خواستراو و فەلسەفە لێدانی ڕەوا لای کەنیسە ڕێگەپێدرا و بوو بۆ گواستنەوەی کەلەپور و کەلتوری ئاینی ، ئەزانین ( المعرفة) لەبەر خودی خۆی دەخوازرا و نەفەیلەسوفەکانیش بۆیان هەبوو بەئازادی بیربکەنەوە ، ئامانجی زانا زاینین و بەدەستهێنانی نهێنیەکان گەردون و وەسودهێنان و ڕاوکردنی خێروبێرەکانی نەبوو لەپێناو ڕاژە و خزمەتگوزاری و ئامانجەکانی مرۆڤدا.

ئامانجی فەلسەفە تەنها ئەوە بوو کەخودای گەورە ڕێنمونی مرۆڤ بکات بۆسەر ڕێگەیەك کەڕزگاری ئەوی تێدایە. لەسەدەکانی ناوەڕاستدا سێ جۆر فەلسەفە پەلی هاویشت ئەوانیش بریتی بوون لە فەلسەفەی ئیسلامی و فەلسەفەی یهودی و فەلسەفەی کریستیانی (المسیحیة). ئەم سێ فەلسەفە ئاینیەش هەوڵی ئاشت کردنەوە و یەکخستنی ئاین و فەلسەفە یان داوە و ئەگەر لەبوارێك لەبوارەکاندا بەیەك نەگەشتبن ، ئەوا سەرکەوتن هی ئاین بووە و لەکۆتایدا دەخرایە پێش فەلسەفەوە .سەرەڕای ئەوەش ئاراستە و هەڵوێستی فەیلەسوفانی ئەم سێ ئاینە جیاواز بوو بەرامبەر فەلسەفە، چەندان جار کەنیسە هاتە ناو بابەت و کایەکەوە هەوڵی دا بڵاوکردنەوە و دەساو دەستپێکردنی پەرتوکەفەلسەفیەکان ساغ بکات ، بەپێچەوانەی کەنیسەوە فەیلەسوفە ئیسلامیەکان ئاراستەگەلێکی تریان گرت ( هەبوو) ، بۆیە هەوڵیاندا هانی خەڵك بدەن لەسەر فەلسەفە سالاری فەلسەفە و هەڵس و کەوتکردن بەپێی خواستەکانی بۆ گەیشتن بەئامانجێکی باڵا کەئەویش کۆکردنەوەی ئاوەزو (عەقڵ) و نەقڵ بوو پێکەوە.

لەم سێ ئاینەدا هەیە کەنکوڵی دەکات لەوەی کەئاین پێویستی بەفەلسەفە هەبێت تابەرگری لێبکات یان ڕاڤەی بکات. لەئاینی کریستیاندا زانایانی وەك ( برنارد و بطیس) و جگە لەمانیش هەوڵیانداوە بۆ ڕوونکردنەوە و خستنەڕووی جیاوازی لەنێوان ئاین و فەلسەفەدا لەسەر ئەو بنەمایە کەئاین داوای ڕزگاری دەکات ، ئەم بیرۆکەیەش ناچێتە چوارچێوەی بابەت و ئامانجەکانی فەلسەفەوە، لەبەرئەوەی ڕزگاری پەیوەستە بە ویژدان و دڵ و نیازی ناو دڵەوە لەبەرامبەردا فەلسەفە پەیوەستە بە عەقڵەوە کەئەویش لە هەموو ئاینەکاندا هەیە، هەروەك ناتوانرێت و ناگونجێت بوترێت کیمیای ئیسلامی یان مەسیحی یان

جوبی بەهەمان شێوە ناگونجێت بوترێت ئەمە فەلسەفەیەکی ئیسلامی یە یان کریستیانی یە یان یەهودی یە.

سەرەڕای ئەوە لەناو زانایانی کریستیان ( المسیحی) دا وەك فەیلەسوفە موسڵمانەکان هەیە داوای سود وەرگرتن دەکات لەعەقڵ و فەلسەفە بۆ لێکدانەوەی ئاین.

بۆنمونە، قەشە ( أنسلم) (١٠٣٣ – ١١٠٩ ن) دەڵێت : پێویستە نهێنی یەکانی هەر بیرو باوەڕێك بەعەقڵ درکی پێ بکرێت و وەستان لەسەر سنوری باوەڕ و تێنەپەڕاندن بۆ قۆناغی وێڵ و ئاوەز (العقل) کەمتەرخەمی و پشتگوێ خستن هەڵەیەکە لێخۆش بوونی نیە.

دیسان قەشە (توماس الاکوینی) : هەمان قسەکەی ئەرەستۆ دەڵێتەوە کەدەڵێت : باوەڕ یەکەمجار لە عەقڵ و ئاوەزەوە دەست پێدەکات دووەمجار بەهێنانەوەی بەڵگەی حاشا هەڵنەگرەکان . لەفەیلەسوفە ئیسلامیەکان دەبینین ابن رشد ( ١١٢٦ – ١١٩٨ ن داوای گرنگی دان دەکات بە فەلسەفە و لای وایە دەبێت واز لەبیرۆکەی دژایەتی کردنی ئاین بۆ عەقڵ بهێنرێت . دەڵێت: ئەوەی لەشەریعەتی ئیسلامدا بەدی دەکرێت جیاکردنەوەی شتە عەقڵی و نەقڵی یەکان نیە بەڵکو پێویستە کۆبکرێنەوە بگونجێندرێن و یەکبخرێن لەگەڵ یەکتر دا.

لەسەر ئەم بنەمایە وتویەتی: خوای گەورە چەندان هێزی تێدا دروست کردوین ( پێبەخشیوین) دەتوانین بەهۆی ئەوانەوە شتانێك بەدەست بێنین (دەست بخەین) کە ئەوانیش بریتین لە دژەکان (ناتەباکان) ، بەڵام ئەم بەدەست هێنانە سەرکەوتوو تەواو نابێت جگەلە ڕێگەی بەکارهێنانی هۆکارەکانەوە نەبێت ، کەواتە مرۆڤ ئازادە لە ویست و بیرکردنەوە و هەڵسوکەوتەکانیدا ، پاشان بەردەوامە لە قسەکانیدا و دەڵێت:دەگونجێت ڕاستی لای موسڵمان و ناموسڵمان بدۆزینەوە لای ئاینە ئاسمانیەکان و ئاینەکانی تریش ، بەڵکو هەندێ جار هەڵگری ئاینەکان لەتوێژینەوە و گەڕان بەشوێن ڕاستی دا دووچاری هەڵە دەبن و لەهەمان کاتدا خاوەنانی پێرەوی عەقڵی گومان هەڵنەگر دەگەنە ڕاستی یەکان و دەیدۆزنەوە. شایانی وتنە ( ناوبردنە) کە ابن رشد بەم قسەیەی مەبەستی ئەوەنیە کەهەڵە لەخودی دیندا هەیە ، بەڵکو لەهەڵگری دینەکەدا هەیە . بێگومان (ابن رشد) خەڵکی هانداوە کەسود لە عەقڵ وەرگرن شانبەشانی نەقڵ، لەبەرئەوەی ئەم دوانە هاو ڕیشەن وهەریەکە یان ئەوی تریان تەواو دەکات هەروەها گروپی موعتەزیلە ڕۆڵێکی کاریگەریان هەبوو لە

بانگەوازکردن لە بۆ هەڵسوکەوت کردن بەپێی خواستی عەقڵ و ئاوەزی ساغ ، چونکە تەنها ئەم ڕێگەیە بڕیارەکانی خوامان بۆ دەدۆزێتەوە لەکاتی نەبوونی دەق دا لەسەر بناغەی جوانی و ناشرینی عەقڵ کەبنیات نران( بەندن) لەسەر قازانج و زیانی واقعی[1]

## جێباسی دووەم:
## جۆرەکانی فەلسەفە

فەیلەسوفەکان فەلسەفەیان دابەش کردووە بەچەند بەش و جۆرێکەوە لەدیدگای جیا جیا و بۆچونی جۆر بەجۆرەوە، لەڕووی سرشتەوە فەلسەفەیان کردۆتە دوو بەشەوە ١- فەلسەفەی تیۆری ٢- فەلسەفەی کرداریی ( پراکتیکی) . لەڕووی بابەتەوە فەلسەفەیان کردۆتە سێ جۆرەوە جۆری یەکەمیان : بریتی یە لە زانستی خوایی کەناویان لێناوە ( زانستی باڵا) جۆری دووەمیان: زانستی بیرکاری یە و ناوی ( زانستی ناوەڕاستیان) لێناوە ، جۆری سێ یەمیان زانستی سروشتی یە ناویان لێناوە زانستی (پایین).

هەروەك فەلسەفەی پراکتیکیان هەمدیس لەڕووی بابەتەوە کردۆتە سێ بەشەوە کە یەکەمیان: هەڵسوڕاندنی مرۆڤ لەلایەن خۆیەوە کەناوبراوە بەزانستی (ئاکار). دووەمیان: هەڵسوڕاندنی کاروباری خێزان کە ناوبراوە بە ( زانستی هەڵسوڕاندنی کارو باری ماڵ) . سێ یەمیان: هەڵسوڕاندنی کاروباری شار و نەتەوە کەلەم چەرخ و سەردەمەدا هاو واتای دەوڵەتە.

بەڵام لای هەندێ لە فەیلەسوفەکانی ڕۆمانی کۆن فەلسەفە هەموو زانستەکان دەگرێتەوە.

فەیلەسوفی فەڕەنسی (دیکارت) [1] (١٥٩٦ – ١٦٥٠ ن دەڵێت: فەلسەفە لەدارێك دەچێت کەڕیشەکانی زانستی ئەو دیو سروشتە [2] و قەدەکەی زانستی سروشت و

---

[1]) تەماشای پەرتوکی : الموسوعة الفلسفية المختصرة بکە ل ١١ – پاش ئەو

ئەندامەکانی زانستەکانی تـرن وەك پزیشـکی، زانسـتی میکانیـك و زانسـتی ئاکـار و وێنـەی ئەمانە.

لەدیدگاو بۆچونی خاکیانەی منەوە دێتە ئەوەی کە هەندێ لە فەیلەسوفەکان بوی چون کەگوایـە فەلسـەفە هـەموو زانسـتەکان دەگرێتـەوە ، ئـەوە تێکـەڵ کردنـە لـەنێوان خـودی فەلسـەفەو ئـەو زانسـتانەدا، لەبەرئـەوەی فەلسـەفەی زانسـتەکان هـەمان ئامـانجی ئـەو زانستانەن ، کەوابوو هەموو زانستەکان هاوبەشن لەڕەگـەزی ئامـانج دا بـەڵام هـەر زانسـتێك یەك جۆرەو دەچێتە ژێر ئەو ڕەگەزەوە ئامانجێکی تایبـەتی و چیەتێکی (ماهیـة) تایبـەتی هەیە.

پاش ئەم پێشـەکی یـە واباشـە لێکۆڵینـەوە لـەدوو بەشـەکەی فەلسـەفە بکرێـت بـەدوو بابەتەوە، بابەتی یەکەم تایبەت بکرێت بەلێکۆڵینەوەی جۆرەکانی فەلسەفەی تیـۆری یـەوە بابەتی دووەم تەرخان بکرێت بۆ توێژینەوەی جۆرەکانی فەلسەفەی پراکتیکی.

---

[1] ) دیکـارت لـە لاهـی لـەدلیك بـووە کەشـارێکی بچـوکە لـە هـەرێمی التـورین ، چـۆتەکۆلێجی ( لافلیشـی کریستیانەوە) بەڵام پرۆگرامی خوێندنی ئەوێی لا پەسەند نەبوو. بۆ زانیاری زیاتر تەماشای پەرتووکی ( الموسعة الفلسفية المختصرة ) بکة ل ١٣٨

٢ ) ئەو دیو سروشت پێی دەگوترێت ( میاتفیزیك) کەلقێکـە لـە فەلسـەفە لـە ڕاسـتەقینەی یەکـەمی بـوون دەکۆڵێتەوە ئەرەستۆ ناوی ناوە فەلسەفەی یەکەم ، یاسـادانەرو تێگەیشـتوانی یاسـا کەوتونەتـە هەڵـە لەپێناسـەکردنی هەڵشـوکەوتی یاساییداکەلایاندابووە،ئاراسـتەی ویسـتە بـەرەو بنیاتنانی(بـەدیهێنانی) کەیاسـا لەبەرچـاوی دەگرێت،هـەروەها هەڵەیـە هەڵسـوکەوتی یاسـایی لەگرێبەسـتو ویسـتی تاکـدا کۆبکرێتەوە ئەوکارە خۆویستانەی لێ دەربکرێت کەیاسا لەبەرچاویان دەگرێت سەنگی یاساییان هەیـە. تەماشای ( الموسعة العربية الميسرة ) بکە ل ١٧٩٤

## باسی یەکەم:
## جۆرەکانی فەلسەفەی تیۆری

مەبەست لەفەلسەفەی تیۆری ئەنجامی ئەو تیۆر و هزر و ڕاو شیکردنەوە و هۆ دەرخستن و دەرئەنجامانەیە کەدەربارەی بونەوەرو پێکهێنەر و دروست کەرەکەی وتراون و تۆمار کراون. هەروەك وتمان ( باسمان کرد) فەیلەسوفەکان جۆرەکانی فەلسەفەی تیۆری یان کردۆتە سێ بەشەوە کەبریتین لەم جۆرانە:

جۆری یەکەم: زانستی خودایی:ئەو زانستەیە کەبابەتەکەی لێکۆڵینەوەیەو توێژینەوەیە لەزاتی خودا و سیفەتەکانی و هەر لقێکی تری ئەم بابەتە وەك: باوەڕ بەشتەنادیارەکان لە زیندوو بونەوەی پاش مردن و لێپرسینەوەی مرۆڤ لەسەر کردەوەکانی کەئەگەر چاك بن ئەوا پاداشت بەچاکە دەدرێتەوە و ئەگەریش خراپ بن.ئەوا بەدۆزەخ پاداشت دەدرێنەوە وەك خوای گەورە دەفەرموێت (( فمن يعمل مثقال ذرّت خيراً يرَهُ، و من يعمل مثقال ذرةٍ شراً يَرهُ)) [1] . ئەم زانستە پێی دەگوترێت (زانستی باڵا) لەبەرئەوەی لەبارەی خودایەتی یەوە دەکۆڵێتەوە. ئەو فەیلەسوفانەی باوەڕیان بەبوونی خوا هەیە دەڵێن ئەو شتانەی کەدەگونجێت وێنا بکرێت لەلایەن مرۆڤەوە یان شتەبووەکانن ( الموجودات) یان نەبووەکانن ( المعدومات).

(الموجودات) شتەبووەکان: دوو جۆرن یەکەم: بوونی پێویستە لەخودی خۆیدا: ئەویش بریتی یە لەو شتەی کەخودی شتەکە بونەکەی دەخوازێت بەجۆرێك ئەگەر واگریمانە بکرێت کەنیە ئەوا بێگومان مەحاڵ بوونی لۆژیکی ( الاستحالة المنطقية) دروست دەبێت کەئەویش بوونی خوای گەورەیە.

بوونی پێویستە لەبەر جگە لەخۆی: هەموو نەبویەکی هەرام(ممكن) پاش ئەوەی دێتە بازنەی بوونەوە بەهۆی هێزێکی توانای خولقێنەرەوە ، بونەکەی حەتمی دەبێت ، مادامێك

---

١ ) الزلزلة :٨

الفلسفة الأخلاقية – د.ناجي التكريتي ل ٤

هەبێت لەبەر ئەوەی ئەگەر گریمانەی نەبوونی بڕیار درا لەکاتی بونیدا ئەوا کۆبوونەوەی دوو دژ ڕوو دەدات ( بون و نەبون)

نەبوو( المعدوم) ئەویش دوو جۆرە:

یەکەم:نەبووی هەرام (المعدم الممکن): بریتی یە لەو شتەی کەخودی شتەکە لە خۆیدا بون یا نەبون ناخوازێت وەك ئەو ڕوداوەتازانەی کەلەئایندەدا ڕوو دەدەن و لەئێستادا بونیان نی یە ، بەڵام دەگونجێت لەئایندەدا ببێت و ببێتە بازنەی بونەوە. هەموو دەستکەوتە زانستیەکان و دەزگا تەکنۆلۆجیەتازەکان بەهەموو جۆر و تاك و گروپەکانیەوە.پێش دروست کردنیان لەنەبوونەوە هەرامەکانن(المحدم الممکن) لەبەر ئەوەی ئەگەر لە هەرامەکان نەبن ئەوا نەدەهاتنە چوارچێوەی بونەوە.

دووەم: نەبونی قەدەغەکار (المعدم الممتنع): ئەو شتەیە کە خودەکەی نەبون دەخوازێ وەك: کۆبونەوەی دو دژ و نەبوونی هەردوکیان ، وەك بونی شتێك و نەبونی لەیەك کاتدا بەواقیعی (کردەیی) بێگومان ئەو فەیلەسوفانەی باوەڕیان بەخودا هەیە ، لەسەر بوونی ئەو چەندان بەڵگەی ڕاست و بەهێزی عەقڵی و فەلسەفیان هێناوەتەوە کە ئەفلاتوون یەکێکە لەوان دەڵێت : ئەم جیهانە کۆمەڵێك یاسا و ڕێسای وردی تێدایە لەئەندازەیی بوونی ڕێك و پێکدا ، دیارە دەبێت ڕێکخەری گەورە هەبێت ئەم گەردونە سەرسوڕهێنەرەی ڕێکخستبێت ئەم ڕێکخەرەش جگە لەخودا کەسی تر نیە. هەمدیس وتویانە :- هەموو پەیدابوو دروست بویەك بەر هۆکاری(معلوم) هۆیەکی دروست بووە، وە هەموو هۆکاری پەیدا بووش بەرهۆکارە بۆ هۆکارێکی ڕابردوو پێشتر تازنجیرەی هۆکار و بەرهۆکارەکان کۆتای دێت(دەبڕێتەوە) بۆ هۆکارێکی هەبوو کەبەرهۆکاری هۆیەکی ڕابردوو پێش خۆی نی یە ، جا ئەم هۆکارە کۆتای یە بریتی یە لەزاتی خودا ( جل جلالە) . چونکە ئەگەر وانەبوایە و زنجیرەی هۆکار و بەرهۆکارەکان بەردەوام بوایە بێ کۆتایی و بڕانەوە ئەوا لەئەنجامدا مەحاڵبوونی لۆژیکی(الاستحالة المنطقية)سەری هەڵدەدا،دیارە کەزنجیرەکە بڕاوەیە و نەبڕانەوەکەی بێ بنەمایە،کەواتە هۆکاری بێ بەر هۆکارمان هەیەکەئەویش خودایە [1].

---

[1]) ينظر المطاع الفلسفي عند العرب د. عبدالاير الأعسم من ٢٠٦ پاش ئەویش. الفارابي الأستاذ جورزف الهاشم ص ٧٤

←

جۆری دووەم: زانستی بیرکاری کەپێشی دەگوترێت (زانستی ناوەڕاست) (العلم الأوسط):-سەرچاوەی دروست بوونی بیرۆکە بیرکاری یەکان گروپێکن ناسراون بە(فیثا گوریەکان) وەك دانەپاڵێك بۆلای(فیسا گورس) کەفەیلەسوفێکی یۆنانی یە لەساڵی (٥٣٠ پ.ن) دەرکەوت ، یان (فیثا غورسی یەکان) کەدەدرێتە پاڵ (فیثا غورس)ی فەیلەسوف کەسەرکردەی فێرگە و رێچکە و هزرە فەلسەیەکانە ، ئەم کۆمەڵە لەدیدگایەکی بیرکاری یانەوە وێنای جیهانیان کردووە و دانیان نەناوە بەچوار توخمەکەدا ( ئاو ، ئاگر ، خۆڵ ، هەوا) کەزانایانی تر لایان وابووە گەردوون لەوانە پێك هاتووە. وبەرپەرچی ئەو بیرو باوەڕەیان داوەتەوە کەدەڵێن ئەو چوار توخمە بناغەو بنەمای دروست بوونی بوونەوەرن ، بەڵکو وتویانە : بێگومان بنەمای ژمارەکان ، بناغەی هەموو دروست کراوەکانن ، لەبەرئەوەی جیهان بریتی یە لە ژمارە و ریتم، ئەمان ژمارە بە کۆکراوەی بیرکاریانە نازانن (وێنا ناکەن)، بەڵکو دەڵێن: ژمارە ئەندازە و شێوەیە ، بۆنمونە: یەك خاڵێکە ، دوو: هێڵێکە ، سێ : سێگۆشەیەکە ، چولر چوارگۆشەیەکە بەم شێوەیە.... هێڵیش لە ( خەت) لەچەند خاڵێك دروست دەبێت ڕووبەریش (السطح) پێك هاتووە لەچەند هێڵێك ، قوڵایش پێك هاتووە لەچەند ڕوویەك (السطوح).

جۆری سێ یەم: زانستی سروشتی : پێی دەگوترێت ( زانستی خوارین ) بابەتەکەشی بوونەوەرە سروشتی یەکان و لێکۆڵینەوەیە لە وارسەکانی (الأعراض) دۆخە خۆییەکان. (الأحوال الذاتية)

فەیلەسوفەکان وتویانە: بوونەوەرەکانی گەردوون : جەوهەرو وارسی : جەوهەر : ئەو بونەیە کەلەبابەتدا نەبێت و بەخودی خۆیەوە بێت وەك شتە بەرجەستەکان ( المادية).

وارس (العرض) ئەو شتەیە کەلەبابەتدایە خۆی بەخۆیەوە ڕانەوەستاوە وەك : ڕەنگەکان ، بۆنەکان ......

هەندێك لە فەیلەسوفەکان وتویانە : هەموو بونەوەرێك ( دروست کراوێك ) لە هەیولی ( ماددە بنەڕەت و شێوە و فۆڕم پێك دێت (هیولى) هەویوو بەرجەستەی بنەڕەتی شتەکەیە ، شێوەش (الصورة) ئەو قاڵب و چوارچێوەیە دەگرێت بەبەری کەرەستە بنەڕەتی یەکەدایە

---

الفلسفة الأخلاقية د.ناجي تكريتي ص ٤٠

ئەم دوانەش وەك دوو هۆكاری ( وێنە بایس و كەرەستە بایس)[1] وان. هەندێ تریان دەڵێن : هەموو تەنێك لەچەند بەشێك پێك دێت كەپەرت ناكرێن ( لاتتجزأ) ئەمەش رای فەیلەسوفە موسڵمانەكانە بێگومان زانستی سەردەم (نوێ) ڕاستی ئەم بۆچوونەی سەلماندووە لەڕێگەی زانستی ئەتۆمەوە.

## باسی دووەم:
## جۆرەكانی فەلسەفەی پراكتیكی

جۆرەكانی فەلسەفەی پراكتیكی (كرداری) ئەمیش وەك فەلسەفەی تیۆری دەكرێت بە سێ جۆرەوە كە ئەمانەی لای خوارەوەن:

جۆری یەكەم : هەڵسوڕاندن و بەڕێوەبردنی كاروباری مرۆڤ لەلایەن خۆیەوە كەپێی دەگوترێت ( ئاكار ) چەند ناونانێكی باشە چونكە مرۆڤ بەمانا تەواوەكەی نابێتە مرۆڤ و ناتوانێت و ناگونجێت ببێتە ئەندامێكی سود بەخش لەكۆمەڵگەیەكدا تا هەموو چەشن و ئاكارە جوانەكان لەخۆیدا كۆنەكاتەوە ، ئەو ڕەوشت و خوانەی كە بەپێوەرێكی بابەتی پەسەندن لای ڕای گشتی ، وازنەهێنێت لەهەموو سیفەت و خووە ناشرین و ناپەسەندەكان كەلای كەلای عەقڵی ساغ و درێوو وەرنەگیراون.

جۆری دووەم: هەڵسوڕاندنی كاروباری خێزان لەلایەن پیاوەوە ئەمەش پێی دەگوترێت ( مشور خواردن و جێبەجێ كردنی كاری ماڵ ). جێ بەجێ كردنی كاروباری ماڵ و ئامانجەكانی پەیوەندی هاوسەرێتی و پەروەردەی باوكایەتی و پاراستنی ڕێكخستنی هونەری كەلو پەلی ماڵ و خاوێنی و چاودێری تەندروستی لەخواردن و خواردنەوە و جل وبەرگ و شتانی تر لەپێویستی و داخوازی یەكەی خێزانیەكان دەگرێتەوە لەماڵێكدا. فەلسەفەی كاروباری خێزان خۆی لەپەیوەندی یە هاوسەری یەكاندا دەنوێنێت كەبریتی یە لە ئارامی و سۆز و خۆشەویستی و ڕێزی ژن و مێرد بۆ یەكتری و خۆشەویستی ئاڵوگۆڕكراو

---

١ ) وێنە بایس : الحلة الصورية كەرەستە بایس: (الحلة المادية)

لەنێوان ئەم دوانەدا هەر لەدەقی ئەم ئایەتەدا دەردەکەوێت ﴿ وَمِن ءايتِهِ أن خَلَقَ لَكُمْ مِّن أنفُسِكُمْ أزواجاً لِتسكُنُواْ إليها وَجَعَلَ بَينكُم مّودةً ورَحمةً إنَّ في ذالكَ لآيتٍ لقوم يتَفكرون ﴾ (1)

بەپێی ئەوەی وتمان هەرهەڵبژاردنێ کەهاویەشی لەنێوان ژن و پیاودا بۆ یەکتری ئەگەر بەرێگەیەکی هەرەمەکی یان ئارەزوکاریانە یان سۆز دارانە یان بەپەلەکردن و بێ سەرنج و وردکردنەوە و لێکۆڵینەوە و بیرلێکردنەوەی ساغ ناتوانێت ئەو فەلسەفەیە بەدی بێنێت کە ئەم ئایەتە پیرۆزە باسی کردووە، لەبەر ئەوەی پێك هێنانی پرۆسەی هاوسەرگیریی لەسەر چەند بنەمایەکی لاواز و بۆش ناتوانێت فەلسەفەی ئەم پرۆسەیە بەرجەستە بکات (نیشان بدات) بەڵکو ترس و دڵەڕاوکێ دروست دەکات لەجێی ئارامی و دڵنیای و بێ ترسی هەروەك ڕق لێبوون و کینە جێگەی خۆشەویستی و دڵ جێی سۆز و جیایی جێگەی لێك نزیك بوونەوە دەگرێتەوە . فەلسەفەی هەڵسوڕاندنی کاروباری ناوماڵی پەروەردەیی تەنها ئەنجامێکی مەبەست داری ڕاستەقینە بۆ پێکهێنان و پەروەردەکردنی منداڵانێك کەتایبەتمەندی وایان تیادا هەبێت بۆ گەیاندنی پەیامەکەیان لەدوارۆژدا پاش ئەوەی دەچنە جەنگی ژیانەوە کاتێك توشی تێکگیران دەبن لەگەڵ تاکەکانی کۆمەڵگەدا. کەوابوو هەموو زیادەڕەوی یان کەمتەرخەمیەك لەنازپێدان یان بێ سۆزی گەشەیەکی خراپ لەمنداڵدا دروست دەکات کەهەرەسی کۆمەڵایەتی بەشوێنەوەیە و سەرکەوتو نابن لەبوارەکانی ژیاندا. فەلسەفەی هەڵسوڕاندنی کاروباری ناوماڵ لەلایەنەکانی ترەوە تەنها ئامانجێکی تەندروستی مەبەستە لە پاك و خاوێنی لە خواردن و خواردنەوە و جلوبەرگ و شوێنی نیشتەجێ بوون و ڕێکخستنی هونەری کەلو پەلی ناوماڵ و ڕەچاوکردنی هەواگۆڕکێی تەندروستی ماڵ جگە لەمانە لەپێداویستی یەکانی ژیانی تاکی ناوماڵ بەپێچەوانەی ئەوەوە ئەنجامی هەڵسوڕاندنی کاروباری ناوماڵ ترازێدیا دەبێت لەبواری تەندروستی یەوە بوارەکانی تردا.

جۆری سێیەم: هەڵسوڕاندنی کاروباری شارونەتەوە : ئەم هەڵسوڕاندنەش پاش دروست بوونی (دەوڵەت) ناوی ( هەڵسوڕاندنی دەوڵەت )ی لێنرا کەئەمیش دابەش دەبێت بەدوو بەشەوە: یەکەم : ڕامیاری ناوخۆ : واتە هەڵسوڕاندنی کاروباری ناوخۆی وڵات و دووەم : ڕامیاری دەرەوە: واتە هەڵسوڕاندنی کاروباری دەرەوەی دەوڵەت.

---

(1) سورة الروم (٢١)

یەکەم: رامیاری ناوخۆی بەجێ ی دەوڵەت : فەلسەفەکەی دابینکردنی بەختەوەری یە بۆ گەلەکەی و کۆمەڵگەکەی لەرێگەی دابین کردنی پێداویستی یەکانی ژیانیەوە کەئەمەش بەدی نایەت مەگەر بەشوێن کەوتنی رامیاری یەکی داناییانەوە کەرەچاوکردنی ئەم پرەنسیپە گشتی یانەی خوارەوەی تێدا بکرێت:

١) دابەش کردنی بەرپرسیاریەتیەکان و فەرمان و پلەکان بەسەر کەسانی پرۆفیشناڵ و خاوەن کارامەی خودی و زانستیدا و کەسانێکدا هەست بەبەرپرسی دەکەن و لەسەر بنەمای باوەڕ و ئاکارەکانیان ئەنجامیات نەك لەسەر بنەمای گروپەگەری یان خزم خزمێنە و کەسێتی و پەیوەندی یە کەسی یەکان و وێنەی ئەمانە.

٢) پێشخستنی بەرژەوەندی یە زەروریەکان بەسەر بەرژەوەندی پیویستی (الحاجیة) وپاشەکاندا نەك بەپێچەوانەوە. پێوەری جیاکردنەوە لەنێوان ئەم بەرژەوەندی یانەدا ئەوەیە : ئەگەر بەرژەوەندی یە زۆر پێویستەکان ناتەواوی تێکەوت ئەوا ژیان بەتەواوی تێك دەچێت بەڵام جێ بەجێ نەکردنی هەندێك لەبەرژەوەندی یە پێویستیەکان ئەوا ناتەواویەکی کەم لەژیاندا دروست دەکات.

٣) دیاری کردنی ماف و ئەرکەکان لەیاساو دەستورەکاندا بۆ هەرتاکێك لەتاکەکانی گەل ، و چاودێری کردن و لێپرسینەوە لەگەڵ کردنیان لەسەر پابەند نەبوون بەئەرکەکانیانەوە.

٤) چاودێری توند لەسەر کالآو کەل و پەل و شتومەکە هاوردەکراوەکان ( هێنراوەکان) .

٥) لێپرسینەوەی زۆر توند لەگەڵ هەرکەسێك کەنەفسی هەڵی دەنێت لەسەر بەدەست هێنانی قازانج لەسەر ژیانی کەسانی تر.

٦) یەکسانی لەبەر دەم یاسادا بەبەدیهێنانی هاوسەنگی لەنێوان ماف و ئەرکەکاندا.

دووەم:رامیاری دەرەوە (هەڵسوڕاندنی کاروباری دەرەوە): فەلسەفەی رامیاری دەرەوە: ئامانجی دابین کردنی پەیوەندی دۆستانە لەنێوان دەوڵەتی نیشتمانی و دەوڵەتە بێگانەکاندا لەسەر ئەم بنەمایانەی خوارەوە:

أ) پاراستنی بەرژەوەندی یە بەرامبەرە هاوبەشەکان .

ب) کارکردن بەپێی خواستی پەیماننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە پەیوەندی یە نێودەوڵەتیەکاندا.

ج) ڕێزگرتن لە دابو نەریتە نێودەوڵەتیەکان.

د) پابەند بوون بەجێ بەجێ کردنی ئاگربەست و پەیمانە نێودەوڵەتییەکان.

هـ) ڕەچاوکردنی سەربەخۆی و شکۆی وڵاتانی تر لەلایەن هەردەوڵەتێک.

نەخستنە نێو کاروباری ناوخۆی دەوڵەتانی تر.

و) هاوکاری ئابوری و ڕۆشنبیری و ڕامیاری لەنێوان وڵاتاندا.

ۆ) سەردانە نێودەوڵەتیە دۆستانە ئاڵوگۆڕکراوەکان لەنێوان بەرپرساندا لەپێناو بەهێزکردنی پەیوەندی یەکاندا.

## جێباسی سێ یەم:
## ڕاجیایی لەدیارک کردنی چیەتی فەلسەفەدا

وشەی فەلسەفە وشەیەکی بێگانەیە هاتۆتە ناو زمانی عەرەبی یەوە لەبنەمادا یۆنانی یەو لەدوو وشەی ( فیلا – سۆفیا) یان (فیلو – سوفیا)وە داڕێژراوە، بەپێی گێڕانەوە جۆراوجۆرەکان [1].وشەی فیلا یان فیلو یان فلا واتە: خۆشەویستی ، وشەی سوفیا یان صوفیا مەبەست پێی ژیری و دانای یە ، کۆی هەردوو وشەکە مانای خۆشەویستی دانایی یە ، داناییش ، مانای زانینە ( المعرفة) بەڵام لەچەندان واتای تردا بەکارهێنراوە، لەوانە:– کارامەیی لەکارپێکردنی ئامێرەکاندا ، بەڕێوەبردنی کارەکان ، بەمانای پسپۆڕیش دێت بەهۆی ئەزمونی درێژو لێکۆڵینەوەی بابەتەجۆراوجۆرەکانەوە [2]. بێگومان ئەم وشەیە ( الحكمة) لەقورئاندا لەکۆمەڵە ئایەتێکی زۆردا بەدی دەکرێت کە هاو واتای هەندێ لەماناکانی فەلسەفەیە وەك لەم ئایەتەدا دەبینرێت:(..... ومَنْ يؤتَ الحكمَةَ فَقَدْ أُتِيَ خيراً كَثيراً .....) [3] واتە: هەرکەسێك ژیریی و دانایی پێدرا بەڕاستی چاکەی زۆری لەگەڵ کراوە.

واتە ئەو زانینەی کەدەبێتەهۆی ئەنجامدانی کردەوەو کرداری بەسود ، فەیلەسوف ئەوکەسەیە فەلسەفە بەکاردێنێت یان زانایە لەفەلسفەدا، دەوترێت کەزانا دێرینەکانی یۆنان کەسێك شارەزای زۆری لە فەلسەفەدا هەبوایە پێیان دەوت ( حكيم) دانا یەکەم کەسێ خۆی ناونا فەیلەسوف زانا فیسارگۆرس بووە ( ٥٠٣ پ.ز) واتە : دانایی خۆش دەوێت بەڵام خۆی بە حکیم ناو نەبردووە لەبەرئەوەی ئەم پەسنە(ئاوەڵناوە) لای ئەو و لەبیروباوەڕی ئەودا تەنها بەسەر خوادا دەردەبڕدرا [4].

---

[1]) موسوعة الفلسفة والفلاسفة للدكتور عبدالمنعم الخفي.ج١ص ٩٨٣ المعجم الفلسفي المصطلح الفلسفي عندالعرب الدكتور الأمير الأعسم ص ٦ و ٢

[2]) موسعة الفلسفة والفلاسفة / المرجع السابق ج٢ ص ٩٨٣

٣ ) سورة البقرة : ٢٦٩

٤ ) المعجم الفلسفي المرجع السابق/ ص ١٧٢

فەلسەفە لەبنەما یۆنانیە کۆنەکەیدا لای فەیلەسوفەکان : بریتی بوو لەلێکۆڵینەوە لەسروشتی بونەوەر و توخم و پێکهێنەرەکانی و هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی بناغەی گەردون و دروست بوونی ، لەدەرکەوتوترین و دیارترینی ئەو فەیلەسوفانە ، تالیس ە (١٦٢٣ — ٥٤٦ پ.ن) ، کەدانایەکی یۆنانی بووە زۆرگرنگی بە گەردونناسی داوە ، وەك پێشبینی باسی ئەو خۆرگیرانەی کردووە کەلەساڵی (٥٨٥ پ.ن) دا رویدا پاشان بەچەند واتایەکی تر بەکارهێنرا کەسروشت و شتانی تریش دەگرێتەوە. فەلسەفەش لەزاراوەی فەلسەفیدا پێناسەی زۆری هەیە لێرەدا هەندێکیان دەخەینە روو ( پێش چاوو):

أ— سوقرات پێناسەی کردووە [1] ( ٤٦٩ — ٣٩٩ پ.ن): بەوەی کەبریتی یە لە لێکۆڵینەوەی عەقڵیی دەربارەی راستیەتی شتەکان کەمرۆڤ دەگەیەنێتە چاکە. لەپێناسەیەکی تردا وتویەتی : فەلسەفە لەدروست کراوە(بووە) سروشتی یەکان دەکۆڵێتەوەو توێژینەوەیە لەجوانی سیستەمی و پرەنسیپ و هۆکاری یەکەمی.

ب— ئەفلاتون پێناسەی کردووە [2]: (٤٢٧— ٣٤٧ پ.ن):بەوەی فەلسەفە لێکۆڵینەوەیە دەربارەی راستی یەتی بووەکان (دروست کراوەکان) و یاسا جوانەکانی لەپێناو ناسینی داهێنەری یەکەمدا؟ ئەم زانستەش سەرکردەی هەموو زانستەکانە . ئەوەی تێبینی دەکرێت کە ئەم پێناسەی نزیکە لەپێناسەکەی (سوکرات)ی مامۆستای، بێگومان هەمان تێبینی و رەخنەروو دەکاتە ئەم پێناسەیەش هەروەك رووی کردە پێناسەی مامۆستاکەی ، لەبەرئەوەی ناسینی یەکەم داهێنەر

---

[1] فەیلەسوفێکی یۆنانیە لەشاری ئەسینا ژیاوەو بریاری لەسێدارەدرانی بەسەردا سەپێنراوەلەبەر باوەرنەبوونی بەخواکانی شار (ئەسینا) لەراکانی☹زانین شکۆداریەنەزانین بیّ شکۆیی)وتویەتی( یاسا ئەوەیە کەبۆبەهێز دەگونجێت) یان وتویەتی:( رێز لەیاسا بگرە با ئەو یاسایە ستەمکاریش بێت).دەگێرنەوە(دەگێردرێتەوە) کە هەندێك لە هاورێکانی لەبەندیخانەدا پەیوەندی پێوە دەکەن پێشنیاری پیّ دەکەن کەوا بەنهێنی دەریکەن تا لەسێدارە رزگاری بێت ئەویش پێشنیارەکەیان دەداتە دواوە،چونکە وەختی خۆی وتبوی رێز لەیاسا بگرە با ستەمکاریش بێت.

[2]) مێژوو نوسەکان دەڵێن: ئەفلاتون زمانپاراوترین و زاناترین کەسی سەردەمی خۆی بووە،ناوی راستەقینە(راستینە)ی ( ویستوقلس)ە و(ئەفلاتون)کەسناویەتی(کنیتە)ماناکەی بەکەسێك دەوترێت کە نێوچەوانی پان بێت.

موسوعة الفلسفةولاقلاسفة / سەرچاوەی پێشو / ل ١٥٧.

فەلسەفەیە نەك لێکۆڵینەوە دەربارەی داهێنەری یەکەم ، سەرەڕای ئەوەش ئەم پێناسەیە کۆکەرەوەیە و تەنها فەلسەفەی لاهوتی دەگرێتەوە.

ج- ئەرستۆش پێناسەی وەها کردووە [1]: ( ٣٨٤ – ٣٢٢ پ.ن) زانستێکی تیۆری یە بەپرەنسیپ و هۆکارە یەکەمینەکان خەوش و ناتەواوی ئەم پێناسەیەش ئەوەیە کە فەلسەفە خودی زانست نی یە ، بەڵکو ئامانجی یەتی.

ح- فەیلەسوفی ئیسلامی فارابی( ٨٣٧ – ٩٥٣ ن) [2] بەم شێوەیە پێناسەی کردووە : زانستە دەربارەی دروست کراوەکان بەوشێوەیەی کە هەیە ، ئەو زانستە گشتگیرەیە کەوێنەیەکی گشتگیرانە دەداتە مرۆڤ لەبارەی گەردونەوە . ئەم پێناسەیەش ئەم تێبینی یە رووبەرووی دەبێتەوە : کەتێیدا تێکەڵەیەك هەیە لەنێوان زانست دەربارەی دروست کراوەکان و ئامانجەکەیدا: کەبریتی یە لە ناسینی وێنەی گشتگیر دەربارەی گەردوون ، سەرەڕای ئەمەش ئەم پێناسەیە کۆکەرەوە نی یە ( غیر جامع) و هەموو جۆرەکانی فەلسەفە ناگرێتەخۆی تەنها فەلسەفەی سروشتناسی لەخۆیدا کۆدەکاتەوە.

خ- ئیبن سینا ( ٩٨٠-١٠٣٧ ن) [3]: دەڵێت فەلسەفە قسەکردن و وەستانە لەسەر ڕاستیەتی سەرجەم شتەکان بەو ئەندازەیەی کەلەتوانای مرۆڤدا هەبێت و

---

[1] لەهەندێك لە ڕاکانیدا هاتووە کە هەموو بونەوەران لەگەردوندا دەگەڕێنەوە بۆ (١٠) کاتیگۆری:- تەماشای دانراوەمان(فلسفةالمسؤليةالقانونية في ضوءالنحل والانفعال الأرسطين) بکە.

[2] ئەو ئەبومەنسورەی کوری ئەرلنی فارابیەلەطوندی (ویسج)لەمەتریمی فاراب لەدایك بووە لەباشوری تورکستان و باکوری فارس ولەبەغداد ماوەیەك خوێندویەتی و ماوەیەك لە کۆشکی سیف (الدولة)ی حەمدانیدا نیاوە،لەشاری حەلەب و لەسایەی ئەمدا ئایەکانی فەلسەفەی ئیسلامی ریشەیان داکوتا.قواعد فلسفیة/ ل ٥١

[3] ئیبن سینا: ئەو ابو علي حسەینی کوری عبداللەی کوری حەسەنی کوری علی کوری سینایەو بە(شیخ الرئیس) ناسراوە، نازناوی (الرئیس) ئامازەیە بەسەرگەرمبونیەوە بەڕامیاری و گرتنەدەستی پلەی وەزیری.نازناوی (شیخ) نیشانەی سەرقاڵبونی بووە بە زانست و فەلسەفەوە. کواتە نازناوی یەکەم رامیاریانەو دووەمیش زانستیانە.باوکی لەشاری بەڵخەوە هاتووە بەرەچەڵەك فارسەو پاشان بوخارلو لەهەموو فەیلەسوفەکان ڕەسانەیەتی زیاتر،ڕێچکەیەکی فەلسەفی لەیەکتا پەرستیدا بنیاتنا. الموسوعة الفلسفية المحتضرة ل ١٤

بگونجێت قسەی لەبارەوە بکات.ئەم پێناسەیە نزیکترین پێناسەیە لە واقعی فەلسەفەوە ، لەبەرئەوەی وەستان لەسەر راستی یەکان واتە فەلسەفەی لێکۆڵینەوەی وەدەستهێنانی هۆکارە گونجاوەکان بۆ گەیشتن بە ناسین و زانینە. پێناسەیەکی تریشی لێرە دەگێڕدرێتەوە ئەویش ئەوەیە : فەلسەفە هەوڵدانە بۆ پەروەردەکردنی دەرونی مرۆڤ لەرێگەی وێناکردنی شتەکانەوەو باوەڕکردنە بەراستی یە تیۆری و پراکتیکیەکان بەپێی توانای مرۆڤ. ئەم پێناسەیەش یەکێکە لەراسترین پێناسەکان کەفەیلەسوفەکان بۆ فەلسەفە بریاریان لەسەر داوە : لەبەرئەوەی پەروەردەکردنی دەرونی مرۆڤ سەرئەنجام و ئامانجی هەموو ئەرکێکی هزری مرۆڤە، ئەم دەرئەنجامە یان ئامانجە ناوی فەلسەفەی بەسەردا دەبڕدرێت.

د- هەروەها ابن رشید الوەلید [1] (١١٢٦ - ١١٩٦ م) پێناسەی دەکات بەوەی فەلسەفە سەرنج دان و تەماشاکردنی دروست کراوەکانە لەو ئاراستەوەی کەئەمانە بەڵگەو نیشانەن لەسەر دروست کارێك. لەسەر ئەم پێناسەیەش ئەم تێبینی یانەی خوارەوە مان هەیە:-

١- لۆجیك (المنطق)و فەلسەفەی تێکەڵ کردووە ، لەبەرئەوەی نواڕین و بیرکردنەوە لە زانراوە وێناکراوەکان و باوەڕپێکراوەکانە بۆ دەست خستنی نەزانراوە وێناکراو باوەڕپێکراوەکان دەچێتەناو چوارچێوەی ژێربێژی یەوە (المنطق) نەك فەلسەفە.

٢- تێکەڵ کردنە لەنێوان هۆکار و ئامانجدا ، کەوابوو تێڕامان لە دروست کراوەکان و بیرکردنەوە لێیان هۆکارو رێگەیە کەئەوەش بەفەلسەفە نادرێتە قەڵەم ، لەبەرئەوەی فەلسەفەی ئەم تێڕامان و بیرلێ کردنەوە بریتی یە لە ناسینی دروست کار (خوا) کەئەمەش مەبەستی بیرلێکردنەوەیە.

٣- پێناسەیەکی گشتگیر نی یە بەڵکو تەنها فەلسەفەی لاهوت دەگرێتەوە.

---

[1]) ناوی محمدی کوری ئەحمەدی کوری روشدە لەبەناوبانگترین فەیلەسوفە ئیسلامیەعەقڵ گەراکانە و فەیلەسوف و شەرع زان و دلوەرو پزیشکە.لەگوندێك لەوڵاتی ئیسپانیا و لە مەراکیش کۆچی دوایی کردووە، وتراوە لەوڵاتی مەغریب کۆچی دوایی کردووە بەراشیاری ئەرەستۆ ناسراوە.الموسوعةالفلسفية المحتضرة/ ل ١١

بەم ئەندازەیە لەخستنەڕو و نیشاندانی پێناسەی فەیلەسوفەکان بۆفەلسەفە کۆتا دەهێنم، بۆڕاستی و بۆ مێژوو دەڵێم جگەلە پێناسەکەی ابن سینا هەموو پێناسەکانی تری فەلسەفە ناتەواو پڕکەمو کوڕین لەم ڕووانەی خوارەوەدا:-

أ- لەپێناسەکاندا هۆکارو ئامانج تێکەڵ کراوە ، لەبەرئەوەی دووەم مانای فەلسەفەیە نەك یەکەم بەپێچەوانەی ئەو بۆچوونانەی کەوتویانە هۆکار فەلسەفەیە.

ب- تێکەڵ کردنیان تێدا دەبینرێت لەنێوان بابەتی فەلسەفەو بابەتی لۆجیکدا، بابەتی فەلسەفە بریتی یە لە ئامانج و مەبەست و دەرئەنجامی شتەکان، لەبەرامبەریشدا بابەتی لۆجیك (المنطق) بریتی یە لە زانراوە وێناکراوەکان و زانراوە بڕواپێکراوە کەڵەکەبووەکان لەمێشکی مرۆڤ دا بۆ بەدەست هێنانی نەزانراوە وێناکراوو نەزانراوە باوەڕپێکراوەکان ، لەبەر ئەمە پێشنیار دەکەم کەپێناسەکەی ئیبن سینا هەڵبژێردرێت وەك بناغەیەك بۆ پێناسەکردنی فەلسەفە .

شایانی باسە من لە دانراو پەرتوکە نوێکاندا پێناسەیەکی ڕاست و کۆکەرەوە دەرکەرم بەرچاو نەکەوت کەبۆ فەلسەفە کرابێ:( واتە هەموو بەشەکانی فەلسەفە بگرێتەوە و زانستەکانی تری لێ دەربکات).

دەرئەنجام گیری ئێمە دەربارەی واتای فەلسەفە: بێگومان هۆکاری نەبوونی ئەم جۆرە پێناسە لەپەرتوکە نوێکاندا ئەوەیە کەزانایانی یاسا زانستی لۆژیکیان نەزانیوە ، ئەو زانستەی کەبناغەو پایەو مەرجی بۆ پێناسەکان داناوە . ئەوەی ڕاستی بێ فەلسەفەی هەموو شتێك واتە ئامانجی ( مەبەستی) ئەو شتە. کەلەیاسا شارستانی یەکاندا، بەهۆکار و پاڵنەر ناودەبرێت بۆ ئەنجامدانی گرێ بەستەکان ، کەلەیاسای تاوانە گەورەکاندا بەنیاز و ویستی تاوان (القصد الجنائي)ناوبراوە، لەبەرئەوەی فەلسەفەی تاوان بریتی یە لەبەدیهێنانی ئەنجامی تاوان بۆ کارە تاوانکاری یەکە بەو بەڵگەیەی کەشێت و منداڵی هەراش و هەرکەسێك وەك ئەمان وابێت لێپرسینەوەیان لەگەڵ دا ناکرێت ، پرسیاریان لێناکرێت لەڕووی پاداشتەوە و سزانادرێن لەبەرئەوەی کارە تاوانکاریەکەیان هیچ فەلسەفەیەکی تێدانیە. دووبارە فەلسەفەش لەباو ی گشتی دا بەهیوا ناو زەد دەکرێت یان هیواکان بەو

بنەماو پێ یەی کەمرۆڤ لەسەر هیواو ئاوات دەژی کە ئەوانیش ئەو ئەنجام و ئامانجانەن کەمرۆڤ دەیەوێت لەداهاتووی ژیانی دا بەدی بێنێت لەپشت کرداروتەکانیەوە. بۆ هەرکارێکی خۆ ویستانە کەلەمرۆڤەوە دەربچێت و (لەوتە) یان (کردە) ئامانجێکی ئایندەی هەیە، ئەویش لەڕووی وێناکردنەوە پێشخراوە (مقدم) و پێی دەگوترێت ئامانج یان هۆکار و پاڵنەر و وەلەڕووی بەدیهاتنەوە پاش تەواو کردنی کارەکە چەند ناوێکی جۆراوجۆری بەسەردا دەبڕدرێت لەوانە ئامانج ، سەرئەنجام ، بەرژەوەندی وێنەی ئەمانە. ئەم ئامانج و ئەنجام و بەرژەوەندی یە فەلسەفەی ئەو کارەیە کەئەنجام دەری کارەکە پێی هەڵدەستێت ، فەلسەفەی بڕیارەکانی خوا کەوەك ئەرك لەمرۆڤ داواکراوە بریتی یە لەئەنجام و مەبەستی ئەو کارانەی مرۆڤ پێی هەڵدەستێت بۆ ژیانی دونیای یان ژیانی ڕۆژی دوای یان بۆ هەردوو لایان. بۆ نمونە فەلسەفەی نوێژ ئەو وزە ڕۆحیەیە کەلە ئەنجامی نوێژەکەوە بەدەست دێت وەك هۆکارێکی پاراستن و پارێزگاری ڕێگەگری لەئەنجامدانی تاوان و کاری ناشرین وەك خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وأقم الصلاة إنّ الصلاة تنهى عن الفحشاء والمنكر ...) [1] واتە:(نوێژ بەرپا بکە بە مەرج و پایەو ناوەڕۆکەوە ، بەڕاستی نوێژ مرۆڤ دەگێڕێتەوە لەشتی دزێوو ناشرین). هەروەها داخوازی خوای گەورە بۆ ئەنجامدانی ڕۆژوو﴿ يا أيها الذين آمنوا كتب عليكم الصيام كما كتب على الذين من قلبكم لعلكم تتقون﴾[2] لەخواترسان و پارێزگاری لەم ئایەتەدا (فەلسەفەی ڕۆژوەکەیە) ئەویش وزەیەکی گیانی یە مرۆڤ لەخراپە دەپارێزێت ، وەك هێڵی بەرگری وایە لەلەشدا جەستە دەپارێزێت لەنەخۆشی و ناساغی یەکان.هەروەها فەلسەفەی زەکات پاککردنەوەی مرۆڤە لەخەوش و ناتەواوی و مل هوڕی.

هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی ﴿كلاّ إنّ الانسان ليطغى ان رآه استغنى﴾ [3] نەخێر بەڕاستی و بێگومان مرۆڤ سەرکەشی دەکات و ملهوڕی دەنوێنێ کاتێ کەبینی پێویستی بەهەندێ کەس نی یە بەتایبەتی لەماڵ و ساماندا خوای گەورە فەرمویەتی ﴿ خذ من أموالهم

---

١) سورة العنكبوت / ٤٥

٢ ) سورة البقرة / ١٣٨

٣ ) العلق / ٦

صدقة تُطهِرهُم وتزكيهم بها.. ﴾ [1] سەرەڕای (سەرباری ) فەلسەفەی جێبەجێ کردنی پێداویستی هەژارو نەبو و بێ نەوایان. هەروەها فەلسەفەی حەجیش یانی هاوکاری لەنێوان میللەتان و نەتەوە ئیسلامیەکاندا لەنەهێشتنی کێشەگران و گەورەکانیاندا لە کۆنفرانسێکی ساڵانەدا لەنزیك کەعبەی پیرۆزدا دەگیرێت کەهێمای یەکیەتیانە (یەك بونیانە) ، حەج پسولەو کارتی لێخۆش بوون و چونەبەهەشت نیە هەروەك زۆرێك لە موسڵمانان وادەزانن . فەلسەفەی بەردەباران کردنی و شەیتانی دەرونی فەرمانکەر بەخراپە ، پەیمان دانە لەبەردەم خوای پەروەردگاردا کەلەمەولا دەبێتە ئەندامێکی باش و چاك لەکۆمەڵگەکەیدا. فەلسەفەی یاساش بەویستی خوا لەجێگەی خۆیدا باسی لێوەدەکرێت.

١) التوبة / ١٠٣

# جێباسی چوارەم:
# گرنگی فەلسەفە
# لەسەر دووئاستی تیۆری و پراکتیکی

فەیلەسـوفان و دانایـان و ژیـر و زانایـان لـەکۆن و نوێـدا وتویانـە ، فەلسـەفە ( واتـە: ڕەگەزەکەی ) بەگشتگیری و گشتی بون جیادەبێتەوە (واتە لەزانستەکانی تر). ئەم قسـەیە نزیکە (خەریکە) بچێتە بازنەی بەڵگەنەویستەکانەوە، چونکە (مادام) فەلسەفەی هەموشتێك مەبەست و ئامانجەکەیەتی ، مەبەستیش ڕەگەزێکی گشتی یە (جنس العام) هـەموو جـۆر و پـۆل و تـاکی ئامانجـەکان دەگرێتـەوە کـە دەچـنە ژێـر ئـەو ڕەگـەزە گشـتی یـە. گرنگـی فەلسەفەی هەموو شتێك لەناسین و زانینی چی یەتیەکەیدا دەردەکـەوێت، کـەوابوو ئەگـەر چی یەتی (الماهية)جۆری فەلسـەفەزانرا یـان خـودی زانسـتەکە ئـەوا بێگومـان زۆربـەڕوونی گرنگییەکەی لەم بوارەدا ئاشکرا دەبێت. بەهۆی ئەوەوە کـە فەلسـەفە لـەڕووی ڕەگـەزەوە گشتگیرە ئەمە دەبێتە ڕێگر کەبتوانێت تاکە تاکەی گرنگی فەلسەفەی هەموو شتێك بـزانین و دیارە لەتوانا و دەسەڵاتی مرۆڤدا نیە ، بەڵکو ئەم کارە عادەتـەن موستـەحیلە.لەبەرئەوە چەند نمونەیەك ڕوون دەکەینـەوە تابیێتـە پێـوەر بـۆ پێوانـەکردنی فەلسـەفە لـەبوارەکانی تردا:-

- یەکەم: فەلسەفەی یاسا: بریتی یە لە دیاری کردن و پاراستنی بەرژەوەندی یەگشتی و تاییـەتی یـەکانی ئـەو کۆمەڵگەیـەی پابەندیانـە ، چونکەیاسـا دادەنرێـت ، دەگۆڕدرێت ، هەڵدەوەشێنرێتەوە، جێ بەجێ دەکرێت و ڕادەپەڕێنـدرێت لەسـەر بنـەمای ئـەو بەرژەوەندیانـەی مەبەسـتی یاسـان ، هـەروەك لەجێگـەی خۆیـدا بەویستی خوا باسی لێوەدەکەین.
- دووەم: فەلسەفەی بڕیارە شەرعیە تەکلیفیەکان بریتی یـە لەخۆپاراسـتن و تـەگبیرو بەرنامـە پێشـگیری یـەکان دژ بـە هـەموو کـارێکی تاوانکـاری و هـەموو زیانێـك کەڕوویەڕووی مرۆڤ دەبێتەوە.

- سێیەم: فەلسەفەی زانستی ئاکار (الأخلاق): زانستی ئاکار بریتی یە لە کۆمەڵێك پرەنسیپی پێوانەیی ( المبادئ المعیاریة)کەپێویستە شێوازی هەڵسوکەوتی مرۆڤ بەپێی ئەو پرەنسیپانە بێ و لەژێر رووناکی ئەواندا هەنگاو هەڵگرێت ، فەلسەفەی زانستی ئاکار پاراستنی مرۆڤە لەلادان بۆ لای رەفتاری تاوانکارانەو لادان. لەرێگەی راست و ژیانی تەندروست ، هەروەها خۆرازاندنەوە بە ئاکارە جوانەکان و وازهێنان لە خورەوشتە دزێوەکان.
- چوارەم: فەلسەفەی زانستە خوایی یەکان ئەویش بیروباوەرە راست و دروستەکانە کەلە پەیامە ئاسمانیەکانەوە بەدەست هێنراون، هەروەها لەوبەڵگەو بیرکردنەوانەوە کەدەربارەی سروشت و خراونەتەروو تابکرێنە نیشانە لەسەر بوونی دروست کارەکەی. شتێکی ئاشکرایە کەکەسێك بیروباوەری نەبێت هیچ پابەندی یەکی نی یە لەبەر ئەوە لەکۆن و نوێدا وتراوە هەرکەس بیروباورەرێکی خراپی هەیە باشترە لەوکەسەی کەبیروباوەری نی یە لەبناغەدا کەسێك پابەند نەبێت شایستەی ئەوەی نی یە ببێتە ئەندامی کۆمەڵگەکەی و شایستەی هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی تێیدا .
- پێنجەم: فەلسەفەی زانین: توانای جیاکردنەوەی خێرو شەرە (خراپە و چاکە) بەسود و زیانبەخش و قازانج و زیان جێگیربوون و راڕایی ، لەپێناو هەڵبژاردنی باشترینیان و ئیش کردن بەو پێیە.
- شەشەم: فەلسەفەی مێژوو: جیاکردنەوەی خاڵە ئەرێنی و نەرێنی یەکانی نەتەوە رابردوو پێشووەکانە تاسودلە ئەرێنی یەکانیان وەرگرین و لەهەڵەو خراپەکانیان پەند و ئامۆژگاری هەڵگوزین. شتێکی روونە کە سودوەرگرتن ئەرێنی یەکانی هەرنەوەیەك لەنەوەکانی پێشو ، مەبەستی بەرەوەپێشچوون ، لەگرنگترین هۆکارەکانی پێشکەوتنی هەرگەلێکی پێشکەوتووە لەم سەردەمەدا.
- حەوتەم: فەلسەفەی زانستی ژیربێژی( لوجیك): پاراستنی هۆش و عەقڵە لەهەڵە بیرکردنەوە لەکاتی بەدەست هێنانی نەزانراوەکان ( المجهولات) لەزانراوە کەڵەکەبووەکانی لای خۆی. لەبەرئەوەی لۆجیك (النطق)یاسایەکە رەچاوکردنی بنکەکانی (القواعد) بیرو عەقڵی مرۆڤ دەپارێزێت لەهەڵە لەبیرکردنەوەدا لەکاتی

بـەكارهێنانی زانـراوە و كۆگـاكراوە تیـۆری و پراكتیكـی یەكانـدا. كـەوابوو گەشەسەندنی شارستانیانەی ولآتـە پـێش كـەوتووەكان بەشـێوەیەكی گشـتی و بەتایبـەتی لـەدنیا (جیهـانی) تـەكنۆلۆجیا دا بەوئەندازەیـەی كـە عـەقڵی مـرۆڤ لـەڕابردوودا وێنـای نـەكردووە، ئـەنجامی سـودوەرگرتن و وەبـەرهێنانی زانیـاری نەوەكانی پێش ئێمە بووە، هەموو نەوەیەكی نوێ سودی لەبەجێماوی (المـوروث) كەلەپوری پێش خۆی وەرگرتوەو زانیـاری نـوێ ی خسـتۆتە سـەر كەلەمـەو بـەر نەزانراو بوون لەژێر سایەی یاسای لۆجیك و فەلسەفەكەیدا.

- هەشتەم: فەلسەفەی بنەماكانی فقە ( أصول الفقە): بریتی یە لـە پاراسـتنی عـەقڵی موجتەهیـدەكان لەهەڵـەكردنی كـاتی هـەڵگۆزین و دەرهێنـانی بڕیارەكـان لەسەرچاوەكانیانەوە، لەبەرئـەوەی ئـەم زانسـتە یاسـای هەڵگۆزینـە (دەرهێنـان) عەقڵی موجتەهید دەپارێزێـت لەهەڵـەكانی تێكۆشـانەكەیدا و ڕەنـج دانـی ئـەو بـۆ گەیشتن بەبڕیاری ڕاست و دروست لەوبابەتەیدا كەدەیەوێت حوكمەكـەی بزانێـت ، ئەم زانستە لەڕووی فەلسەفەكەیەوە ئەگەر تەماشابكرێت دەبینین هـەموو كـەس پێویستی پێیەتی لەكاتی مامەڵەكردن لەگەڵ دەقەكاندا.
- نۆیەم: فەلسەفەی زمانەبیانیەكان سەرەڕای زمانە ناوخۆی یەكان: بریتی یە لەسود وەرگرتن لە بەرهـەم و بـەروبوومی نەتـەوەكانی تـر لەهـەموو سـەردەمێكدا و لـەو قۆناغەشارسـتانیەی كـەپێی گەشـتون دوور بـەبێ كاریگـەر بـون بـەداب و نەریتانەیانەوەكە، پێچەوانەن لەگەڵ داب و نـەریتی ئێمـەدا. ئـەوەی شـایانی باسـە كەزانسـتی لۆجیـك و بنـەماكانی فقـە و فەلسـەفە و زمـان لەزانسـتە ئامێریـەكانن (العلـوم الآلیـة) كـەخۆیان لـەخودی خۆیانـدا مەبەسـت نـین بـەڵكو هۆكـارن بۆتێگەیشـتنی قورئـان و فـەرموودەو خزمـەتی زانسـتەكانی تردەكـەن هـەروەك مافەكانی هاوتەنیشتی (الإرتفاق) لەجیهانی شارستانیدا كەبۆخزمەتی خانوبەرەیـە ، ئـەم زانسـتە ئامێریانـە لـەو شـتە هـەرە پێویسـتانە دەدرێنـە قەڵـەم ( هەژماردەكرێن) بۆ كەسانێك كەدەیانەوێت مامەڵە لەگەڵ دەقەكاندا بكەن. هەروەك چۆن دارتاش ناتوانێت داروتەختە بكاتە ئەو كەلو پەلـەی كەمەبەسـتی یـەتی یـان ئاسنگەر ئاسنی بۆ ناكرێتە ئەو ئامێرانەی دەیەوێت، بێ بـەكارهێنانی ئامێرەكـانی

دارتاشی و ئاسنگەری هـەروەها کەسـانێك کـە مامەڵـە لەگـەڵ دەقەکانـدا دەکـەن نـاتوانن ئامانجـەکانیان بەدەسـت بێـنن لـەپێناو خزمـەت بەکۆمـەڵگاداو نـاتوانن شیکردنەوە ئەنجام بدەن و هۆکارەکان بخەنە ڕوو دەرئەنجامەکان ئاشـکرا بکـەن بێ ئەم زانستە ئامێریانە (العلوم الآلية).

- دەیەم: فەلسەفەی یەکێتیبوونی نیشتمانی لەهەموو وڵاتێکدا لەڕووی بیرۆکەو ئامانج و سیاسەت و کارگێڕی و ئابووری و وێنەی ئەمانە کەوڵات بەرەو پێشەوە دەبەن و گەشەی پێدەستێنن بریتی یە لە پاراستنی بەرژەوەندی یەکانی ئەم وڵاتەو دووبەرەکی نەخستنە نێوان ڕیزەکانیانەوە کە هێماو سمبولی هێزیانە و (شەقڵی) شارستانیانە، هەوڵدانی شانبەشان ڕۆشتنیانە لەگەڵ کاروانی شارستانی نەتەوە پێش کەوتووە شارستانیەکاندا. کەوا ململانێ حزبی (گروپیەکان) و سیاسی و ئاینی و ئاینزای یەکان سەرجەم ڕواڵەت و نیشانەی تێنەگەیشتن لەواقعی ژیان و وەبەرهێنانی خێرو بێت کە ئەمان نیشانەی دواکەوتن و دوور بونە لەچێژوەرگرتن لە فەلسەفەی ژیان بەشێوەیەکی گشتی و نیشتمان بەشێوەیەکی تایبەتی.

# بەندی دووەم

## یاسا

ئەم بەندە لێکۆڵینەوەی سێ خاڵی سەرەکی لەخۆدەگرێت لە سێ جێباسدا:

جێباسی یەکەم تایبەتە بە ڕێسای یاساییەوە

جێباسی دووەم باسی پێویستی بوونی یاسا دەکات و

جێباسی سێ یەم ڕاستەقینەی یاسای سروشت ڕوون دەکاتەوە

# جێباسی یەکەم:
# پێناسەی (ناساندنی) ڕێسای یاسایی

پێناسەی هەموو زاراوەیەکی گشتی واتە : ڕوونکردنەوەی چی یەتی یان جیاکردنەوەیەتی لەزاراوەکانی تر بەنیشانەو تایبەت مەندی یەك یان زیاتر لەتایبەت مەندی یەکانی.

لەهەڵبژاردنی هەرپێناسەیەك بۆ یاسا پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکرێ :

١- ڕێسایەکی گشتی ناسراومان هەیە کەدەڵێت: حوکمەکان دەگۆڕێن بەپێی گۆڕانی کات. گۆڕانی حوکمەکانیش دەبێتەهۆی گۆڕانی ئەو ڕێسا یاسایی یەکەی کەلێی هەڵدەگوزرێ و گۆڕانی ڕێسا یاسایی یە وەستاوەکە لەپێشدا گۆڕانی بەرژەوەندی یەکان دەخوازێت کەڕێسا یاسای یەکە بۆ پاراستن و حوکملێدانی دانراوە.

٢- هەریەك لەیاسا و کۆمەڵگا کاریگەریان لەسەر یەکتر هەیەو یاسا لەگەڵ بەرەو پێشچونی کۆمەڵگادا گەشە دەکات ، ئەگەر نا ئەوا کۆمەڵگە لەدژی شۆڕش بەرپا دەکات تا یاسایەکی تازەو گونجاو بخاتەشوێنە.

٣- لەکاتی دانانی یاسا یان گۆڕانکاری تێیدا یان هەڵوەشاندنەوەی دا پێویستە واقعی ئەو کۆمەڵگایەی یاساکەی تێیدا جێبەجێ دەکرێت لەبەرچاو بگیرێت لە ڕوی (بواری) ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و ئابوری و بیروباوەڕی و ڕۆشنبیری و وێنەی ئەمانە سەرەڕای ڕەچاوکردنی هەرێمیە جوگرافی و ئیستراتیجیەکی.

٤- یاسای هەموو کۆمەڵگەیەك ناگونجێت بۆ کۆمەڵگەیەکی تر هەتاکو یەك نەکەون و نزیك نەبن لەیەکتر لەو بناغانەدا کەبەندی (٣)دا هاتوون و ڕەچاوکردنی(لەبەرچاوگرتنی) ئەم خاڵە پێویستە کاتێك بمانەوێت لەڕێگەی بەراوردکردنی یاسایی یەوە یاسای نیشتمانی پێش بخەین.

٥- هەروەك یاسای كۆمەڵگەیەك ناشێت بۆ كۆمەڵگەیەكی تر هەروەها بەهەمان شێوە پێناسەی یاسا لەسەردەمێك لەسەردەمەكانی ڕابردوودا لەچەند هەلومەرج و كەشێكی تایبەتیدا ناگونجێت بۆ سەردەمێكی تر لەچەند هەلومەرجێكی تردا كەجیاوازە لەهەلومەرجەكانی پێناسەكردنی ڕابردوو.

بەپێی ئەم خاڵانە و جگەلەمانەش بێ هودەیە و بەفیڕۆدانی تەمەن و كاتە و سەرگەرمكردنی لێكۆڵەری زانستی و یاسایی یە دووبارە كردنەوەی وێنەی پێناسەكانی كەسانی تر و مشتومڕ لەسەر كردنیان و بەڕاست زانینی هەندێكیان لەچاو هەندێكی تریان بەمەبەستی هەڵبژاردنی ئەو پێناسە یان كەلە هەموویان باشتر و بەكارهاتو ترە بەڵكو پێویستە پێناسەیەكی نوێی تر بهێنرێت كەشەقڵ و نیشانەی مۆركی گەشەسەندن و پێشكەوتنی پێوەبێت ، زیانی نیە سود لەوپێناسە ڕابردووانە وەربگرێت كەپەیوەندی بەم پێناسە تازەوە هەیە. لێرەوە ( لەم دیدگاوە) پێشنیار دەكەین كەپێناسەی یاسا بكرێت بەوەی كەبریتی یە لەكۆمەڵێك ڕێسای نەبەستراو (مجرد)ی گشتی كۆمەڵایەتی جیر( گونجاو)ی پابەندكارە ئامانجی ڕێكخستنی ماف و ئەركەكانی پابەندكارو ملكەچی یەكانیەتی.

**ڕونكردنەوەی پێك هێنەر و توخمەكانی ئەم پێناسەیە [1]**

١- كۆمەڵێك ڕێسا : ڕێسا لەزماندا شتێكە جگە لەخۆی لەسەر بنیات دەنرێت ، بەم واتایە هاتووە لەم ئایەتە پیرۆزەدا ﴿ وإذيرفَع ابراهم القواعدَ مِنَ البيت و اسماعيل رّبنا تَقَبّلْ منّا إنّكَ أنتَ السميعُ العليمُ ﴾[2]

لەزاراوەدا: بریتی یە لەهەموو مەسەلەیەكی هەمەكی (قضية كلية) كەهەڵگرەكەی هەموو ئەوانەی لەژێری ئەو ناونیشانەدا جێگەیان دەبێتەوە بە ئەرێنی یان نەرێنی دەگرێتەوە ، دانەپاڵی ئەرێنی هەروەك لەڕێسای ((تاوان قەدەغەیە و سزای لەسەر دەدرێتەوە )) تاوان

---

١) هەرشتێك ( وشەیەك) بەكاردەهێنرێت لەپێناسەی هەرشتێكدا بەتوخم ( عنصر) پێكهێنەر دەژمێردرێت ، لەبەرئەوەی توخم و پێكهێنەری هەرشتێك ئەوەیە كەبوونی شتەكەو وەسفی شتەكەی لەسەر بەندە ، ئەگەر توخمەكە بەشێك بوو لەشتەكە ئەوا پێی دەگوترێت ركن (پایە) وەئەگەر بەشێك نەبوو ئەوا بە مەرج ( الشرط) ناودەبرێت

٢ ) سورة لبقرة / ١٢٧

بابەتی( الموضوع) ئەم ڕێسایەیە ، (سزای لەسەر دەدرێتەو)ە هەلگیراوەیەکە دراوە بەسەر هەموو شتێکدا کەدەچێتە ژێر چەمکی تاوان ئیدی لەجۆرەکان بێت یان پۆلەکان یا تاکەکان. دانەپاڵی نەرێنیش وەك لەڕێسای (بێ تاوان پرسیاری لێناکرێت لەڕووی پاراستنەوە) وشەی بێتاوان بابەتە ( الموضوع) (پرسیاری بۆ پاراستن لێناکرێت) هەلگیراوە (محمول) دەچەسپێت بەسەر هەموو تاکێك دا کەبچێتە ژێرچەمکی بێتاوانەوە.

شتێکی بەلگەنەویستە کەهەرگیز ناگونجێت پەیوەندی یەکانی تاکەکانی کۆمەلگە ڕێکبخرێت لەبوارێك لەبوارەکانی ژیاندا بەبێ یاسایەك یان چەند یاسایەکی دیاری کراوەوە ، چەندی یەتی ڕێساکانی ئەو یاسایەی کەچارەسەری بابەتێك دەکات لەژیانی کۆمەلگەدا وەك یاسای کارگێڕی و یاسای کار و یاسای چاودێری کەمئەندامان و وێنەی ئەمانەدیاری دەکرێت لەژێر ڕووناکی (تیشکی) قەبارەی ئەم بابەتەدا، لەبەرئەمە وشەی (مجموعة) بەکارهێنرا بۆ وشەی (القواعد القانونیە) (ڕێسا یاسای یەکان) کەئەمەش ڕگەزە (الجنس) زۆر و کەم دەگرێتەوە.

٢– ناپەیوەست (مجرد): واتە لەکاتی دروست کردن و دارشتن دا تەماشای کەسێکی دیاری کراو ناکرێت لەخویدا( بالذات) کەمل کەچیەتی و جێبەجێی دەکات، بەلکو تەماشای کەسەکە دەکرێت لەڕووی فرۆشندەیی یان کڕیاری یا تاوانکاری یان ئایا بازرگانە یان فەرمانبەر و وێنەی ئەمانە و ڕیسایاسایی یەکەی بەسەردا جێ بەجێ دەکرێت (دەچەسپێت) لەڕووی ئەو وەسفەوە(الوصف) نەك لەڕوی کەسەکەوە کەیاساکە جێ بەجێ دەکات ، هەروەها تەماشای کردارێکی دیاری کراو ناکرێت بەلکو سەیری سروشتی هەلسوکەوتەکە دەکرێت لەو ڕووەوە کەفرۆشتنە یان بەشودان و ژنهێنانە یان کوشتنە یان وێنەی ئەمانە ، تەماشای پایەکانی ئەم کارەو مەرجەکانی دەکرێت یان ڕێگرو لەمپەرەکانی ، هەروەك تەماشای واقعێك ناکرێت لەڕوە تایبەتیەکانەوەبەلکو سروشتی ویەسن و مەرجەکانی تەماشا دەکرێت بەنمونە[1] .

[1] ) جیاوازی لەنێوان هەلسوکەوتی یاسایی و ڕوداو و واقعی یاسایی دا ئەوەیە : هەر کردەوەو جموجۆلێك ، هەرکردارو وتارێك مرۆڤێکی بالغی عاقلی هۆشیار پێی هەلدەستێت بەجۆرێك لەڕووی یاسایی یەوە
←

٣- عامة(گشتی) واتە جێبەجێ دەکرێت بەسەر هەموو کەسێك دا لەرووی پەسن و سیفەتەوە یان ئەوکارەی دەیکات وەك ئەوەی فرۆشیارە یان دزەو وێنەی ئەوانە یان لەرووی پلەوپایەیەوە وەك سەرۆك کۆمار بونی یان سەرۆك وەزیران بوونی یان وێنەی ئەوە. هەروەها دەچەسپێت بەسەر هەموو کارو هەڵسوکەوتێکدا لەروی پەسن و پایەو مەرجەکانیەوە ، وەك چەسپاندنی رێسای ( هەموو هەڵسوکەوتێکی یاسای کەلەماڵ و زەوی و زاردا بکرێت بەتاڵە ئەگەر تۆمارنەکرێت لەبەرێوەبەرێتی تۆماری خانوبەرەو زەوی دا) بەپێی (م٣) ماددەی سێ ی لەیاسای تۆماری خانوبەرەو زەوی و زارو ماددەی (٥٠٨) لەیاسای شاستانی عێراقی. فەلسەفەی رەها بوون و روت بوونی رێسای یاسایی و گشتگیربوونی بریتی یە لە یەکسانی لەنێوان ئەکەسانەداکەرێسای یاسایی دەیان بات بەرێوە،ئێمە ناپەیوەستمان ( المجرد) پێش زاراوەی (العموم) گشتی لەپێناسەکەدا خست بەپێچەوانەی ئەوەی کەبڵاو دەستاو دەست پێکراوە لەپێناسەکانی رێسای یاسایی دا لەپێش خستنی وشەی گشتی (عامة ) بەسەر ناپەیوەستدا ئەوەش لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە:-

أ- پەسنی(ئاوەڵناوی) رەهابون و داماڵران لەرووی زنجیرەی سروشتی یەوە پێش ئاوەڵناوی گشتی بوون (العموم) دێت کەوابو یەکەم شوێن پێی هەڵگیراو دووەم شوێن کەوتووە ، شوێنی شوێن کەوتو پاش شوێن پێهەڵگیراو دێت.

---

کاریگەری و بەرهەمی هەیە. ئەگەر پێکهێنەرێك لەتوخم و پێکهێنەرەکانی پێناسەکەی ( تێدا نەبوو) ئەوا رووداوەکە بە واقیعەوە دەدرێتەقەڵەم نەك هەڵسوکەوت کەوابوو واقیعە:

١- هەشتێك جگە لەمرۆڤ بوەشێتەوە لە ئاژەڵ یان سروشت .

٢- هەر گوتار و کردارێك لەمنداڵی دەوەشێتەوە.

٣- هەرشتێك لەشێت و کەسێك وەك شێت وایە بوەشێتەوە.

٤- هەرشتێك لەناچار و بەگیرهاتوو زۆرلێکراو بوەشێتەوە.

٥- هەرشتێك خەوتو و بورلوەو کەسێك بەلەبیرچوون و هەڵە ئەنجامی بدات.

٦- هەرشتێك یاسا هیچ بریارێکی دەربارەی نیە وەك خەوتن لە کاژێرێکی دیاریکراودا یان خواردن لەکاتێکی دیاری کراو دا یان سەردان و وێنەی ئەمانە.

ب- پەسنی داماڵران و ڕوت بونەوە لەبەرچاودەگیرێت لەکاتی دارشتنی ڕێساکەدا ، لەلایەکی ترەوە

پەسنی گشتی بوون (العموم) لەبەچاو دەگیرێت لەکاتی چەسپاندنی دا. شتێکی ئاشکراشە کەچەسپاندن و جێبەجێ کردن پاش دارشتن دەبێت.

ج- پەسنی داماڵران و ڕووت بوونەوە تیۆریە ، لەبەرئەوەی لەکاتی سەرهەڵدانیدا تەماشای دەکرێت ، لەهەمان کاتدا پەسنی گشتی بوون پرۆسەیەکە لەکاتی چەسپاندن و جێبەجێکردندا تەماشای دەکرێت، کەواتە لایەنی تیۆری دەخرێتە پێشەوە بەپێی واقع و سروشت بەسەر لایەنی پراکتیکی دا.

٤- ملزمة (پابەندکەرە): هێزی پابەندکەری ڕێسای یاسایی وەرنەگیراوە لەوڕووەوە کەیاسا پاداشتی لەگەڵ دایە وەك زۆرێك لەزانایانی یاسا دەڵێن بەتایبەتی ئەوانەی دەستەواژەی ( مقترنه بالجزاء) بەیەکێك لەتوخمەکانی ڕێسای یاسایی دەزانن ، لەبەرئەوەی بناغەی دەستەڵاتێکی باڵاوە کەخەڵك ناچار بکات بەشوێن کەوتنی ، بەڵکو بەوەرگرتن و مل کەچی خەڵکە بۆیاسا لەبەرئەوەی پابەندی یەکی ئاینی و ئاکاری یان هەیە ملکەچی یاسان بن نەك لەسەر بناغەی ترس لە لێپرسینەوە و پاداشت بەڵکو لەسەر بناغەی ڕێزگرتن لەیاسا و ڕەچاوکردنی مافەکان و دەستەبەری و هاوکاری کردن.

٥- (کۆمەڵایەتی)یە: بێگومان ڕێسا یاساییەکان تەنها گرنگی بەتاکی گۆشەگیر نادەن کەهیچ پەیوەندی یەکی کۆمەڵایەتی نەبێت بیبەستێتەوە بەکەسانی ترەوە ، کەسێکی وەها وەك (سقراط) دەڵێت: (یان خوایە یان ئاژەڵ). شتێکی ئاشکرایە کە ئەرك و فەرمانی فەلسەفی ڕێسایاسایی یەکان دیاری کردن و یەکخستنی ماف و پابەند بوونی تاکەکانی کۆمەڵگەیە، کاتێك لێکگیران لەنێوانیاندا ڕوودەدات یەکخستنی بەرژەوەندی یەکانە لە دژە وەستانیان لەبەرامبەر یەکتر، و لابردن و دانەدواوەی ستەمە کاتێك یەکێکیان ویستی ستەم لەبەرامبەرەکەی بکات ، لەم پەسنەوە ئەوە بەدەست دەهێنرێت کەدروست بوون و گەشەکردنی یاسا پەستراوە بەبونی کۆمەڵگاوە ، لەبەرئەمە دەگونجێت بڵێین یاسا پێش بوونی دەوڵەت هەبووە ، چونکە یاسا بەپێی داخوازی پێویستی یەکان و پابەندبونەکانی ژیان سەرهەڵدەدات و هەیەو لەگەڵ بوونی کۆمەڵێك خێزان و هۆزی و کۆمەڵگە کە پێش بوونی دەوڵەت هەبوون لەسەر پەیوەندی خوێن یان بەرژەوەندی نێوان تاکەکان.

٦- (مرنة) نەرمە: پەسنی نەرمی زۆر پێویستە بۆ ڕێسای یاسایی تا ئامادەبێت بۆ پێشکەوتن ، کاتێك کۆمەڵگە پێش دەکەوێت ، بەڵام بەگوێرەی ڕێسای دەستوری باشتروایە نەرمی تێدا نەبێت (نەکشێت). لەبەرئەوەی ڕێکارەکانی دانانی ڕێسای دەستوری عادەتەن قورستر و گرانترە لەڕێکارەکانی دانانی ڕێسای یاسایی ، چونکە ڕاستکردنەوە یان گۆڕینی ڕێسای دەستوری هەندێکجار دەبێتە هۆی ئالۆزی لەژیانی کۆمەڵگەدا هەروەك دەبێتەهۆی ڕوودان و دروست بوونی پشێوی لەماف و پابەندبوونەکاندا. نەرمی بەگوێرەی ڕێسای شەرعیەکان لەقورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر (د.خ) دا بەدی ناکرێت تەنها بەگوێرەی مانا گەیەنراوەکانیان نەبێت کەمانای گەیاندنێکی گومانین وەك وشەی (قوة) لەم فەرموودەیەی خوای گەورەدا ﴿ وأعِدُ والهم مّا اُسْتطعتُم مِنْ قوة ومِنْ رِباطِ الخيلِ تُرهِيبونَ بِهِ عَدُالله وعَدُوَّكُم ..﴾[1] ئەو واتا گەیەنراوانەی کە حەتمین و لەهەندێك ئایەتەکانەوە وەردەگیرێت جێگەی کشان و نەرمییان تێدا نابێتەوە، کەواتە ئایەت و فەرموودە(دەقەکە) ماناکە یان نەرمی هەڵناگرێت و کشان تێدانیە وەك لەم فەرموودەیەی خودای گەورەدا بەدی دەکرێت ﴿ ولَكُمْ نِصفُ مَاتَرَكَ أزواجُكُمْ إنْ لّمْ يَكُن لَهُنَّ ولَدُ ..﴾[2] وشەی (ولد) لەزمانی عەرەب دا (نێرە و مێ یە) دەگرێتەوە ، بەڵام لەعورفی عەرەب دا تەنها بۆ نێرینە بەکاردەهێنرێت و لەم ئایەتەدا مەبەستمان پێی مانا زمانی یەکەیەتی (اللغوي).

٧- ئامانجی ڕێکخستنی ماف و پابەندییەکانی ملکەچەکانیەتی (جێ بەجێ کەرەکانی یەتی). شتێکی ئاشکرایە کەفەلسەفەی دانانی یاسا و گۆڕین و هەڵوەشاندنەوەی بریتی یە لە بەرژەوەدی یە کانی کۆمەڵگە و پاراستنی و دیاری کردنی ماف و ئەرکەکان و چاودێریکردنیان ، بەڵام فەلسەفەی جێبەجێکردن و چەسپاندنی یاسا بریتی یە لە بەدیهێنانی دادگەری و یەکسانی هەروەك لەبابەتی فەلسەفەی یاسادا باسی لێوە دەکرێت.

---

[1] سورة الأنفال /٦٠ وشەی ارهاب لەم ئایەتەدا بەمانا باوەکەی ئەمرۆ نیە بەڵکو مەبەست پێی ترساندنە لەبەر ئەوەی دوژمن کاتێك زانی بەرامبەرکەی هەمان چەك و پێداویستی سەربازی پێیە ناوێرێ و زات ناکات دەستدرێژی بکاتە سەری و هەڵگرتنی بەرپرسیاریە سزلییەکان و ئەو زیانانەیە کەلە کارێکی ناڕەواوە دروست دەبن و پێویستە بژمێردرێنە وینەی ئەمانە.

[2] سورة النساء / ١٢

## پەیوەندی نێوان ڕێسای یاسای و ڕێسای شەرعی

ڕێسا شەرعی یەکان دووبەشن : شەرعی یە دەقی یەکان ، ڕێسا شەرعی یە ئیجتیهادیەکان ( هەلگوزراوەکان)

یەکەم: ڕێسا شەرعی یە دەقیەکان بریتین لە دەق قورئانی و دەقەکانی سونەتی دروست و جێگری پێغەمبەر کەئەمانە لەگەڵ ڕێساییە یەکاندا لەچەند ڕوویەکەوە لێك دەچن و لەچەند ڕوویەکی ترەوە جیاوازن.

١- ڕووەکانی لێکچوون :

یەکەم: هەریەکەیان ئامانجی بەدیهێنانی بەرژەوەندی یەکانی مرۆڤ و پاراستنیانە.

دووەم: هەریەکەیان ڕووت و ڕەها و گشتی یە.

سێ یەم: هەریەکەیان سەرپێچی لێکردنیان سزای بەدواوەیە.

چوارەم: لەجێبەجێ کردنەکاندا و وردەکاریەکاندا یەك دەگرنەوە [1]

پێنجەم: ڕێسا شەرعی یەکان سەرچاوەی ڕێسا یاسایی یەکانن لەهەندێ لەیاساکانی هەندێك لەوڵاتە ئیسلامیەکان.

شەشەم: دژایەتی و بەگژیەکداچوون بەدی ناکرێت (نیە) لەنێوان هەندێك ڕێسای یاسایی لەوڵاتە نائیسلامیەکاندا و لەنێوان ڕێسا شەرعی یەکاندا وەك لەڕێسای نەتاوان نەسزا هەیە مەگەر بەبونی دەقێك ، ڕێسای کەسی بوونی سزا ((لاتزرُ وأزرة وزر أخرى)) هەندێ ڕێسای تر.

٢- خاڵەجیاوازیەکان لەنێوان ڕێسای یاسایی و ڕێساشەرعی یەکاندا [2] ئەم دوو ڕێسایە جیاوازن لەهەندێك خاڵی جەوهەریدا ( بنەڕەتیدا) کەهەندێکیان ئەمانەی خوارەوەن:

١- ڕێسای شەرعی دەقی سەرچاوەو دروستکەرەکەی نیگای خواییە، بەڵام ڕێسای یاسایی سەرچاوە دروست کەرەکەی عەقڵی (ئاوەزی) مرۆڤە و ڕاکانیەتی. ئەمەش مانای وایە

---

[1] ) بۆ نمونە لەهەردوو ڕێساکەدا ( عقل) مەرجی دروستی و وەرگرتنی کارەکانە

[2] ) تەماشای ئەم پەرتوکەمان بکرێت ( مجموعة الالجاث العلمية ) البحث الرقم (٤) الصلة بين السريعة والفقة والقانون ص ٨٨ و پاش ئەو

کەڕێسای یاسایی هەڵەو لەبیرچوون و دەمارگیری هەڵدەگرێت بەپێچەوانەی ڕێسای شەرعیەوە.

٢- ڕێ سای شەرعی دەقی گۆڕانکاری و دەستکاری و هەڵوەشاندنەوە هەڵناگرێت بەپێچەوانەی ڕێسای یاساییەوە وەك باسمانکرد.

٣- گشتی بوونی ڕێسای شەرعی فراوانترە لەبەرئەوەی قسەلەگەڵ خێزانی مرۆڤایەتیدا دەکات وەك خوای گەورە فەرمویەتی :﴿ تبارك الذي نزّل الفرقان على عبده ليكونَ للعالمينَ نذيراً ﴾[1] . ڕێسای یاسایی کۆمەڵگەیەکی دیاری کراو دەدوێنێت لەهەرێمێکی سنورداری دیاریکراودا و لەدەرەوەی ئەوهەرێمە ناچەسپێ و جێبەجێ نابێت مەگەر لەچەند بارودۆخێکی وادا کەبەدەق جیاکرابێتەوە.

٤- پاداشتی ڕێسای یاسایی لەزۆربەی جاردا نەرێنی یە سەرپێچی کاری سزا دەدرێت ، خەڵاتی کەسێك ناکرێت کەمل کەچی بۆدەکات لەماوەی ژیاندا ، لەکاتێکدا پاداشتی ڕێسای شەرعی هەروەك سزادەبێت ، دیسان پاداشتیش دەبێت ، سزای سەرپێچی کار دەدرێت و پاداشتی مل کەچ کار پێش دەکرێت وەك قورئان دەفەرموێت ﴿فمن يعمل مثقال ذرةٍ خيراً يره ومن يعمل مثقال ذرةٍ شراً يَره ﴾[2].

٥- پاداشتی ڕێسای یاسایی دنیای یە ، ئەگەر تاوانەکە ئەنجامدراوە کەلەبەر دەم یاسادا نەسەلمێنرا بڕیاری بێ تاوانی گومانلێکراوەکە دەردەکرێت ، لەبەرئەوەی گومانلێکراو بێتاوانە هەتا تاوانباری دەسەلمێنرێت، بەڵام لەڕێسای شەرعیدا تاوانبار ئەگەر سزا نەدرێت لەدنیادا ئەوا سزای دادگەرانە دەدرێت لەبەردەم خوای پەروەردگار لەڕۆژی دواییدا.

٦- ڕێسای یاسایی تەنها لەسەر ڕواڵەت حوکم دەدات ناچێتەقوڵایی دڵەکانەوە پەیوەندی بەسەر هەناو و کارەناوەکی یەکانی مرۆڤەوە نیە با کارەخۆشەویستەکانی مرۆڤیش بن بەمەرجێك ئاشکرانەکرێن و لەدەرەوە بەرچاونەکەون ، لەکاتێکدا ڕێسای شەرعی هەروەك بڕیار دەدات بەسەر شتە (کردارە) دیارەکاندا بەهەمان شێوە بواری ناوکی و

---

١ ) سورة الفرقان / ١

٢ ) سورة الزلزلة / ٧ ، ٨

هەناوی مرۆڤ دەخاتەژێر لێپرسینەوەو دادگاییەوە لەو شتانەدا (کارانەدا) کەدەکەونە بازنەی ویستی مرۆڤەوە وەك شاردنەوەی گەواهی و رژدی و خۆبەزلزانین و خۆپەرستی ، وەك خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ وان تبدوا مافى أنفسكم أو تخفوه يحاسبكم بـه الله ﴾. [1] واتە ئەوەی والەدڵ و دەروونتاندا دەریخەن و یان بیشارنەوە خـوا لەسـەر لێتـان دەپرسێتەوە. هەرکەسێك دەڵێت ئەم ئایەتە بڕیارەکەی هەڵوەشاوەتەوە بە ئایەتی ﴿ لايكلف الله نفساً إلاّ وسعها﴾ ئەوا بەهەڵەدا چووە هەڵوەشاندنەوە و تایبەت کردنی ﴿التخصيص﴾ تێکەڵ کردووە ، بەڵکو ئەم ئایەتە تایبەت کارە ، ئەو کردارانەی مرۆڤ دەیکات ناوەکین و خۆویست نین ئەوا بەرپرسیارێتیان لێ دەردەچێت .

٧- لەجێبەجێ کردنی ڕێسای شەرعی دالەسەر خەڵکانێکی بالغ و ئاقڵدا خۆویستانە کارەکەیان ئەنجام داوە هیچ (حصانیەك)نی یە بۆیان، ئەگەر کارێکیان ئەنجام دا کەسزای لەسەر بێت بەوەك هەموو خەڵکەکەن بەپێچەوانەی چەسپاندن و جێبەجێ کردنی ڕێسای یاسایی یەوە ، کەجاری واهەیە سەرۆکی وڵات و دیپلۆماتکەرەکان و وێنەی ئەمان ناگرێتەوە بەمەرجێك لەپلەوپۆستەکەیان دورخراینەوە و. و ئەم حەسانەیان لەسەر هەڵنەگیرابێت.

دووەم : پەیوەندی لەنێوان ڕێسا یاسایی و ڕێسا فقهیە هەڵگۆڕراوەکاندا لایەنی (خاڵی) لێکچون لەنێوان ئەم دوو ڕێسایەدا زۆرترە تا لایەنی جیاوازی ، لەبەرئەوەی عەقڵ و ئاوەزی مرۆڤ ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە دارشتن و هەڵێنجانیاندا:-

أ- رووە جیاوازەکان:

١- ڕێسای فقهی قەوارەو بونێکی سەربەخۆی هەیە و سەرچاوەی تایبەتی شەرعی بەخۆی هەیە ، کەهەیانە بناغەیی و بەدیهێنەری حەکمەکانە وەك قورئان و سوننەتی پێغەمبەر ، هەشیانە حوکمەکان دەدۆزێتەوە و ئاشکرایان دەکان وەك سەرچاوەکانی تری: کۆدەنگ (الاجماع) و پێوانە(القياس) ، لەبەرامبەریشدا ڕێسای یاسایی نیشتمانی کەسەرچاوەکەی بۆچون و رای مرۆڤە بەراستەوخۆ یان لەیاسا بیانیەکانەوە هێنراوە و وەرگیرلوە کەئەویش هەر زادەو بەرهەمی عەقڵی مرۆڤە.

---

[1]) سورة البقرة / ٢٤٨

٢- ڕێسای فیقهی پێویستی بەبوونی مەرجەکانی هەلگۆزینی حوکم هەیە لەکەسێکدا هەڵدەستێت بەدانانی و دەرهێنانی حوکمەکان بەهۆیانەوە، بەپێچەوانەی ڕێسای یاسایی یەوە کەلەبناغەدا لەلایەن لیژنەی پسپۆڕەوە دادەنرێت و ئامادە دەکرێت. شتێکی ئاشکراو ڕوونە کەزۆربەی ئەندامانی ئەم لیژنەیە یان هەموویان مەرجەکانی بڕیارهەلگۆزینیان تێدا نی یە ( شروط الإجتهاد ).

٣- ڕێسای فیقهی پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ خوای خۆیدا ڕێك دەخات بەپێچەوانەی ڕێسای یاسایی ( القاعدة القانونية ) .

٤- ڕێسای فیقهی پەیوەندی یەکی بەهێز و توندوتۆڵی بەئاکارەوە هەیە بەڵکو ئاوێتەو تێکەڵە لەگەڵیدا بەپێچەوانەی ڕێسای یاسایی یەوە کەپاداشتی سەرپێچی کردنی ئاکارەکان پاداشتێکی ئاکاری ئەدەبی و مەعنەوی یە.

ب- لایەنەکانی (بوارەکانی) لێکچون زۆرن هەندێکیان ئەمانەی خوارەوەن:

١- هەریەك لە( ڕێسای فیقهی و یاسایی) کەم و کوڕتیان تێداهەیە ، لەبەرئەوەی عەقڵی کنەکار و هەلگۆزەری ڕێساکان لەهەردوو گروپەکە ( دەستەکەدا) عەقڵی مرۆڤە کە هەموو شتەکان گەمارۆ نادات و ڕێگەیان پێنابات کەلە ئایندەو ئێستا و واقیعدا ڕوو دەدەن.

٢- هەردوك هەڵەی تێدا دەکرێت ( هەڵەی تێ دەکەوێت) چونکەر هەر موجتەهیدێك هەروەك حوکمەکە دەپێکێ و دەنۆزێتەوە ئاوەش دەکەوێتە هەڵەوە وەك پێغەمبەری خوا فەرموویەتی (( اذا حكم الحاكم فأجتهد فاصاب فله أجران واذا حكم فأجتهد واخطأ فله أجر)) [1] .

٣- هەردوکیان دەستکاری و گۆڕانکاری و هەڵوەشاندنەوە هەڵدەگرن لەژێر تیشکی پێش کەوتن و پێداویستی یەکانی ژیاندا.

٤- هەردولا ئامانجیان بەرژەوەندی مرۆڤە.

٥- زۆرێك لەڕێسا یاسایی یەکان لەبناغەدا ڕێسای فیقهین لەجیهانی ئیسلامدا هەروەك لەوانەیە زۆرجیانەبن بەگوێرەی (لەچاو) جیهانی نائیسلامەوە.

---

[1] ) پاداشتی ئەرکەکەی و پاداشتی پێکانی بڕیارەکە، واتە ئەگەر موجتەهید ویستی حوکمی بابەتێك بەدەست بهێنێت لەبەر ئەوەی دەرهێنانی پێش حوکم پێکردنیەتی

# جێباسی دووەم:
# پێویستی بوونی یاسا

لەسەرەتای بوونەوەرەوە جیهانی مرۆڤایەتی بووەتەدوو سەربازگەوە : سەربازگەی چاکە و سەربازگەی خراپە، ڕۆژێك لەڕۆژان چاکە بەسەر خراپەدا سەرنەکەوتووە تەنها لەبەر ئەوەی چاکەیە هەروەك خراپە شکستی نەهێناوە لەسەردەمێك لەسەردەمەکاندا لەبەرئەوەی کەخراپەیە. لەبەرئەوە ئەم بەرنامە و ڕێگە وژیان وای خواستووە لەهەموو کات و لەشوێن و لەهەموو کۆمەڵگەیەك لەکۆمەڵگەکاندا کەدەبێت سیستەمێکی یاسایی هەبێت ، ئەم کاروانە قەرەباڵغە زۆرانبازە بگەیەنێتە لێوار و کەناری خێرو چاکە و چاکسازی لەکۆتای کاردا. وەك ئیلهام وەرگرتنێك و هەڵقولینێك لەم واقیعەی خێزانی مرۆڤایەتیە بیریارو فەیلەسوفەکان لەسەرەتای دەست پێکردنی گەیشتنی عەقڵی مرۆڤەوە بەشوێن سەرچاوەی چاکە و خراپەدا لەمرۆڤدا گەڕاون و هەوڵیان داوە ئەم سەرچاوەیە بەدەست بێنن لەناسینی سروشتی مرۆڤەوە ، ئایا لەخودی خۆیدا چاکەخوازە یان خراپە خواز ، جگەلەوەش ڕای جیاواز و جۆرلو جۆریان هەیە لە چۆناندنی ئەم سروشتە دا. ( واتە سروشتی مرۆڤ چۆنە) کە لەم خاڵانەدا خۆی دەنوێنێ:-

أ- هەندێکیان دەڵێن : سروشتی مرۆڤ لەسەر چاکەخوازی دروست کراوە ، لەپێشەوەی پشتیوانانی ئەم ڕایە ،ئاراستەیە سوقراتی فەیلەسوف بەدی دەکرێت [1] ، ئەو دەڵێت سروشتی مرۆڤ کاتێك خراپەخوازە کەکەوێتە ژێر کارگەرە دەرەکی یەکانەوە و شتی کتوپڕ فترەتە پاکەکەی دەکات بەژێرەوە و وەك ئەکتەرە بەرەستەیەکان (المادیە) یان سروشتی

---

[1] ) سوقرات ( ٤٦٩-٣٩٩ پ.ز) فەیلەوسوفی یۆنانی یە لە ئەسینا هیچ نوسراوێکی لێ بەجێ نەماوە ، بەڵکو ئەفلاتوونی قوتابی ئامۆژگاری و ڕێنمای و ژیانەکەی تۆمار کردووە ، سوقرات باوەڕی وابوو کەهەڵگر و هێنەری پەیام بووە لەچاکەسازیدا ، الموسعة العربية المسيرة / ص ٥٩٦

یەکان یان کۆمەڵەی یەکان یان کۆمەڵایەتی یەکان یان وێنەی ئەمانە کەوای لێدەکات بکەوێتە ژێر هەژموون و رکێفی مێردەزمەی ئارەزووەکانەوە بێتە ملکەچی ئارەزووە نەرێنی یە دەرونی یەکان ، سوقرات سەرقافلەی ئەم رایە دەدرێتە قەڵەم.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا رەخنەی لەم رایە گرتووە بەوهۆیەوە کەپێچەوانەو دژی زۆربەی سەلمێنراوە کرداریەکانە و دەستەمۆکەرەستەییەکانە ئەمەش لەبەرئەوەیە کەهەموو خەڵك بەسروشت باش بن( باش خوازبن) ئەبێ کێ فێری خراپەی کردبێ خۆ؟ ئەگەر هەندێکیان فێرکردبێ کەواتە هەندیك خراپن و هەموو چاك نین ، بەڵام ئەگەر لەخۆیانەوە (خۆیان) فێری بوون لەبەرئەوەی ئارەزوویان لێی بووە کەواتە هەموویان خراپ و خراپەخوازن، با ئارەزووی چاکەخوازیان تێدابێت ، مادامێك حەزی خراپەکاری تێیاندا زاڵ بێت.

ب- هەندێکی تر لەوانە گروپی ( بەسومیەکان)[1] کەراو بۆچونیان پێچەوانەی رای کۆمەڵی پێشووە و دەڵێن مرۆڤ سروشت و فێرەتی لەسەر خراپەخوازی و خراپەکردن دروست کراوە کەواتە ئەو بەسروشت خراپە، و چاکەکردنی( چاکەئەنجامدانی) بەهۆی کۆمەڵێك فاکتەرەوەیە کەلەخودی مرۆڤەکە بەدەرن وەك هۆشیارکردنەوە و پەروەردەو ئاراستەکردنی ئاینی و رۆشنبیرکردن و وەك ئەمانە. (لومبروزو) لەلایەن گرانی ئەم بۆچون و ئاراستەیە پێی وایە کەدیاردەی تاوان و پاشگەزبوونەوەی تاوانبار نیشانەن ( دەگەیەنێت) بۆ بناغەیەکی سەرەتایی و دێرین (کۆن) کەلەدەرون و دوتوێیدا غەریزەی وەحشیگەرانەی مرۆڤی سەرەتایی هەڵدەگرێت، نیشاندەری سروشتی ئاژەڵە نزمەکانە. هەمان رەخنەی پێشوو رووبەڕووی ئەم بۆچونەش دەبێتەوە. واتە ئەگەر هەموویان خراپەخواز و خراپ بن ئایا کێ فێری چاکەی کردوون ؟ ئەگەر هەندێکیان فێریان کردبن کەواتە هەموو خراپ و خراپە خواز نین ، ئەگەر لەخۆیانەوە فێربووبن لەبەرئەوەی حەزیان لێبووە کەواتە هەموو بەسروشت چاکن. سەرەڕای ئەوەش زانستی نوێ سەلماندویەتی کەهیچ سیفەتێکی

---

[1] کۆمەڵەیەکن لە ساڵی (١٥٢٤) میلادیدا دامەزرا بەسەرۆکایەتی لجناسیوسی ئەسپانی ئامانجەکەی بڵاوکردنەوەی ئاینی کریستانیەو پشتگیری کردنە لەکاسۆلیکەت بۆ ئەم مەبەستەش چەند پەیمانگاو کۆلێژی دامەزراند،پاپاش دانی بەم کۆمەڵگەیەدا نا لەساڵی (١٥٤٠) الموسوعە العربیە المسیرە ل ١٩٨٢

جەستەیی توێکاری ئەوە ناگرێتەوە کەلەمرۆڤدا هێزی تاوان خواز هەیە کەدەبێتە سەرچاوەی تاوان و خراپەکاری.

ج- فەیلەسوف ئەڵمانی (کانت) دەڵێت [1] : منداڵی بچوك ناتوانرێت پێی بوترێت فیترەتی خراپە یان چاك و چاکەخوازە لەبەرئەوەی نازانێت چی دەکات و تێناگەیەت لەقسەکانی. رەخنەش لەم رایە دەگیرێت بەوەی تێکەڵ کردنە لەنێوان فیترەت و سروشتدا، کەوابوو منداڵ ناتوانێ بڵێ فیترەتی چاکە یان خراپ لەبەرئەوەی نەگەیشتووە و کاڵ فامە نەك لەبەرسروشتی ( طبیعته ) . ئەوەی ڕاستی بێت لەواقیعدا مرۆڤ بەسەلیقەو سروشت نەخراپە و نەچاکە بەڵکوجیهانێکی ناوەندە (میانەیە) لەنێوان جیهانی فریشتەدا (ئەوانەی سەرپێچی فرمانەکانی خواناکەن و هەرچی یەکیان پێدەوترێت بێ سێ ودوو جێبەجێی دەکەن، سەرای ئەوەش شایستەی پاداشتی چاك نین وەك چۆن کەسێك ناچارکرابێت لەسەر خراپەکردن شیاوی سزادان نیە) و لەنێوان جیهانی ئاژەڵدا کەبەرپرسیار نیە بەرامبەر کردەوە خراپەکانی بەهۆی نەبوونی عەقڵ و بەرپرسیارێتی و نەبوونی چاکەتێیدا وەك گورگ و پڵنگ و ئاژەڵە درندەکانی تر. بەڵام مرۆڤ لەسروشتی و پێکهاتنیدا پێکەوە چاکەوخراپەی هەڵگرتووە ، هەروەك چۆن ئەم ئایەتەی قورئان بەڕاشکاوی باسی لێوەدەکات﴿ونفسٍ وما سوالها ، فألْهَمَهافُجُرَها وتقواها ،قَدْ أفلَحَ مَن زكاها،وقَدْ خابَ من دساها..﴾[2]

فەرموودەی خوا ﴿ إنّا هَدَيْناه السبيلَ إمّا شاكراً وإمّا كَفُوراً﴾ [3] واتە مرۆڤمان فێرکردووە لەرێگەی بەرنامەکانمانەوە کەبزانێت ڕێگەی چاکە کامەیەو هەروەهارێگەی خراپە، پاش ئەم فێرکردنە سوپاس گوزارە بەگرتنی ڕێگەی چاکە یان ناسوپاس گوزارە بەگرتنی (هەڵبژاردنی) ڕێگەی خراپە. دەتوانین لەم چەند ئایەتەو ئایەتەکانی تری وێنەی ئەم

---

[1] ) کانت عما نوئیل (١٧٢٤ — ١٨٠٤) کونجسبرس لەدایك بووە لەدوو قەزدی فەلسەفی ئەوروپایی سەرەکی کاریان کردۆتە سەرهزری ئەم زانایە:یەکێکیان ئەو رێچکە عەقڵ گەراییەیە کەلەمامۆستاکانیەوە بۆی مابووەوە وەك( لیشن)، ئەوی تریان رێچکەی ئەزمونگەرایی، فەلسەفەی ئەم زانایە لەقۆناغی دلنانی پەرتوکی (النقدالعقلی الخالص) دا پێگەشت وە ئەمزانایە فەلسەفە رەخنەگەریەکەی ناویانگی دەرکرد(رەنگی دلیەوە ) الموسوعة الفلسفية المحتضرة ص ٢٤٦.

[2] ) سورة الشمس / ٧ — ١٠

[3] ) سورة الانسان / ٣

ئایەتانەدا دەردەکەوێت هەموو تاکێك لەتاکەکانی مرۆڤ وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆی خاوەن شکۆی سەربەخۆ وایە و سەرۆکێکی هەیە ئەویش مێشکە ( الدماغ) ئەم سەرۆکە دوو وەزیر یان دوو ڕاوێژکاری هەیە یەکێکیان ئارەزووی خێرکردنەو ئەوی تریان ئارەزووی خراپەکردن ، ئەم دەوڵەتەش دەزگایەکی بەرگری هەیە کەزمان و دوو دەستو قاچەکانن دەزگای ئاسایش و هەواڵگری هەیە کەبریتین لە پێنج هەستە دیارەکە) و وهێزی خێر ئاڕاستەی ئەم سەرۆکەدەکات بەرەو هەڵبژاردنی کارەچاکەکان ، هەروەك لەهەمان کاتدا هێزی خراپە بەرەو خراپە ئەنجامدان ئاڕاستەی دەکات ، جائەگەر ئەو ژینگەیەی (دەوروبەرەی) کەتاکی تێداگەورە دەبێت و گەشەدەکات و چاك بوو ئەو هەل و مەرج و کەش و هەوایەی لەدەوروبەریدا یارمەتی تاکەکەی دەدا تاهێزی چاکەزاڵ بێت بەسەرهێزی خراپەدا ئەوا ئەو تاکە بەچاك گەشە دەکات و دەبێتە ئەندامێکی باشی. بەسوود لەخێزان و کۆمەڵگەکەیدا. بەپێچەوانەی ئەوەوە مرۆڤەکە (تاکەکە) ڕێگەی لاردەگرێت و ڕێی لێ گوم دەبێت ، جائەگەر تاکەکە بەردەوام بوو لەڕاوێژکردن بەیەکێك لەم دوو هێزە هێزەکەی تری دەوەستێت لەجێبەجێ کردن و بەجێهێنانی فەرمانە ڕاوێژکاری و ئاڕاستەکردنەکەی ،لەبەر ئەمە دەبینین کەهەرکەسێك لەسەر چاکە پەروەردەبکرێت و گەشەبکات ئەوا زۆربەلایەوە گران و ئاستەنگە کردەوەیەك لەکردەوەخراپەکان ئەنجام بدات لەکاتی تێکەڵ بوون و مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵك دا. وەبەپێچەوانەی ئەوەوە کەسێك ڕاهاتبێت و خۆی گرتبێت لەسەر خراپە ئەنجام دان ئەوا زۆر ئەستەم و گرانە کە پابەند بێت بەجێبەجێ کردنی بڕیارو وتەکانیەوە لەگەڵ کەسانی دەوروبەریدا.[١]

بۆ هاوسەنگ بوون و بەرامبەر وەستانی ئەم دوو هێزەو زاڵ نەبوونی هیچ کام بەسەر ئەوتردا، کاتێك کەمرۆڤ لەسەرەتای ژیانییەوە دوو دڵەلە بەئەنجامدانی کارێك کەشەرع یان یاسا قەدەغەی منعی کردووە.

[١] ) بۆ زیاتر درێژەپێدان تەماشای باسەکەمان ( الطاقة الروحية والفلسفة ) بکە کەلەکۆنفرانسی زانستی لەساڵی (١٩٩٩) پێش کەش کرا لەنامیلکەیەکدا بڵاوکراوەتەوە، هەروەها سەیری پەرتووکەکەمان بکە (مناهج الإسلام المكافحة الاجرام ) ل٣ و پاش ئەوەش

پاش ئەم پێشەکی یە کورتە بۆمان دەردەکەوێت کەیاسا لەهەموو کۆمەڵگەیەك لەجیهاندا یەکێکە لەگرنگترین پێداویستی یە ژیانیەکان بۆ ڕێکخستنی ژیان کەیارمەتیان بدات لەزاڵکردن و سەرخەستنی هێزی چاکە بەسەر هێزی خراپەدا ئەگەر ڕێز لەم یاسایە بگیرێت و بەپێی ڕێنمونی و داخوازی یەکانی هەنگاو هەڵبگیرێت.

شایانی باسە ملکەچی بەتەنها نابڕدرێت بەسەر مرۆڤدا کەبەشێکی لاواز و بچوکە لەچاو قەبارەی ئەو بوونەوەرەدا دەژیت بەڵکو بۆ هەریەشێك لەبەشەکانی ئەم گەردوونەی کەهێشتا عەقڵی زانایانی بۆشای ئاسمانی تێدا سەرسامە کەلەکوێوە دەست پێدەکات و لەکوێدا کۆتای دێت؟ فرمانێکی پێسپێردراوە بەپێی ئەو سروشتەی لەسەری دروست کراوە و یاسایەکی هەیە بۆچونی یەتی ئەنجامدانی ئەم ئەرك و فرمانانە ، جا ئەگەر فەرمانەکە دەچووە چوارچێوەی خۆویستەوە ئەوا بەیاسای دانراو(مرۆڤ) ڕێك دەخرێت ، ئەگەر بەم شێوەیە نەبوو ئەوا بەپێی ئەو یاساخوایی یەی کەفەیلەسوف و زانایان پێدەڵێن یاسای سروشت ڕێك دەخرێت. پێوەری جیاکردنەوە لەنێوان ئەو شتانەدا مل کەچی یاسای سروشتین و ئەو شتانەلا کەملکەچی یاسای مرۆڤن:

گرنگی زانینی ئەم پێوەرەو بواری جێبەجێ کردن و چەسپاندنی هەریەك لەم دوو یاسایە پێویستی بەلێکۆڵینەوەی هێزی بونەوەرە زیندوو ئەرکەکانیان هەیە بۆ نەهێشتن و لابردنی ئەو تێکەڵ کردنە کەزۆریەی زانایانی یاسایی تێکەوتوون لەنێوان ئەوەی کەبەپێی یاسای سروشتی دەبرێت بەڕێوە لەنێوان ئەو شتانەی کەبەپێی یاسای مرۆڤ دەچێت بەڕێوە لەبواری جێبەجێ کردندا. شتێکی ئاشکرایە کە بۆ هەموو بونەوەرێکی زیندوو فەرمانێك هەیە یان چەند فەرمانێك جێبەجێیان دەکات لەژێر سیستەمێکی سروشتی خوایی دا یان مرۆڤ کرد دا( الوصفی) . شتێکی بەڵگەنەویستە کەبونەوەرە زیندووەکان ڕووەکەکانن بەمانا گشتی و گشتگیری یەکەی و هەواو دارودرەخت و ئاژەڵ و مرۆڤ دەگرێتەوە، بۆ هەرجۆرێك لەم سێ جۆرە بوونەوەرە زیندوانە هێزێکی خودی (ذاتي) بەردەوام هەیە کەلەزانستی فەلسەفەدا بەنەفس ناودەبرێت.

یەکەم: نەفسی خۆراك خواردن: سێ هێزی هەیە کەهاوبەشن لەنێوان ڕوەك و ئاژەڵ و مرۆڤدا بەلام ملکەچە بۆ یاسای خوای سروشتی نەك یاسای مرۆڤ کرد (الوصفی).

أ– هێزی دەرخواردەر: ئەمیش هێزێکە خواردن دەگۆڕێت بۆ چەند توخمێکی هاوشێوە و گونجاو لەگەڵ جەستەدا و دەیلکێنێت پێوەی تا جێی ئەو شتانە بگرێتەوە کەلەجەستە جیادەبنەوە

ب– هێزی پەروەردەکەر یان گەشەدەر بریتی یە لەو هێزەی یارمەتی جەستە دەدات کەبکشێت لەسێ لاوە ( درێژی ، پانی ، قوڵی) تابگەیەتە ئەندازەی خۆ لەگەشەکردندا و جەستە سروشتی بێت ئەگەر زیادەکە لەنێوان هەموو بەشە جیاوازەکانی لەشدا گونجاو بوو.

ج– هێزەی بەدیهێنان ( زایندە) هێزێکە بەشێك لەجەستە وەردەگرێت کەگونجاو بێت بۆ گۆڕان تابێتە جەستەیەکی وەك خۆی پاشان دەچێتەناوی یەوە بەڕێگەی کوتان و کارلێکردنەوە بەجۆرێك دەیکاتە جەستەیەکی وەك خۆی پاش ئەوەی جەستەیەکی هێزەکی بوو ( بالقوة).

دووەم : نەفسی ئاژەڵی: ئەمەش ئاژەڵ و مرۆڤ تێیدا هاوبەشن نەك ڕووەك ، ئەم نەفسە دوو هێزی هەیە بزوێنەر و پەیبەر (مدركة) .

١–هێزی بزوێنەر : ئەو هێزەیە لەدەمار و ماسولکەکاندا سەرهەڵدەدات (هەیە) پاڵی پێوەدەنێت بۆ ئەنجامدانی کارێك ، هۆکاری کاریگەرو پاڵنەر بۆ ئەم بزێنەرە بریتی یە لەهێزی ئارەزووبازی یان هێزی توڕەیی یان ویستی (ارادی):

أ– هێزی ئارەزوو بازی :ئەو هێزەیە مرۆڤ دەجولێنێت یان ئاژەڵ بۆ بەدەست خستن و بەدیهێنانی شتەپێویستەکان یان بەسود و چێژەکان بۆخۆی.

ب–هێزی توڕەیی : ئەو هێزەیە کەخاوەنەکەی دەجولێنێت لەبەردوور خستنەوەی لەوشتەی کەزیان بەخشە یان خراپە یان بۆ هێرش کردنەسەر و زاڵ بوون بەسەریدا ئەم دووهێزە لەمرۆڤ و ئاژەڵیشدا هەیە دەکەونە ژێر یاسای سروشتی یەوە لەبەجێهێنانی ئەرکەکانیاندا.

ج–بەڵام هێزی خۆویستانەی هۆشیار تەنها بۆ مرۆڤ دەبێت فەرمان لەهێزی هۆشەوە وەردەگرێت کەبڕیاردەدات بەکردنی یان نەکردنی شتەکان دەکات ، ئەم هێزە لەڕووی بەجێهێنانی کارەکەیەوە لەوبوارانەدا کەپەیوەندی هەیە بە پەیوەندی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگەوە پێویستی بەڕێکخستنێکی یاسایی دارێژراو هەیە بۆ دانانی سنورێك بۆی و ڕێگە لێگرتنی لەپێشێل کردنی مافەکانی کەسانی تری کۆمەڵگا

٢- هێزی پەیبەر (القوة المدركة) بۆ مرۆڤ لەڕووی سروشتی ئەركەكانیەوە دابەش دەبێت بۆ پەیبردنی دەرەكی (الادراك الظاهري) و زانینی ناوەكی (الادراك الداخلي) .

١- پەیبردنی دەرەكی : بەهۆی یەكێك لەپێنج هەستەكەوە دەبێت كەوێنەی هەست پێكراوەكانیان تێدا چاپ دەبێت كەوابوو چاو بۆ ڕەنگەكان و گوێش بۆدەنگەكان و پێست بۆ بەركەوتنی شتەكان (للمس)، تامیش بۆ چێژە یەكان و لوتیش بۆ بۆنەكان ( الروائع) ، هیچ بەناویەك چونێك لەنێوان ئەركەكانی ئەم هەستەوەرانەدا بەدی ناكرێت.

٢- پەیبردنی ناوەكی: بەهۆی كۆمەڵێك هەستەوەری ناوەكی یەوە دەبێت كەبریتین :

أ- هەستی هاوبەش (الحسن المشترك): مەڵبەندێكە وێنەدەرەكی یەكانی تێدا كۆدەبێتەوە كەبەهۆی پێنج هەستەوەرە دیارەكەوە وەرگیراون ، یان ئەو وێنە خەیاڵیانەی كەهەندێكجار لە هێزی خەیاڵكردنەوە دەردەهێنرێت لەژێر كاریگەری هەستێكی بەهێزدا لەترس یان حەز و ئارەزوو.

ب- جێگای خەیاڵ (هێزی خەیاڵكار): گرنگترین هێزی هەناوی و ناوەكی یە سێ فەرمانی هەیە:

یەكەم: پاراستن و هێڵانەوەی وێنە هەست پێكراوەكان كە بەهەستی هاوبەشەوەهاتووە بەسەریدا .

دووەم: شیكردنەوە و پێكەوە لكاندنی وێنەكان لەهەندێ جار وێنە دروست دەكات كەلەجیهانی واقعدا (ڕاستی دا) بوونی نیە وەك وێنەی (سمیرغ)[1].

سێیەم: لاسایی كردنەوە واتە: نواندنی شتەكانە لەشێوەی هەست پێكراو دا كەیارمەتی ئاسان تێگەیشتنی شتەكان و هەست پێكردنیان دەدات . ئەم لاسای كردنەوانە ئەگونجێت لەهەست پێكراو ناهەست پێكراوەكاندا بەدەست بێت.

٣- هێزی وەهمكار (الواهمة): ئەمیش هێزێكی لەهەست پێكراو ، لەشتی ناهەست پێكراو بەدەستی دێنێت وەك هەست پێكردنی زیرەكی لەخوێندكاردا، هەڵێنجانی ئەم زیرەكیە لەگوێلێبوونی (بیستنی) وەڵامەكانیەوە و هەست پێكردنی ترسناكی تاوانبار لەهۆكارە دڕندەیی یە بەكارهاتووەكانیەوە لەئەنجامدانی تاوانەكەدا.

[1] ) وەك زانایانی لۆجیك دەڵێن : پێك هاتووە لەجەستەی وشترو باڵی باڵندە

٤- هێزی بیریاری یان (پارێزەر) : ئەمیش هێزێکە پارێزگاری دەکات لەو وێنانەی کەلەهێزی واهمەوە بۆی هاتووە، هەروەك چۆن هێزی خەیاڵ ئەو وێنانە دەپارێزێت کەلەهەستەکانەوە بۆی دێت.

سێ یەم: نەفسی مرۆڤیی و پێشی دەوترێت دەروونی عاقڵ و دەرونی زانا. هێزی لێکدرەوە ، هێزی بیرکردنەوە کەتایبەتە بەمرۆڤەوە دابەش دەبێت بە عەقڵی پراکتیکی و عەقڵی زانستی یان (تیۆری )

أ-عەقڵی کرداری (پرکتیکی): ئەو عەقڵەیە هەڵدەستێت بەهەڵگوزینی ئەو کارە مرۆڤییەی دەبیت بکرێت لەراویژکاری وپیشەسازیەکان وەك نەخشەکێشان بۆ باڵەخانەیك یان پرۆژەیەك یان دانانی نەخشەی پێنج ساڵی بۆنمونە بۆ پرۆژە ئایندەییەکانی وڵات و وێنەی ئەمانە.

ب-عەقڵی زانستی یان (تیۆری) ئەویش عەقڵە بەمانا فراوانەکەی و فەیلەسوفانی کردویانە بەم چوار بەشەی خوارەوە:-

١-عەقڵی هەیولانی یان (عەقڵی بەتوانا) بریتی یە لەئامادەییەکی ڕووت بۆ مرۆڤ بۆ وەرگرتنی شتەکان کەلەباریا هەیە ببێت بەو شتانە، ئەو وەکو پەڕەیەکی سپیدایە هیچی لەسەر نەنوسرابێت بەڵام ئامادەکراوە بۆ وەرگرتنی هەروێنەو ڕەنگێك لەسەری یان وەك مۆمێك وایە یان قورێکی دەست کردی تەڕی سادە وایە کەنەکرابێت بەهیچ (واتە هیچی لێ دروست نەکرابێت) بەڵام هەڵدەگرێت و دەتوانرێت هەروێنەیەکی پێ بکێشرێت لەبەرئەوە دیسان پێی دەگوترێت عەقڵی کارتێکراو.

٢-عەقڵی سود لێبینراو: ئەو عەقڵەیە پەی بەشتە هەستپێنەکراوەکان دەبات بێ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ هەست پێکراوەکان جاکاتێك عەقڵ لەقۆناغی توانابوونی زانینی شتەمەعنەویە دارنراوەکان کەلەوێنە دیارەکانەوە دەست کەوتوون گوێزرایەوە بۆ توانابوونی زانین و دەرك کردنی شتەنادیار و مەعنەوی یەکان بێ یارمەتی هەست پێکراوەکان ئەوە عەقڵە بە عەقڵی (سودلێبرنراو) ناو زەد دەکرێت ، ئەم پلەیە بەرزترین قۆناغە عەقڵی مرۆڤ دەیگاتێ ، ئەگەر ئەو دوو عەقڵەی پێشوو عەقڵی کەرەستەی بنەڕەتی (هیولانی) و (عەقڵی بەکرداری ) (عقل بالفعل) لەهەموو تاکێکی خەڵکدا هەبوون، ئەوا

عەقڵی (سودلێبینراو) تەنها بۆ کەمێك یان بەشێك و دەستەیەك لەخەڵکی هەیە ئەویش کەمە لەچاو مرۆڤەکاندا [1].

لێرەدا جیاوازی خەڵك دەردەکەوێت لەلێهاتوویی و کارامەی و پسپۆڕی و زانیاریەکاندا . جۆری چوارەمیش هەیە کە پێی دەوترێت عەقڵی چالاك، کەئەمەیان تەنها خەیاڵەو خەڵك خەڵەتاندنە بەڵکو بە شێك لەپڕوپوچی دەدرێتە قەڵەم کەفەیلەسوفەکان وێنایان کردووە بێ ئەوەی لەدەرەوەدا هیچ ڕاستی یەکی هەبێت لەبەرئەوە لەم لێکۆڵینەوە و نوسینەدا باسمان نەکرد، چونکە گریمانەدانان بۆ بونی وەکو هاوتا بڕیاردان وایە بۆ خوای گەورە، ئەم سێ دەروونە ( ڕووەکی ، ئاژەڵی ، مرۆڤی) و هێزەکانی ڕێکخستنی ئەرکەکانیان بەیاسای سروشتی(خودایی )دەبێت نەك یاسای مرۆڤ کرد لەم خستنەڕوو ڕونکردنەوە کورتەدا دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کەخوای گەورە وەك دروستکار و ڕێکخەر و پارێزەر و بەردەوامی پێدەری جیهان پەیوەندی بەردەوامی مانەوەی بەو جیهانەوە هەیە،بەدەر بوو چۆڵ لەدەرك کردن وادەگەیەنێت بۆبزوتنەوە خۆنەویستەکانی و بەجێهێنانی ئەرکەکانیان یاسایەك هەیە ، ئەو بونەوەرانەی کەویست و دەرکیان نیە دەجوڵێن و ئەرکەکانی خۆیان بەجێدەهێنن بەپێی یاسای خوایی کەفەیلەسوفەکان و زانایانی بەیاسای سروشتی ناوزەدی دەکەن. ئەو ئاژەڵانەی خۆ ویستانە دەجوڵێن و کاردەکەن بەپێی یاساکانیان بەتاکی وەکو زۆربەی ئاژەڵان یان بەکۆمەڵ وەکو مێروله و هەنگ و جگەلەمانیش لەو گروپانەی کە تاکەکانی هاوکاری یەکتر دەکەن بۆڕاپەڕاندنی فەرمانەکانیان و بەدیهێنانی ئامانجەکانیان و ئەم یاسایانە دەستکردی مرۆڤ نین ، ئاژەڵە کێوی و هەردی یەکان پابەندن بەیاسا سروشتی یەکانیانەوە بەغەریزە،بەڵام ئاژەڵەماڵیەکان (دەستەمۆکان) مل کەچی یاسا مرۆڤ کردەکانن بەپێی ئەوەی کەخاوەنەکانیان دەیان سەپێنێت بەسەریانداو بەپێی جۆر و شێوەی پەروەردەکردنیان و بەپراوپڕی ئەو سودانەی لێیانەوە دەست دەکەوێت ، لای ئاژەڵ ئەو چێژو خۆشی یە باڵایانە یە وەك ئێمە ئاوات و ئومێدیان نی یە لەبەرئەوەی ئاوات و هیواکان چەندگریمانەیەکی ئاوەزین( عەقڵین) لەچنراو (تەنراو)ی دەرك و دووربینین .

---

[1] ) تەماشای ( الفارابي) بکە درسة ونموص الأستاذ جوزف الهاشم / مشنورات دارالشرف الجديد / بيروت (ص١١٠) دواتر

وەترسی ئایندەکایان نیە بۆ نمونە ئازار دەکێشێت بەدەست مردنەوە وەك ئێمە بەڵام لێی ناترسێت لەبەرئەوەی پێش هاتن و ڕودانی نایزانێت و نایناسێت و مرۆڤ سەرەڕای جیاوازی لەگەڵ ئاژەڵانی تردا بەهۆی زانین و دەرکەوە و سەرەڕای ئەوەی کەخوا ڕێزی لێناوە و شکۆی داوە بەسەر زۆرێك لەدروست کراوەکانیدا [1].لەگەڵ ئەوەش دا خوای خۆی لەبیردەچێتەوە، لەبەرئەوە خوای گەورە بانگی کردووە بۆ ناسینی خۆی لەڕێگەی یاساکانی ئاینەوە(بەرنامە خواییەکان)، هەندێ جار لەخۆی بێئاگا دەبێت لەبەرئەوە فەیلەسوفەکان بەیاساکانی ئاکار(قوانین الاخلاق) هۆشیاریان کردۆتەوە، بازێجار ئەرك وپابەندی یەکانی لەبیردەکات دەکات بەرامبەرکەسانی تر لەهاوجۆری خۆی لەکۆمەڵگادا لەبەرئەوە یاسا دانەرەکان گەڕاندویانەتەوە بۆ هەست کردن بەبەرپرسیارێتی بۆ بەجێهێنانی ئەرکەکانی و پابەندیان کردووە بە ئەرك بەرامبەریان بەهۆی یاسا سزای و شارستانیەکانەوە.[2]

[1] ) وە لەئایەتی (( وفَضّلناهم علی کثیرٍ ممّن خلقنا تفضیلا)) الاسراء / ٧٠

٢ ) تەماشای کتێبی ( روح الشرائع)ی مونتسکیو وەرگێڕانی عادل زعیتر چاپ ١٩٥٣ القاهرە ل ١٢ پاش ئەو

# جێباسی سێیەم:
# یاسای سروشتی لەنێوان ڕاستی و ئەفسانەدا

یاسای سروشتی دراوەتە پاڵ سروشت وبەچەند واتایەك هاتووە كە ئەمانەی خوارەوە هەندێكیان:

أ–ئەوهێزە دەروات بەجەستەدا كە بەهۆیەوە(بوك) كان دەگەنە تەواوی سروشتی خۆیان [1]. ئەوەی تێبینی دەكرێت لەسەر ئەم پێناسەیە ئەوەیە كەدەست بەسەراگرتن (مەبەستی)ی تیدایە ، لەبەرەوەی پێناسەكە وشەی (الطبيعي) سروشتی لەپێناسەی سروشتدا هێنراو، ئەمەش نابێت چونكە (بسروشتی)بوون نازنرێت مەگەر پاش ناسینی ڕاستەقینەی سروشت (حقيقة الطبيعة).

ب–ماهیەت(چیەت): كۆی خودیە یەكانی شتەكەیە كەجیای دەكاتەوە لەجگە لەخۆی وەك (ڕەگەز و جیاكەرەوە)ی نزیك لە پێناسەی تاواندا بۆ نمونە قەدەغەكراوێكە سزا لەسەر ئەنجامدانی هەیە. وەك رازیبونی گرێبەست (ايجاب والقبول) لەپێناسەی گرێبەستدا بەوەی كەپەیوەندی (ايجاب)ەكە لەلایەن یەكێك لە ئەنجامدەری گرێبەستەوە بەقبوڵ كردنی لایەنەكەی تری گرێبەستەوە بەشێوەیەك كەكاریگەریەك لە گرێبەست لەسەركراوە دا دروست دەكات و هەروەها لەئەنجامدەری گرێبەستەكەدا. [2]

ئەوەی تێبینی دەكرێت لەسەر ئەم پێناسەیەكە نالۆجیكیە لەبەرئەوەی پێناسەیەكە بەتایبەتی ترین سروشتی بارەكان الاعراض[3]ناگرێتەوە، لەبەرئەوەی چیەتی(الماهية)بەم واتا تەنها خودیەكان (الذاتيات) دەگرێتەوە.

---

١ ) المعجم الفلسفي/المرجع السابق ب ٢ ل ١٣

٢ ) ماددەی (٧٣) لەیاسای شارستانی عێراقی.وشەی (والقاعد) لەزیادكردنی خۆمە لەبەرئەوەی پێناسەكە بێ ئەو وشەیە پابەندبونانە ناگرێتەوە كە ئاسەواری گرێبەستەكەن بەنیسبەت ئەگرێبەستكارەكەوە.

٣ ) العرض (بار_ ولرس): هەموو هەبونێك بە غەیری خۆیەوە بەندە وەك سپیەڵی و ڕەشیەڵی،هەروەك زاتی (خودی) ئەمەیە بەخۆیەوە بەندەو وەستاوە وەك شتەكان(الأعيان)

ج- ئەوەیە کە چۆنیەتی رِوداوێك لە رِوداوەکانی پێ دەخریتە روو وەك ئەوەی باسی چۆنیەتی کوشتن بکرێت بوترێت بۆ نمونە: کوشتنی ئەنقەست، یان نیمچە ئەنقەست یان هەڵە. یان چۆنیەتی باسکردنی هەڵسوکەوتی یاسایی بەوەی کەگرێبەست یان ویستێکی تەنهایە.

تێبینیش لەسەر ئەم پێناسەیە ئەوەیە ئەم پێناسەیەبە تایبەترین لەبەرئەوەی سروشت جگە لەبارودۆخەکانی چۆناندنیش دەگرێتەوە ، ئەوجۆرێکە لەجۆرەکانی سروشت.

د- ئەو شتەیە کەمرۆڤ پێی جیادەکرێتەوە لەسیفەتە فیتریەکان کەبەرامبەرە لەگەڵ سیفەتە بەدەست هێنراوەکان وەك قسەکردن و پێکەنین و زانین و وێنەی ئەوانە. رەخنەش لەم پێناسەیە دەگیرێت بەوەی ئەم پێناسەیە تایبەتی ترینە ،کەوابوو سروشتی وەسفکراوی ئەم چەشن و وەسفانە ناگرێتەوە.

ھ- میزاج: وەك گەرمی غەریزەیی و خودی رِووەکی وێنەی ئەمانە ، ئەم پێناسەیەش رەخنەی لێگیراوە لەبەرئەوەی کۆکەرەوە و گشتگیرنیە، چونکە میزاج جۆرێکە لەجۆرەکانی سروشت.

و_ پێناسەکراوە بەوەی کەبریتی یە لە خواستەکانی بونەوەرەوە گەردونیەکان و کارلێك کردنیان وەك کشانی کانزاکان بەگەرمی ، هاتنەوەیەکیان بەساردی ، وەك وەستانی لووەلیك رِژێنەکان لەدەردان لەکاتی ترس و ئالۆزیدا وەك لەحاڵەکانی پرسیارکردن لەو تاوەنبارەی کە پەیوەندی بە تاوانە ئەنجامدراوەکەوە هەیە لەنزیك یان دوور. رەخنەلەم پێناسەیە دەگیرێت بەوەی سروشتی کارەکان ناگرێتەوە لەبەرئەوەی خواست و کارلێکردنەکان لەبەشی کارلێك کراون و بۆ هەموو کارتێکردنێك کارلێکراوێك هەیە ، کەوابوو پێناسەکە سەرچاوەی کارتێکرنەکە ناگرێتەوە ، بۆنمونە ، هەموو کاتێکردنێك نابێت و رِوونادات بەکردار و کارنەبێت هەروەها خوازراو بێ خوازەرنابێت.

ز- یاسا ( سیستەم) یان ، ئەو یاسایانەی چواردەوری دیاردەکانی جیهانی بەرجەستەیی (المادی) یان داوە وەك سیستەمە گەردونیەکانی تەنەکانی بۆشایی ئاسمان ، تێبینی لەسەر ئەم پێناسەیە ئەوەیە کەسیستەم و یاساکانی چواردەوری بونەوەر لەخواستەکانی سروشتی بونەوەرن و بەسروشت نادرێنە قەڵەم.

ح- هەموو سیستەمێك و یاسایەك کەمرۆڤ ڕۆڵی نەبێت لە بوون و سەرهەڵدانیدا وەك یاساکانی لێدانی دڵ لەمرۆڤدا و یاسای گۆڕانی ئاو بۆ هەڵم و هەڵم بۆ لەپلەیەکی گەرمی دیاری کراو. ڕەخنەی لەپیش دەگیرێت کەئەم یاسایە لەدروست کراوی ویستی خوایە و لەسروشت نی یە . جگەلەم پێناسە و پێناسە فەلسەفیەکانی تر کە بۆسروشت کراون و هیچ کامێکیان ( لەکەم و کوڕی خاڵی نین وەك ناگشتگیری بونیان و هەندێ کەم و کوڕی تر. ئەو پێناسەیەی کەنزیك ترە لە واقیع و ڕاستییەوە بەپێوەری فەلسەفە ، تەنها پێناسەی یەکەمە ئەگەر بەند و کۆتی کۆتای یەکەی لابرێت (الطبيعي).

یاساي سروشتي :بریتی یە لەوەی فەیلەسوفەکان و ڕێچکە فەلسەفیەکان و زانایانی یاسا لەسەردەمی خۆیاندا لێی کۆڵیونەتەوە ، لەوڕووەوە کەیاسایەکی سروشتی یە لەنێوان ڕاستەقینە و ئەفسانەدا دەسوڕێتەوە.

یەکەم: یاسای سروشتی ڕاستەقینەیەکی هەیە لەدەرەوەی زەینی مرۆڤ هەروەك لەزەینیشدا هەیەتی، نکوڵی لێکردنی دەچێتە بەشی قسەبەشەڕدان و مل کەچ نەبوونە بۆ ڕاستی ئەگەر مەبەست پێی یەکێك لەم سێ واتایەی خوارەوە بێت هەروەك لەم ڕوونکردنەوەیەدا هاتووە:

١- یاسای سروشتی بەواتای یاسای خوایی : پێشی دەوترێت یاسای سروشتی لەسەر ئەو بناغەیەی کەمرۆڤ دەستی نیە لەپێك هێنانیدا هەروەك هەندێك لەفەیلەسوفەکان دەڵێن لەوانە( شیشرون) [1]: ئەو لەپەرتوکەکەیدا بەناوی (الجمهورية) (کۆماریی) دەڵێت: ( بێگومان یاسایەکی ڕاستەقینە هەیە کەئەویش عەقڵی ڕاستی پڕاوپڕە لەگەڵ سروشتدا تێمان دا هەیە تێگیرو نەمرە خاوەنی بناغەیەکی خوایی یە . ناگونجێت پێشنیاری هەڵوەشاندنەوەی ئەم یاسایە بکرێت و ناگونجێت پێچەوانەی هەڵسوکەوت بکرێت و هەڵبوەشێنرێتەوە ، چ لەڕۆمادا یان ئەسینادا هەموو یەك یاسایە ، لەم ڕۆو بەیانیدا هەریەك یاسایە ، یەك یاسایەو جێگیرو نەگۆڕە بەگوێرەی هەموو گەل و کاتەکان ئەو وەك خودایەکە و جیهانی وسەروەر و

---

[1] ) شیشرون مارکوس تلليوس ( ٦٠١ - ٥٤٣ ن ) شەرع زان و فەیلەسوف و ڕامیاری نوسەری ڕۆمانی بە هاوڕێی فەیلەسوفەکانی ئەکادیمییەو خوێندنگەی ڕواتیەکان و قوتابخانەی ئەبیقورییەکان بووە / الموسعة الفلسفية المختصرة ص ١٩٧.

سەرکردەی هەموو شتەکانە، بەڕاستی خوای گەورە دروست کەری ئەم یاسایەیە هەرئەو ئەندازەی بۆ داناوە و ئاشکرای کردووە )، کەوابوو یاسای سروشتی ئەو یاسایە هاو واتای یاسای خوایی یە هەروەك ئەم فەیلەسوفە ڕۆمانیە دەڵێت ، ئەو یاسایەی کەویستی مرۆڤ ڕۆڵی نیە لەدانانی دا.

دووەم: واتای دووەم ڕای فەیلەسوفی ئەکوینی توماسی یان (توما) [1]یەکە دەڵێت یاسای سروشتی دوو جۆرە:

١-یاسای سوشتی بنەڕەتی کەدانەرەکەری خوای گەورە.

٢-یاسای سروشتی ناوەندی ئەویش هاو واتای یاسای مرۆڤ کردە (الوصفی) بەپێی کات و شوێن دەگۆڕێت هەروەها بەپێی بارودۆخەکانی مرۆڤ .ئەوەی شایەنی باسە ئەم جۆرەی دووەم لەیاسای مرۆڤ کرد ڕای هەندێ لەفەیلەسوفەکانە ، لەوانە :

أ-فەیلەسوفی هۆڵەندی هیکو کروسیوس[2]:ڕای وایە کەیاسای سروشتی مرۆڤ کرد (الوصفی) ئەو یاسا یەیە کە سروشتی ئەو کۆمەڵگایە خواستویەتی کەتێیدا فەرمانڕەوایەو لەسروشتی داخوازی پێویستی یەکانی ژیانی هەڵگوزراوە ، بۆنمونە ئەو یاسایەی سروشتی کۆمەڵگەیەکی کشتوکاڵی دەیخوازێت ( دەیەوێت) جیاوازە لەو یاسای یەی کەکۆمەڵگەیەکی پیشەسازی دەیخوازێت. ئەم یاسایە بەپێشکەوتنی ئەو کۆمەڵگایە پێش دەکەوێت کەدەبیات بەڕێوە لەبەرئەوەی لە خواستەکانی سروشتێکی ڕاستەقینەیە.

ئەم فەیلەسوفە ڕای وایە کەبناغەی یاسای سروشتی سروشتی مرۆڤ و غەریزە کۆمەڵایەتی یەکانی یەتی کەدەیبزوێنێ بۆ پێکەوەنان و بنیات نانی پەیوەندی لەگەڵ هاوتاکانیدا ، کەوابوو سروشتی مرۆڤ سەرچاوەی یاسای سروشتی و بناغەکەیەتی ، لەبەرئەوەی ئەوەی مرۆڤ جیادەکاتەوە تەنها غەریزە کۆمەڵایەتی یەکەیەتی یان ( ئاتاجیەتی بەکۆمەڵگە).

---

١ ) (١٢٢٥ – ١٢٧٤) پێش تەمەنی ٥٠ساڵی کۆچی دوای کردووە خاوەنی فەلسەفەیەکی تایبەتە کەلە کۆمەڵە بەرهەمە فەلسەفیەکەیدا تۆماری کردووە بەناوی ( المجموعة اللاهوتیة ) ،باتەماشای موحازەرەکانی دکتۆر سلیمان مرقس بکرێت کە لەکۆلێجی یاسا پێشکەشی کردووە (ماستەر ١٩٦٨) بەئامێری ڕۆینۆ چاپکراوە ل ١١٤

٢ ) الأستاذ الشاوي / فلسفة القانون / ص ١١٧–١١٨

ب–فەیلەسوف فەڕەنسی مونتسکیو [1]: بەهەمان ڕاڤەو لێکدانەوەی (تەکوینی) و هیکو کروسیوس دەنوارێتە یاسای سروشتی لە پەرتوکەکەیدا ( روح الشرائع) [2] ، یاسای سروشت بەم ناوەوە بانگ دەکرێت ، لەبەرئەوەی لەسیستەمی بونمان داڕێژراون ، پێویستە بۆ ناسین و زانینیان تەماشای مرۆڤ بکرێت پێش کۆمەڵگەکان ، کەوابوو یاسای سروشتی دەبێت لەو شتانەی کەلەم کاتەدا وەری دەگرێت ، ئەم یاسایەی ئەوتۆ کەمۆرکی بیرۆکەی دروست کەرمان تێدا دروست دەکات و دەمانگەیەنێتە ئەو کەیەکەم یاسایە لەگرنگیدا .مونیستکو دەڵێت: هەموو یاسایەك پێویستە لەسروشتی ئەو کۆمەڵگەیە هەڵبگوزرێت کەدەبیات بەڕێوە ، لەبەرئەوە دەبێت یاساکان جیاواز بن بەپێی هەرێم و نەتەوە و بیروباوەڕ و شوێن و ئاراستە و هۆکاری وێنەی ئەمانە. پاشان تیۆرەکەی لەسەر ئەم بناغەیە بنیات ناو وتی (یاسای هەرکۆمەڵگەیەك بۆ کۆمەڵگەیەکی تر ناشێت و ناگونجێت) [3] .شتێکی ئاشکرایە کە یاسای سروشتی بەم مانایە پێی ناوترێت نەمرو نەگۆڕ و بێ سەرەتاو بێ کۆتای و گشتگیر بەڵکو دەگۆڕێت بەگۆڕینی کات و شوێن و بەگۆڕینی حاڵەتەکانی مرۆڤ و بەرەو پێش چوونی ژیانی.

٣– واتای سێ یەمی یاسای سروشتی لەو مانا ڕاستەقینە واقیعانە ئەوەیە ئەو بونەوەرە سروشتی یانە دەبات بەڕێوە کەناکەوێتە ژێر ڕکێفی و ویستی مرۆڤ وەك یاسای کێش کردن و یاسای کوڵانی ئاو لەپلەیەکی گەرمی دیاری کراودا و بەستنی لەپلەیەکی ساردی دیاری کراودا و یاسای سوڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆردا. کەواتە یاسای سروشتی بەم واتایە ڕای کەسێکە باوەڕی بەخودا هەیەو بونەوەر بەبێ کۆتا نازانێت هەمان ئەو یاسا خودایەیە ناگۆڕێت و جیاوازی نی یە بەپێی کات و شوێن و بارودۆخەکانی ژیانی مرۆڤ.کەیاسای سروشتە ئەگەر ناوبراو هێنراو مەبەست بەپێی یەکێك لەم سێ مانایە بوو کەوتمان ( باسمان کرد) ئەوا ڕاستەقینەو واقعێکی دەبێت و لەدەرەوە و دەورووبەر و ناوزەینیشدا بونی هەیە و نکولی لێکردنی حاشا لێکردن و شارینەوەی بەڵگەنەویستەکانە.

---

١ ) (١٦٨٥ –م)

٢ ) روح الشرائع / ل ١٤–١٥

٣) سەرچاوەی پێشوو (روح الشرائع) / ل ١٨–١٩

دووەم: یاسای سروشتی ئەفسانەیی:ئەمەش یاسایەکە بونی نییە تەنها لەزەینیدا نەبێت و خەیاڵی کەسێك دروستی دەکات کەدورە لە راستی و واقیع . ئەم جۆرە لە یاسای سروشتی مامۆستا عبدالرزاق سنهوری یاسا ناس هیناویەتی داویەتە پاڵ فەیلەسوفە موسلمانەکان و (موعتەزیلەکان )[1].ئەویش دانەپاڵێکی پێچەوانەو ئاوەژووە بۆ وێناکردنی موعتەزیلەکان و زانایانی تری یاسا شوێن پێیان هەڵگرتووە لەسەر بناغەی (گومانی باش) (حسن الظن) وەك مامۆستای دکتۆر : (منذرالشاوي) [2] پیاوانی تری یاسا .مامۆستا (سنهوری) دەڵێت: موعتەزیلە بڕوای بەیاسایەکی سروشتی هەیە سەرچاوەکەی عەقڵە نەك ئاین ،عەقڵ لای موعتەزیلە فەرمانڕەوایەکی ڕووتە بڕیاری جوانی و ناشرینی دەدا بەسەر خواو بەندەکاندا: ئەمجا بەسەر خوادا لەبەرئەوەی دەڵێن بەپێی عەقڵ پێویستە لەسەر خوا گونجاوترین باشترین شت بکات بۆ بەندەکانی ، ئەمە واتە کەواز لێهینانی قەدەغەیە لەسەر خوا، حوکمدان بە پێویست(واجب) حوکمدانە بەجوانی و ناشرینی لەلایەن عەقڵەوە ( واتە جوانی عەقڵی یان ناشرینی عەقڵی) ،بەڵام لەسەر بەندەکان لەبەرئەوەی عەقڵ لای ئەوان ئیش و کارەکانیان لەسەر پێویست دەکات و حوکمی بڕیاری ڕەوایی و ناڕەوایی یان ( یاساغیان) دەدات بێ ئەوەی خوا هیچ حوکمێکیان تێدا بدات ئەم قسەیە تەنها هەڵەیەك نی یەو بەس بەڵکو پڕوپوچیەکەو هیچ بناغەیەکی نیە نەلای موعتەزیلەکان و نەلای کەسێك کەلە قسەی موعتەزیلەکان تێدەگات لەم ڕووانەی خوارەوە:-

١-ئەوەی پێی دەوترێت یاسای سروشتی لای موعتەزیلەکان ئەوە بەرنامەی خوایە و سەرچاوەکەی هێزی یاسا دانانی خوایی یە نەك عەقڵ لەبەرئەوەی (موعتەزیلە) لەپێشەوەی ئەو کەسانەدان باوەڕیان بەم فەرمودەیەی خودا هەیە ﴿... إنَّ الحُكمُ إلاَّ الله ﴾ [3] نەرێنی کردن لەنەرێ ( نفي النفي) لەزانستی ڕەوان بێژیدا بۆ چەسپاندن و سەلماندنە لەڕووی کورت هەڵهێنانەوە واتە: حوکمی هەمووشتەکان لەزاتی خودادا کورت هەڵدێنێت عەقڵ هیچ ڕۆڵێکی نی یە لەدروست کردن و بەدیهێنانی دا ، بەڵام هەندێك جار عەقڵ هەندێك لەم

---

[1] )تەماشای وانە یاساییەکانی بکەکەبۆقوتابیانی یاسای وتۆتەوە لەعێراق لەساڵی ١٩٣٦ دا ل٣٢-٣٣
[2] ) فلسفة القانون ل ١١١
[3] ) سورە ی الأنعام / ٥٧

حوکمانە دەدۆزرێتەوە پێش هاتنی پەیام و پێغەمبەر لەرێگەی جوانی و ناشرینی عەقڵی یەوە.

٢-قسەی موعتەزیلە (ئەنجامدانی گونجاوترین شتەپێویستە لەسەر خوا بۆ بەندەکانی ) (سنهوری) لێی تێنەگەیشتووە لەگەڵ رێزم دا بۆ پایەزانستی یەکەی ، وشەی ( واجب) لەم قسەیەدا مانای واجبی شەرعی نی یە لەسەر خوا تا لەبەرامبەری دا (حرام) قەدەغە دابنرێت پاشان تاوان و بەرپرسیاری ، بەڵکو مەبەست ( واجبی) پێویستی عەقڵی یە کەلەبەرامبەری دا ( مستحیل) هەیە لەبەرئەوەی خوا پەیمانی داوەتە بەندەکانی کەگونجاوترین شتیان بۆ بکات و خواش پەیمانەکانی دواناخات و جێبەجێ یان دەکات هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی :﴿ وعدَ الله لايخلق الله وعدهُ ولكنّ اكثر الناس لايعلمون﴾[1] واتە پەیمانی خوایە خوا پەیمانی خۆی جێبەجێ دەکات بەلآم زۆربەی خەڵك نازانن ، لەبەرئەوەی عەقڵ بڕیار دەدات کەگونجاوترین شت بۆ بەندەکان ( پڕ بەرژەوەندی ترین شت) پێویستە لەسەر خوا بەپێویستی یەکی عەقڵی لەبەرئەوە پێچەوانەی ئەمە لەگەڵ دادگەری رەهایی خودادا پێك دەگیرێت (دژە) و پێچەوانەی پەیمانی خوایە و هەردوکیان (مەحاڵن) مستحیلن بۆ خوای گەورە. سنهوری جیاوازی نەکردووە لەنێوان واجبی شەرعی کەبەمانای حوکمی ئەرکی یە (تکلیفی)و وازلێهێنان و نەکردنی قەدەغەیەو ئەنجامنەدەری تاوانبارە شایستەی سزایە، لەنێوان پێویستی عەقڵی دا ( الواجب العقلي) کەسەرچاوەی عەقڵەو بەرامبەرەکەی موستەحیلی رەها یە.

٣-موعتەزیلە وتویانە: خوای گەورە فەرمان ناکات بەشتێك مەگەر بەوەی بەسودە بۆیان ، هەموو بەسودێك باشە و جوانە کەوابوو جوانی کردەوەکان بەندە لەسەر بەسود بوونی. نەك لەخۆیدا جوان بێت بەپێچەوانەی رای کەسانێك کەباوەڕیان وایە . هەروەها شتێك قەدەغەناکات تازیانی تێدا نەبێت و هەموو زیانبەخشێك ناشرینە لەبەرزیانەکەی نەك لەخودی خۆیدا لەبەرئەوە هەندێ جار کاری باش دەگۆڕێت بۆ ناشرینی ئەگەر سودەکەی بگۆڕێت بۆ زیان هەروەك (راستگۆیی) زیانگەیاندندا بەدی دەکرێت ، هەروەها هەندێك جار خراپ دەگۆڕێت بۆ چاکە ئەگەر زیانەکەی بوو بەسود هەروەك (لەدرۆی) سود بەخش دا

[1] ) سورة الروم / ٦

هەیە. بێ گومان خوای گەورە بەرِوونی ئەم راستی یەی باس کردووە لەدواندنی پێغەمبەرەکەیدا : ﴿ وَما أرْسَلْناكَ إلاّ رَحْمَةً للعلمين ﴾. [1]

رەحمەت (میهرەبانی) لەم ئایەتە پیرۆزەدا بریتی یە لەبەرژەوەندی مرۆڤایەتی ئیتر بەرژەوەندی یە ئەرێنی و نەرێنی یەکانی مرۆڤایەتیە.ئەوە هەیە عەقڵی مرۆڤ ناتوانێت هۆکار و بایسی هەموو بریارێك بزانێت و ئەوەی هۆکارەکەی نەزانێت بریارەکەشی نازانێت و دركی پێناکرێت پێش هاتنی شەرع و پەیامی خوا وەك بەتەنها واجب بوونی رۆژوو لەمانگی رەمەزاندا ، یان بریاردانی (عدة) ی مێرد مردن لەلایەن ژنەوە بە چوار مانگ و دەرۆژ ،بەڵام هەرشتێك هۆکارەکەی پێش هاتنی شەرع لەبارەیەوە – بزانرێت بریارەکەشی دەزانرێت وەك زانینی پێویستی دادگەری لەبەر جوانیە عەقڵی یەکەی کەلەسەر سودکەی بنیات نراوە ، یان قەدەغە بوونی ستەم لەسەر بناغەی ناشرینیە عەقڵی یەکەی کەلەسەر زیانەکەی بنیات نراوە ، کەواتە سەرچاوەی پێویست کردن(واجب) یان سآغ کردن(حرام) تەنها خوایە نەك عەقڵ ، کەوایە رۆڵی عەقڵ تەنها لەدۆزینەوەی بریاردا لەسەر بنەمای جوانی و ناشیرینی عەقڵی قەتیس دەمێنێت.

٤–موعتەزیلە رۆژێك لەرۆژان بیریان نەکردۆتەوە لەوەی بەوبریارە شەرعی یانەی کەعەقڵ دەیان دۆزێتەوە پێش هاتنی پەیام و پێغەمبەر لەسەر بناغەی جوانی و ناشرینی عەقڵیە کەدەڵێن ( یاسای سروشتی)، ئەم ناوە لەپەرتووکی موعتەزیلەکاندا نەهاتووە نەلەنزیك نەلەدوور لەبەرئەوەی سەرچاوەی یاسای سروشتی لای فەیلەسوفەکان بەس عەقڵە ، لەکاتێکدا سەرچاوەی بریارە شەرعی یەکان لای موعتەزیلە تەنها نیگای خوایی یە، عەقڵ رۆڵی دۆزینەوەی بریاری هەیە نەك دانانی، چەند جیاوازی یەك هەیە لەنێوان دانانی یاسا و دۆزینەوەی دا:

لەو کەسانەی کەهەمان بیرۆکەی مامۆستا (سنهوری)یان هەیە لەراڤەکردنی قسەی موعتەزیلەکاندا (دکتور منذر الشاوي)ە لەگەڵ زیاد کردنی هەڵەیەکی تازە ئەویش ئەوەیە کەعەقڵ دانەری چونکە بریارە شەرعی یەکانە و خوای گەورە دۆزەرەوەو ئاشکرا کاری شتێکە کەعەقڵ دایدەنێت ، ئەمیش هەمدیس ئەم پروپوچی و ئەفسانەیی داوەتە پاڵ

---

١ ) سورة الأنبياء / ١٠٧

گروپی موعتەزیلە لەژێرناونیشانی ( یاسای سروشتی لای موسوڵمانان) دەڵێت : دەکرێت بیرۆکەی یاسای سروشتی لای موعتەزیلەکان بەدی بکەین ئەوان لایان وابووە کەعەقڵ تاکە بناغەیە بۆ یاسای سروشتی لای ئەوان ئەو بڕیاردەرە بەجوانی یان ناشرینی و ئەو سەرچاوەی یاسایە نەك ( شەرع دانەر) بەم پێ یە بێگومان ڕۆڵی (شەرع دانەر) : تەنها دەرخستنی شتەکانە یان دانپێدانانی ئەو بڕیارانەیە کەعەقڵ دەرکیان پێدەکات لە ڕێساکانی [1] هەروەها خوالێخۆشبوماموٚستا عبدالباقی بەکریکەوتوەتە هەمان هەڵەوەبەلام بەشێوەیەکی تر [2] ئەوەدەڵێت: ( یاسای سروشتی ئەو یاسا بێ سەرەتا گشتگیرەی ئەوتۆیە کە کۆمەڵێك یاسای ڕابردوو گشتی و نەمر لەخۆدەگرێت کەکۆمەڵێك پێوەری ڕەهای پێ یە بۆ ڕاستی و دادگەری کەدروست کەری مرۆڤ نی یە بەڵکو زادەی هێزێکی زاڵ و بەهەژموون و ( سەقامگیرە) کە عەقڵ دەتوانێت بیخاتە ڕوو بۆڕێدەرکردنی لەژێر پرەنسیپەکاندا و دەبێتە ئەو نمونە هەرەباڵایەی کەپێویستە لەسەر یاسا دانەر بڕیارەکانی یاسا خۆکرد و دانراوەکانی لەحوکمی ڕێساکانی نزیك بکاتەوە چەندە سەرکەوتن هەبێت لەوەدا یاساکەی نزیك ترە لەتەواوییەوە) [3] . ئەگەر لەژیانی خوالێخۆش بوودا چاوت بەم قسەیە بکەوێت یان ئاگاداری بیت کەهیچ بونێکی نی یە جگەلە خەیاڵی وێژەرەکەیدا نەبێت ئەوا پێی دەڵێیت :

١– ئەم ڕستە پاراوانەت لەکوێ هێناوە کە وشەکانیان بۆشن و هیچ مانایەکی ڕاستەقینەو ڕاستیان نیە یان هەرنین .

٢–ئەو هێزە هەژموندار و زاڵە کامەیە کەیاسای سروشتی خولقاندووە ئایا زاتی خودایە ؟ ئەگەر وەلامەکە بەڵێ بوو ، بۆچی بەڕاشکاوی ناوت نەبردووە وەك شیشرون و توما الاکوینی و فەیلەسوفەکانی تری نائیسلامی وتیان.

٣– ئەو ڕێسا باڵا نەمرانە کامانەن ؟ بۆچی ڕێسایەکەت لەو ڕێسایانە ناونەبرد؟ ئەی جێبەجێ بوون و چەسپان و بەکردار کردنی ئەو ڕێسایانە وەك تۆ دەڵێی لەژیاندا کامەیە ؟

---

[1] ) الدکتور منذرالشاوي : فلسفة القانون ص ١١١

[2] ) لەکتێبەکەیدا نظرية القانون ل ١٢٨ پاش ئەو

٣ ) تەماشای ( فکرت القانون الطبیعي ) عند المسلمین بکە د.شریف ل ٨

٤–(أزلي) ئەوەیە سەرەتای نەبیٚ و کات و نەبوونی لیٚ پێش نەکەوتووە ئەمە ناچەسپیٚ هەتا بەسەر بەرنامەخوایی یەکانیشدا لەبەرئەوەی ئەمانە کاتێك هەبووە کەنەبوون . پەسنی (أزلیة) بیٚ سەرەتا بون تەنها بۆ زاتی خوا بەکاردێت.

٥–چۆن نزیك کردنەوە دەگونجێت لەنێوان یاسایەکی بیٚ سەرەتایی بیٚ کۆتا لەبەرئەوەی، ئەوەی بیٚ کۆتایی بوونی سەلمێنرا هەرگیز نەبوونی بەسەردا نایەت یاسایەکی مرۆڤ کردی گۆڕان و ئاڵوگۆڕ هەڵگرە لەژێر ڕۆشنای بەرەو پێش چوونی پێداویستیەکانی ژیان و گۆڕانی بەرژەوەندی یەکانی مرۆڤایەتی دا. بێگومان هەندێك لەزانایانی بنەماکانی فقە (أصول الفقە) کەوتونەتە هەمان هەڵەوە بەگوێرەی لێکدانەوەی (ڕاڤەی ) قسەی موعتەزیلە وەك ( ابن السبکی) لەپەرتوکەکەیدا (جمع الجوامع) ئەوەتا وتویەتی: ( موعتەزیلە عەقڵیان کردۆتە حاکم) واتە کردویانەتە دانەری حوکمە شەرعی یەکان بەڵام نەگەیشتونەتە سنور و ڕادەیەك کەبڵێین : عەقڵ ئەو حوکمانەی داناوە پاشان خوای گەورە ئۆزیویەتەوە و خستونیەتەڕوو ڕای گەیاندون بەخەڵکی لەڕێگەی پێغەمبەران و نێردراوانیەوە بۆ لابردنی تەمومژ لەسەر قسەی موعتەزیلە بەپێویستی دەزانین ئەم ڕوونکردنەوانەی خوارەوە بدەین:

گروپی موعتەزیلە وتویانە حوکمەکانی خوا هۆکاران ئامانجەکانیان لەپشتەوەیە کەبۆ بەرژەوەندی یەکانی خێزانی مرۆڤایەتی هاتوون ، دەگونجێت عەقڵ پێش هاتنی پەیامی پێغەمبەر بەشێوەیەکی کورت دەرکی بڕیارە شەرعی یەکان بکات بۆ ئەو کارانەی کەجوانی و ناشرینی عەقڵیان لەسەر بنەمای سود و زیان بنیات نراوە. ڕێگەی پەی پیٚ بردنی عەقڵ بۆ ( پێنج ) حوکمە شەرعیەکان لای موعتەزیلە بەم شێوەی خوارەوە دەبێت :

١–ئەگەر ئەنجامدانی کارەکە سودی مرۆڤی تێدابوو ، وازلێهێنانی زیانی بەمرۆڤ دەگەیاند ئەوا هەڵسان بە ئەنجامدانی ئەو کارە پێویستە(واجب). وەك باوەڕ بەخواو لقەکانی ، وەك دادگەری و هاوکاری یەکتر لەسەر چاکەکردن. [1]

---

١ )شایانی باسە باوەڕهێنان بەخوا پێویستیەکی عەقلیە پێش ئەوەی پێویستیەکی شەرعی بێت وە پێویستە باوەڕ هەموو کاتێك بەڵگەیی بێت لەسەر بەڵگەی عەقلی بنیاتنرابێت وەك بەڵگە هێنانەوە بە ئاسەوار لەسەر بوونی خاوەن ئاسەوار کەوابوو بەڵگەی چاو لێکەریانە وەر ناگیرێت (پەسەند نیە) شتێکی ڕوونە ئەگەر باوەڕ بەخوا لەسەر باوەڕ بەبەرنامەکانی (پێغەمبەر) وەستابێت ئەوا دەست بەسەردا گرتنی خواست و بیسترلو ڕوو دەدات وەك زانایانی یاسا دەڵێن یان دەور سەرهەڵدەدات وەك

←

٢–ئەگەر لەنەکردنی کارەکەدا سود هەبوو ، لەکردنیدا زیان ئەوا ئەو کارە ئەنجامدانی قەدەغەیە (حرام) وەك ستەم و هاوکاری یەکتر کردن لەسەر تاوان و دەست درێژی کاری .

٣–ئەگەر لەکارەکەیدا سود و قازانج هەبوو بەڵام بەنەکردنی هیچ زیانێك لەخەڵك نەکەوت ، کارەکەی بەسونەت دەدرێتە قەڵەم وەك سەردانی نەخۆش.

٤–ئەگەر لەنەکردنی کارەکەدا سود هەبوو، بەڵام کردنەکەی زیانی لێنەدەکەوتەوە ئەوا کارەکەی ناپەسەندە (مکروە) وەك هەستان بەکارێك کەپێچەوانەی نەریت و عادەتی دروست و بڵاوەبێ لە کۆمەڵگەدا.

٥–ئەگەر لەکردنی کارەکەو نەکردنی هیچ سود و زیان نەبوو بۆ دەوروبەرو کەسانی تر ئەوا کارەکە ڕەوایە ( مباح) وەك تایبەت کردنی کاتێکی دیاری کراو بۆ قورئان خوێندن ، یان خەوتن یان سەردان و خواردنی جۆرێکی تایبەتی لەخواردن.

---

زلنایانی لۆجیك دەڵێن.لەبەر باوەر بەبەرنامەکانی خولو نیردرلوەکانی بەدەست نایەت مەگەر پاش باوەر هینان بەخوا بۆ نمونە ئەگەر (أ) لەسەر (ب) وەستاو (ب) یش لەسەر (أ) ئەوا دەبێت (أ) لەسەر (أ) وەستابێت،پاش لابردنی ناوەندەکە ئەویش وەستانی شتە لەسەر خۆی،وەستانی شت لەسەر خۆی ئەوەدەگەیەنێت کەش بکەوێتە پێش خۆیەوە،ئەوەش ئاشکرایە کەشت ناکەوێتە پێش خۆیەوە کەوابو شت لەسەر خۆی ناوەستێت.

# بەندی سێ یەم

# فەلسەفەی یاسا

فەلسەفەی یاسا دەکرێت بەدوو بەشەوە:

١-فەلسەفەی گشتی

٢- فەلسەفەی تایبەتی

فەلسەفەی تایبەتی دوو جۆرە : نێودەوڵەتی و ناوخۆیی.

فەلسەفەی گشتی هاوبەش لەنێوان هەموو یاساکان لەجیهاندا بریتی یە لەوشتەی :بە ئامانج یان مەبەستەکان (هۆکارە بایس) یان هۆکارە خولقێنەر ، یان مەبەست و فاکتەرەکان ناودەبرێت ، وبەهەموو دەربڕینەکانی لەڕوی یاسادانان و گۆڕین و هەڵوەشاندنەوەوە بریتی یە لەبەرژەوەندی یە گشتی و تایبەتی یەکان کەیاسا دانیان پێدا دەنێت و دەیان پارێزێت و بریتی یە لە ماف و پابەندیانەی یاسا دیاریان دەکات و چاودێریان دەکات.لەڕووی چەسپاندن و جێبەجێ کردنەوە بریتی یە لە بەدیهێنانی دادگەری و یەکسانی .دادگەری: بریتی یە لە پێدانی هەر کەسێکی سروشتی یان مەعنەوی لەو پاداشت و سزایەی کە شایەنیەتی[1].بەڵام ئەگەر چاوپۆشی هەبوو لەو لایەنەوە کە خاوەن و هەڵگریەتی پێی دەوترێت چاکە (إحسان) هەروەك قورئان بەڕاشکاوی پێش یاسا باسی کردووە لەم ئایەتەدا:﴿ إنّ الله يأمر بالعدل والإحسان ...﴾ [2] ئەو قسەیەی کەدەڵێت: دادگەری شتێکی ڕێژەییە هەڵەیەکی بڵاوە لەبەرئەوەی پێوەری دادگەری ناوبراو پێوەرێکی بابەتی یە بەپێی جیاوازی کەسەکان و کات و شوێن ناگۆڕێت .یەکسانی لەنێوان تاکەکانی هەموو کۆمەڵگەیەك کەملکەچە بۆ یاسایەکی ئەوتۆ بریتی یە لەبەدیهێنانی هاوسەنگی لەنێوان ماف و پابەندی و ئەرکەکانیدا لەو کارانەدا دەکەونە چوارچێوەی ویستی مرۆڤەوە ، ئەگەر مافەکان زیاتر بوون لە ئەرکەکان ئەوا سنور بەزاندنە لەلایەن خاوەنەکانیانەوە بەرامبەر مافەکانی گەل و کۆمەڵگە ،خۆئەگەر ئەرك و پابەندی یەکان زۆرتر بوون لەمافەکان بەپێی ویستی پابەندەکار ئەوە ستەمە لەلایەن کۆمەڵگەوە لەکەسە پابەندەکە دەکرێت . یاسا فەلسەفە دارەکان یان نێودەوڵەتین یان ناوخۆیی . فەلسەفەی شەریعەتی ئیسلام بریتی یە لەمیهرەبانی و سۆز کەقورئان بەڕوونی باسی کردووە : لەم ئایاتەدا ﴿ وما أرسلناك الى رحمة للعالمين ﴾ ڕەحمەتیش بریتی یە لەبەرژەوەندی ئەرێنی (سودی داواکراو و ویستراو ) بەرژەوەندی

---

[1] ) جیاوازی نی یە لەنێوان ( عدل ) (عدالة)دا ،عدل بنەمای دووەم لەبنەماکانی بیروباوەڕی موعتەزیلە و بیرە فەلسەفەکانیان پێناسەیان کردووە بەوەی : (دڵنیا کردنی مافی خەڵکە و وەرگرتنی ئەرکە لێیان ). تەماشای (شرح الاصول الحسنة) قاضي الضار عبدالجبار بن احمد ل ۱۳۲ بکە

[2] ) سورة النخل / ۹۰

نەرێنی (زیانی لادراو — نەویستراو) کەسەبارەت بە مرۆڤ پێی دەوترێت بەرژەوەندی یەکان و سەبارەت شەرعیی (لەدیدگای شەرعی یەوە ) ، بەمەبەستەکان ناوزەند دەکرێت بەم پێی ئەوەی لێکۆڵینەوەی فەلسەفەی یاسا بەسەر دوو جێباس دا دابەش دەبێت و یەکەم تایبەتە بەفەلسەفەی یاسای نێودەوڵەتی یەوە ، دووەم : تایبەتە بەفەلسەفەی یاسای نێوخۆیەوە.

## جێباسی یەکەم :
## فەلسەفەی یاسای نێودەوڵەتی

فەلسەفەی یاسای نێودەوڵەتی بەگەلێك قۆناغی پەرەسەندن دا تێپەڕیووە چونکە لەسەرەتاوە فەلسەفەی یاسای نێودەوڵەتی بریتی بوو لە ئامانج و بەرژەوەندی یە کەسی یەکانی ئەو وڵاتانەی کەمل کەچی ئەم یاسایە بوون پاشان دوای قۆناغێك لەپەرەسەندن و بەرژەوەندی و ، ئامانجەگشتی یەکان لەڕووی تیۆری یەوە سەیر دەکران بەڵام لەڕووی جێبەجێ کردنەوە بویە خاوەن بەرژەوەندی تایبەت لەبەر نەبوونی پێوەرە نێودەوڵەتی یە پابەندکەرەکان و دیار نەمانی (نەبوونی ) دەستەڵاتێك کەلێپرسینەوەی لایەنی بەرپرس بگرێتە ئەستۆ لەپێشێل کردنی ئەم یاسایەدا ، پاش ئەوەی ئەم یاسایە بەقۆناغێکی تری پەرەسەندن دا تێپەڕی یاسای نێودەوڵەتی ئامانجەکەی بویە بەرژەوەند خوازی ئەو دەوڵەتانەی کەبەتیۆری و پراکتیکی ملکەچیی ، ئەوە نەبێ هەندێ کۆسپی لەگەڵ دایە کە رێگیرە لەبەردەم بەدیهێنانی ئەم فەلسەفەیەدا سەبارەت هەموو وڵاتان و میللەتانەوە لەبەر دەستەڵات شکانی هەندێك (زاڵ بوونی هەندێك ) لەدەوڵەتە گەورەکان بەسەر ئەم یاسایەدا و هاتنە ناوەوەیان لەکاتی چەسپاندن دا بەو شێوەیەی کەدادگەری و یەکسانی لەنێوان هەموو گەلان و نەتەوەکاندا بەدی دێنێت وڵاتان تا سەدەی حەڤدەیەم یاسایەکی نێودەوڵەتیان نەدەزانی کەپەیوەندی یە نێودەوڵەتیەکان رێك بخات ، ماف و پابەندی یەکانی وڵاتان دیاری بکات لەبارودۆخێکی ئاشتی و جەنگ دا پاشان بیرۆکەی یاسای نێودەوڵەتی سەری هەڵدا بەم پەرەسەندنەو پێشکەوتنانەی خوارەوەدا:

أ‌- فەلسەفەی پەیماننامەی و یستفالیا ١٦٤٨ ز لەنێوان وڵاتە ئەورووپیەکاندا.
کەبەخاڵی سەرەتایی یاسای نێودەوڵەتی کلاسیکی دەژمێردرێت [1] . بێگومان جەنگی بەرواڵەتێك داناوە بۆ شکۆ و دەستەڵاتی ڕەهای ئەو وڵاتانەی کەوارژۆیان لەسەر کردووە، بۆ نمونە تۆماس هوبس (١٥٨٨ – ١٦٧٩) فەیلەسوفی ئینگلیزی بانگەوازی کردووە : ئەو یەکێکە لە بیریارانی ئەم پەیمانە کەبڕوای بەجەنگی گشتگیر هەیە واتە جەنگی هەموو خەڵك بەرامبەر هەموو خەڵك لەناوبردنی بیرۆکەی ڕاستی و ناڕاستی بیرۆکەی دادگەری و ستەم هێز لەبەرچاوگرتن و شارینەوەی کەم و کوڕی دوپایەی بناغەیین بۆ چاکە لەکاتی جەنگ دا [2] . لێرەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ئەم قۆناغە یاسای نێودەوڵەتیە بەمانا ڕاستەقینەکەی لەفەلسەفە دووربووە دوری ئاسمان لەزەوی.
ب‌- فەلسەفەی کۆمەڵەی نەتەوەکان : ئەنجامی ئەو بڕیارەی کەپەیماننامەی (ویستفالیا) دای لەئازادی ڕەها بۆ وڵاتان لەچوونە ناوجەنگەوە ئەگەر ئەم جەنگە بەرژەوەندی تێدابوو بۆ وڵاتەکان ، جەنگی جیهانی یەکەم بەرپابوو جیهانی داخ بەئاگرەکەی لەماوەی چوار ساڵ دا ( ١٩١٤ – ١٩١٨)بەو ئاگرەی سوتاو زیان و ماڵوێرانیەکانی ئەم شەڕە پاڵی بە وڵاتانەوە نا تا بیر لە پێویستی پێکهێنانی

---

[1] ) تەماشای ماددەکانی (١٢ – ١٣ – ١٥ ) عصبة الأمم بکە
ئەوکارکەرانەی کاریان کردە سەر یاسای نیودەولەتی لەپەیماننامەی ویستفتالیا (١٦٤٨ – ١٨١٥) کە ئەو یاسا رامیاریانەیان لەوناو برد کەلەسەردەمەکانی ناوەراستدا هەژمونیان لەسەر ئەورووپادا هەبو ولەجێی ئەوان کۆمەڵێك یاسای تری دانا کە ڕێخۆشکەر بوو بۆ سەرهەڵدانی یاسای نێودەوڵەتی نوێ
١- هەستانەوەی ئەورووپایی و سەرهەڵدانی چەن دەولەتیکی سەربەخۆ.
٢- دۆزینەوەی ئەمریکا.
٣- لەدلیك بوونی هەستی نەتەوەیی.
٤- چاکسازی ئاینی.
٥- پەیماننامەی ویستفالیا.
٦- پرەنسیبی شکۆی ڕەها.
٧- پرەنسیبی بەرژەوەندی دەوڵەت.
٨- پرەنسیبی هاوسەنگی ئەورووپایی.
[2] ) تەماشای پەرتوکی (عصبة الأمم) بکە مامۆستا أحمد توفیق (ب ا ل ٦٤٣ )

دەستەڵاتێکی نێودەوڵەتی بکاتەوە تا سەرپەرشتی کێشەکان بکات و چارەیان بۆ بدۆزێتەوە بەرێگەیەکی ئاشتیانە و سنور بۆجەنگە رەواکان دابنێن ، تاکۆمەڵەی نەتەوەکان پێك هێنرا لەساڵی (١٩٢٠ ز) دا بەڵام ئەمیش نەیتوانی ئامانجەکانی و فەلسەفەکانی بەدی بهێنێت لەبەر دوو هۆکار:

یەکەم:ئەم پەیمانە جەنگی یاساغ نەکردبوو تەنها لەیەك بارودۆخدا نەبێت ئەویش برینەوەی جەنگ بوو بەبڕیاری دادوەری (التحكيم) یان راپۆرتێکی پابەند کار لەئەنجومەنی نەتەوە وەلەگەڵ رازی بوونی یەکێك لەلایەنە بەجەنگ هاتووەکان و چونەناوەوەی لایەنەکانی تر بۆ ناوجەنگ سەرەرای ئەوە [1] .

دووەم:بێگومان ئەو دەوڵەتە گەورانەی کەکۆمەڵ نەتەوەکانیان دروست کرد (عصبة الأمم) لەئامانج و فەلسەفەو سیاسەتەکانیاندا هاودژبوون و هەبوو ئەمەش لە پەیماننامەی نەتەوەکاندا رەنگی دایەوە کەلەخۆیدا بروانامەیەکی یەکگرتوو وکۆدەنگ لەسەر کراو نەبوو بەڵکوتێکەڵ بوو لەو مادە لاستیکیانەی کەراڤەیەك زیاتر هەڵدەگرن [2].بەپێی ئەمە بڕیارەکانی کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبة الأمم) وەك کۆمەڵێك سپاردەی پابەند نەکەر ( غير الملزمة) وابوو بۆیە پاش جەنگی دووەمی جیهانی هەرەسی هێنا.

ج- فەلسەفەی پەیماننامەی بریان کیلوج:- (مسيبو)بریان وەزیری دەرەوەی فەرەنسا پێشنیارێکی خستەبەردەم هاوتاکەی( مستر کیلوج) وەزیری دەرەوەی ئەمریکا ساڵی (١٩٢٧ ز) بۆ بەستنی پەیمان و پێکهێنانی هاوپەیمانی یەك تاجەنگ لەنێوانیاندا روو نەدات و پەنا ببرێتە بەر هۆکارە ئاشتی یەکان بۆ نەهێشتنی کێشەکان. بێگومان وڵاتەیەکگرتووەکان ئەم بیرۆکەیەی قبوڵ کرد ، بەڵام پێشنیاری ئەوەی کرد کەدەرگا بکرێتەوە بۆ وڵاتانی تر تابێنە ناو ئەم هاوپەیمانیەوە.

---

١ ) بۆزانیاری زیاتر تەماشای نوسراوی(اسرى الحرب) بکە لـە دانراوی د.عبدالواحد یوسـف/ ل ٣٩ و پـاش ئەو.

٢ ) تەماشای پەرتووکی(عصبة الأمم) بکە مامۆستا أحمد توفيق (ب ا ل ٦٤٣ )

ئەم پەیمان نامەیە ساڵی (١٩٢٩ ز) جێبەجێ کرا کەپێش جەنگی دووەم و (٦٣) وڵات چونە ناویەوە ، کەچی سەرەڕای ئەمەش شکستی هێنا و سەرنەکەوت لەبەدیهێنانی فەلسەفەکەیدا لەبەر چەند فاکتەرو هۆکارێك کەبواری خستنە ڕوویانمان نی یە.

د-فەلسەفەی پەیماننامەی نەتەوە یەکگرتوەکان :- لەئەنجامی هەرەس هێنان و سەرنەکەوتنی یاسای نێو دەوڵەتی لەهەموو قۆناغە باسکراو ناوبراوەکانیدا لەدانانی سنورێك بۆ جەنگە نارەواکان و دابین کردنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتیدا جەنگی دووەمی جیهان بەرپابوو (هەڵگیرسا) ساڵی (١٩٣٩ ز - ١٩٤٥ ز) ئەم پەیماننامە جێگەی پەیمانی کۆمەڵەی نەتەوەکانی گرتەوە . ئیتر پێك هێنانی کۆمەڵێکی نوێ دەستی پێکرد تاجێگەی کۆمەڵەی نەتەوەکان بگرێتەوە تا لەکۆبونەوەکەی موسکو لە ٢٠ی تشرینی ساڵی ١٩٤٣ لەنێوان سەرۆك کۆماری وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکاو سەرۆکی یەکێتی سۆڤیەتی (پێشوو)وەوە دەستی پێکرد پاشان لەکۆبونەوەی واشنتۆن لەنێوان نوێنەرانی دەوڵەتەگەورەکاندا ( زلهێزەکاندا) لە ٢١ ئاب - ٢ ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٤ ز ، پاشان لەکۆنفرانسی سان فرانیسکۆ ساڵی ١٩٤٥ لە ٢٦ حوزەیران ساڵی ١٩٤٥ دا وڵاتان واژۆیان کرد لەسەر پەیماننامەی دەستەی نەتەوە یەکگرتووەکان پاش ئەنجامدانی چەند گۆڕانکاریەك لەهەندێك لەبەندەکانیدا لەبەرواری ٢٤ ی تشرین ی یەکەمی ساڵی ١٩٤٥ ز دا جێ بەجێکرا، تائێستە (١٩٧) وڵات هاتۆتە ئەم پەیماننامەیەوە [1].لەپێشەکی پەیمانامەکەدا ڕوونکردنەوەیەکی کورت هاتووە دەربارەی فەلسەفەکەی و دەقەکەی بەم شێوەیەیە: ئێمەی گەلانی نەتەوەیەکگرتوەکان سوێندمان لەسەر خۆمان خواردووە کەنەوەکانی داهاتوو ڕزگار بکەین لەماڵ وێرانیەکانی ئەو جەنگەی کە لەتەمەنی نەوەیەکدا دووجار مرۆڤایەتی دووچاری غەمباریەك کرد کە ناتوانرێت باس بکرێت ، ئێمە سەرلەنوێ جەخت کەینەوە لەسەر باوەڕبونمان بەمافەکانی پیاوان و ژنان و نەتەوەکان گەورە و بچوکیان و

---

[1] ) ئۆرگانە سەرەکیەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان بریتین لە :
١- کۆمەڵەی گشتی پێك دێت لەهەموو دەوڵەتە ئەندامەکان.
٢- ئەنجومەنی ئاسایش.

بەیەکسانی مافەکانیان لەبەرچاو بگرین و ئەو دۆخانە روون بکەینەوە کەدەگونجێت لەسایەیاندا دادگەری بەدی بهێندرێت و رێز لەپابەندی و ئەو ئەرکانە بگیرێت کەلە پەیماننامەکانەوە دروست دەبن هەروەها لەسەرچاوەکانی یاسای نێودەوڵەتی یەوە ..... هتد .

ئەم پەیماننامەیە بەندی یەکەمی تایبەت کردووە بەڕوونکردنەوەی ئامانجەکانی کۆمەڵەو پرەنسیپەکانیەوە لەماددەی یەکەمدا کەدەڵێت ئامانجەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان واتە (فەلسەفەکەی) ئەمانەی خوارەوەن:-

١-پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی بۆ بەدیهێنانی ئەم مەبەستە (فەلسەفە) کۆمەڵێك بەرنامە و نەخشەی هاوبەشی کاریگەردادەرێژێت بۆ رێگرتن لەو هۆکارانەی کەهەڕەشە لەئاشتی دەکات ، لەناوی دەبات ، هەروەها ئەو رێگایانەی کەزیان بەئاشتی دەگەیەنن و رێگەکانی ئاشتی دەگرێتەبەر بەپێی پرەنسیپ و بنەماکانی دادگەری و یاسای نێودەوڵەتی بۆنەهێشتنی کێشە نێودەوڵەتیەکان کەدەبنەهۆی زیان گەیاندن بە ئاشتی ، یان چارەسەرکردنیان.

٢- (العقل بالفعل) بریتیە لەسەرنجامی عەقلی هەیولالی لەدۆخیك لەدۆخەکانی عەقڵدا هەرکاتێك شتە نابەرجەستەکان لەعەقلی هەیولاندا گرسان و چاپ بون ئەوا ئەم بەشەی عیقل دەبێتە عەقڵێکی کردەکی وەك لاپەرەی سپی کەبەنامەی هێزەکی دەدرێتە قەڵەم و پاش لەسەر نوسین دەبێتە نامەی کردەکی مندالّ پیش فێربوون فێرخوازێکی هێزەکیە پاش فێربوون دەبێتە فێرخوازێکی کردەکی هەروەها وەسەبارەت بەم( ئەرکە) فەلسەفیە لەگروپی ئامادەکاریەکانی یاسای شارستانی بەندی ١٦/١-١٨ دا هاتووە :( لەبارەی ئەو سەرچاوانەی کە پرۆژەکە پشتی پێبەستووە هیچ بوارێك بۆ گومان نیە چەنکە پێویستە بۆ لەبێژندان و پاککردنەوەی شارستانی میسری پێویستە پشبەستی سەرچاوە ببەسترێت: یاسای بەراوردکاری،یاسای میسری، شەریعەتی ئیسلامی.یاساری بەراوردکاری نوینەری پیشکەوتنی نوێی زانستی یاساو یاسا دانان و لەدوتوێیدا پیشکەوتنە یاساییەکان بەدی دەکرێت کەوا پێویستە سەرچاوەی یەکەم بیت لەئەو سەچاوانەدا کەتەتەڵەو پاککردنەوە بەکاریان دێنیت ،دۆخی یاسادانانی بەراوردکاری بزوتنەوەی یاسادانانی جیهانی. گەشەپێدانی پەیوەندی یە دۆستانەکان لەنێوان نەتەوەکاندا لەسەر بنەمای رێزگرتنی ئەو

پرەنسـیپەی کـەبڕیاری مـافی یەکسـانی دەدات لـەنێوان گەلانـدا و بـاوەڕی بەوەهەیـە هەریەکـەیان مـاف دیـاری کردنـی چارەنوسـی خـۆی هەیـە و بـۆی هەیـە ئـەو نەخشـەڕێگا گونجاوانە بگرێتە بەر بۆ پتەوکردنی ئاشتی گشتی.

٣-بەدیهێنانی هاوکاری نێودەوڵەتی بۆ چارەسەرکردنی بابەت ودۆزەنێودەوڵەتیەکان کەخاوەن مۆرکێکی ئابوری و کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیری و مرۆڤایەتین.لەسەر بەهێزکردنی (تۆکمە کردنی) ڕێزگرتن لەمافەکانی مرۆڤ و هەموو ئازادییە بنەڕەتیەکانی مرۆڤ و هاندان لەسەر ئەوە بەشێوەیەکی ڕەها بێ جیاوازی کردن بەهۆی ڕەگەز یان زمان یان ئاینەوە و بەبێ جیاواز تەماشاکردنی ژن و پیاو .

٤-ئەم کۆمەڵە بکرێتە سەرچاوەیەك بۆ ڕێکخستنی کارەکانی نەتەوەکان و ئاراستەکردنیان بەرەو گەشتن بەم ئامانجە هاوبەشانە. سەرباری ئەوەی باسمان کرد پەیماننامەکە تەنها لەباروذۆخی بەرگری ڕەوادا جەنگ بە ڕەوا دەزانێت و لەدەقی ماددەی (٥١)هاتووە (لەم پەیماننامە ، شتێك نییە کەمافی سروشتی و وڵاتان لاواز بکات یان کەم بکات بە تاك تاك یان بە کۆمەڵ لەبەرگری کردن لەخۆیان ئەگەرهێزێکی چەکدار دەست درێژی کردە سەریەکێك لەئەندامانی نەتەوەکان ، ئەوکاتە ئەنجومەنی ئاسایش ڕێگە و نەخشەو پلانی پێویست بگرێتەبەر بۆ پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی ، ئەو ڕێگە چارانەی ئەندامانی کۆمەڵەکە گرتویانەتە بەر وەك بەکارهێنانی ماف بەرگری کردن لەخۆ بەپەلە بە ئەنجومەنی ئاسایش ڕادەگەیەنرێت و ئەم ڕێگەچارانە بەهیچ جۆرێك کارناکەنە ماف ئەنجومەن — بەپێی ئەو دەستەلات و بەرپرسیاریەی لەبڕیارەکانی ئەم پەیماننامەیەدا پێیدراوە— لەوەی کەسەرپشك کراوە لەهەرکاتێك دا هەرکارێك بەپێویست بزانێت ئەنجامی بدات بۆ پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی و گێڕانەوەی بۆ ئاست و پێگەی خۆی.

نکوڵی لێناکرێت کەپەیماننامەی نەتەوەیەکگرتووەکان بەهەنگاوێکی گرنگی پێشکەوتوو دەژمێردرێت لەڕێکخستنی ژیانی خێزانی نێودەوڵەتی ، جگەلەوە کەبوونی ماف (ڤیتو) واتە ماف هەڵوەشاندنەوە لەسەر بڕیارە بابەتیەکان. لەلایەن دەوڵەتە گەورەکانەوە ، ئەوانەی بەتایبەتی کەئەندامی هەمیشەیی، وای کردووە ڕۆڵێکی لاوازی هەبێت لەپاراستنی ماف گەلاندا و دانانی سنورێك بۆ دەست درێژیکاری و سنوربەزاندنە نادروستەکان و ڕێزگرتن لەجەنگە ناڕەواکان و دابینکردنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی.

## فەلسەفەی جارنامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤ

(جاڕنامەی) مافەکانی مرۆڤ لەساڵی ١٩٤٨ وە کەوتە بواری جێبەجێ کردنەوە ، فەلسەفەی ئەم جاڕنامەیە بریتی یە لە بڕیاردانی مافەکانی مرۆڤ و پاراستنیان ، چونکە لەماددەی یەکەمدا دەڵێت ( هەموو خەڵك بەئازادی لەدایك دەبن و یەکسانن لەڕێزو مافەکاندا ، ئەوان عەقڵ و زەمینیان پێ بەخشراوە ، پێویستە هەندێکیان لەگەڵ هەندێکی تریان بەگیانی برایەتی یەوە مامەڵە بکەن).

دەرئەنجام :-

لەوەی کەباسمانکرد لەبارەی یاسای نێودەوڵەتی یەوە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کەدەگونجێت فەلسەفەکەی ئەم یاسایە لەم خاڵانەدا کورت ببێتەوە :-

١-دابینکردنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی.

٢- جیاکردنەوەی جەنگەڕەواکان لەجەنگە ناڕەواکان.

٣-بەس (تەنها) ئەو جەنگانە ڕەوان بەس لەکاتی بەرگری ڕەوادا دەکرێن ، بەشتنەوەی ئەم بەرگری یە بەکۆمەڵێك مەرج و بەندی دیاری کراوەوە.

٤-ڕەچاوکردنی دادگەری و یەکسانی لەمامەڵە لەگەڵ کەسانی تردا لەهەردوو بارودۆخی جەنگ و ئاشتی دا.

٥- پاراستنی ڕێزی مرۆڤ و مافەکانی لەپێش هەموویانەوە یەکسانی لەنێوان گەلاندا و بڵاوکردنەوەی گیانی برایەتی ( روح الاخاء) وجیانەکردنەوەی مرۆڤەکان لەسەربنەمای جیاوازی ڕەگەز یان ڕەنگ یان ئاین یان وێنەی ئەمانە.

# جێباسی دووەم :
# فەلسەفەی یاسا لەسەر ئاستی نێوخۆیی

هەروەك لەمەوپێش وتمان هەندێ لەیاساكان لەسەرەتاكەیدا یان لەباسی هۆكاری پێویستبونیدا یان لەماددەكانی سەرەتاییدا ئاماژە دەكات بۆ فەلسەفەی ئەو یاسایەی بابەتێك چارەسەردەكات كەپەیوەندی بەرێكخستنی ژیانی تاك یان كۆمەڵگەوە هەیە ،ئەمانەی خوارەوە كۆمەڵێك لەیاسا عێراقی یە نویێ یەكانە كەبەكورتی ئاماژەدەكات بۆ فەلسەفە تایبەتەكانی لەوانە:—

## ١-فەلسەفەی یاسای داواكاری گشتی

ماددەی یەكەمی ئەم یاسایە بەڕوونی باسی ئامانج و فەلسەفەكەیی[1] كردووە وەك ئەمەی كەدێت : ئامانجی ئەم یاسایە رێكخستنی دەزگای داواكاری گشتی یە بۆ بەدیهێنانی ئەمانەی خوارەوە :—

یەكەم: پاراستنی یاسای دەوڵەت و ئاسایش و دامەزراوەكانی و سووربوون لەسەر دیموكراتیەتی گەل و پاراستنی سامانی دەوڵەت.

دووەم : پارمەتیدانی سیستەمی سۆسیالیستی (الاشتراكية)و پاراستنی بنەماو چەمكەكانی لەچوارچێوەی چاودێری كردنی ڕەوایەتی [2]. و ڕێزگرتن لەچەسپاندن و جێبەجێ كردنی یاسا.

سێ یەم: بەشداربوون لەگەڵ دەزگای دادوەری و لایەنەپەیوەندیدارەكان بۆ دۆزینەوەی خێرای كردەوە تاوانكاریەكان ، ئیش كردن (كاركردن) بۆخێرا یەكلایی كردنەوەی بابەتەكان و خۆبەدووركرتن لەدواخستنی دادگایی كردنی بێ بەهانە.

---

[1] ) ژمارە ١٥٩ بۆ ساڵی ١٩٧٩ گۆردراو (المعدل) .

٢) المشروعية : ئەو كارانەی پڕاوپڕن لەگەڵ یاسادلو پابەندن پیێ یەوە

چوارەم: چاودێری کردنی جێبەجێ کردنی بڕیارو سزاکان بەپێی یاسا.

پێنجەم: بەشداریکردن (هاوکاریکردن) لەڕاستکردنەوە و خەملاندنی لەیاسا دانانە جێبەجێ کراوەکاندا بۆ زانینی ئەندازەی گونجاو لەگەڵ واقیعی پێشکەوتوو دا.

شەشەم : بەشداریکردن لەڕوانگەی دیاردەی تاوانکاری و دەمەقاڵێ و بەربەرەکانێدا و پێشکەشکردنی پێشنیارە زانستی یەکان بۆ چارەسەرکردنیان .

حەوتەم : بەشداریکردن لەپاراستنی خێزان و منداڵی .

## ٢-فەلسەفەی یاسای ڕێکخستنی دادگەری [١]

بێگومان ئەم یاسایە هەمدیس ئاماژەی کردووە بۆفەلسەفە تایبەتیەکەی بەشێوەیەك لەماددەی یەکەمیدا ئامانجەکانی یاسای ڕێکخستی دادگەری خستۆتەڕوو:

یەکەم:ڕێکخستنی دادگا بەشێوەیەك کە دادگەری بەدی بێنێت بەگیانێکەوە کەوەڵامدەرەوەی سروشتی بوونی گۆڕانکاری یە کۆمەڵایەتی و ئابوریەکان بێت لەقۆناغی بنیات نانی سۆشیالیستی لەعێراقدا.

دووەم: ئامادەکردنی دادوەریەك کەدەسەڵاتی هەبێت بەسەر هەموو بوارێکی ڕێکارە یاسایی و بڕیارەکان دا ، چەسپاندنی یاساکان بەبیرێك کەلەگەڵ ئامانجە سۆشیالیستی یەکاندا بگونجێت.

## ٣-فەلسەفەی یاسای پێنەگەیشتوو ناکامەکان [٢]

بێگومان ئەم یاسایە ئاماژەی بەفەلسەفەی خۆی کردووە بەڕوونی لەماددەی یەکەمدا کەدەڵێت: ئامانجی ئەم یاسایە چاودێری کردنی پێنەگەیشتووەکان و ئەو کەسانەیە وەك ئەوان وەهان و گرنگیدانە بە کاروبارە کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و دارایی یان تا بەشدارین لە بنیات نانی کۆمەڵگەیەکی پێش کەوتووی گەشەسەندودا.

---

١) ژمارە ١٦٠ بۆ ساڵی ١٩٧٩ دەسکاری کراو

٢) ژمارە ٧٨ بۆ ساڵی ١٩٨٠ دەسکاری کراو

## ٤-فەلسەفەی یاسای چاودێری کردنی نەوجەوانان

ئەم یاسایە بەندێکی تایبەت کردووە بۆ باسکردنی ئامانج و فەلسەفە و بنەماکانی لەماددەی یەکەمیدا دەڵێت : ئامانجی ئەم یاسایە سنوردانانە بۆ دیاردەی لادانی (جنوح) نەوجەوانان لەبواری پاراستنی نەوجەوان لەلادان و چارەسەرکردنی و گونجاندنی لەڕووی کۆمەڵایەتی یەوە بەپێی بەهاو ڕێسا ئاکاریەکان هەروەها ماددەی (٢) و دەڵێت یاساکە بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی پشت بەم بنەمایانە دەبەستێت :-

یەکەم: ئاشکراکردن و دۆزینەوەی پێش وەخت و رووی ئەو نەوجەوانەی کەمەترسی لادانی لێدەکرێت بەمەبەستی چارەسەرکردنی پێش ئەوەی کەتوشی لادان بێت.

دووەم : بەرپرسیاریەتی سەرپەشتیکاری منداڵ بەرامبەر منداڵە بچوکەکەی یان نەوجەوانەکەی لەکۆمەڵگادا.

سێ یەم: دارنینی (داماڵینی ) دەستەڵاتی باوکایەتی [1] کاتێك کەبەرژەوەندی بچوك یان نەوجەوان یان کۆمەڵگا بخوازێت.

چوارەم : چارەسەرکردنی نەوجەوانی لادەر(تاوانکار) بەپێی بنەما زانستی یەکان ولەدیدگایەکی مرۆڤانەوە.

پێنجەم : چاودێری یەکی پاشەنگ ( اللاحقة) بۆ نەوجەوان وەك ڕێگەیەك بۆ تێکەڵ بوونی لەکۆمەڵگادا و پاراستنی لەگەڕانەوە بۆ تاوان .

شەشەم : بەشداریکردنی ڕێکخراوە جەماوەریەکان لەگەڵ لایەنە پەیوەندی دارەکان بۆ دانان و جێبەجێ کردنی پلانی گشتی بۆ چاودێری کردنی نەوجەوانان .

## ٥-فەلسەفەی یاسای سەرپەرشتی دادی [2]

لەم یاسایەدا بەشێك تایبەت کراوە بەڕوونکردنەوەی فەلسەفە و ئامانجەکانی و هەروەها بنەماکانیشی ، ماددەی یەکەم لەم یاسایە باسی ئامانجەکانی یاسای سەرپەرشتی دادی دەکات کەلە ئەمانەی خوارەوەدا خۆی دەنوێنێت :

---

[1] ) لەسەرپەرشتیاریەتی لایدەبان

٢ ) ژمارە ١٢٤ بۆ ساڵی ١٩٧٩ ز.

یەکەم : گەرەنتی هەڵسانی دادگاو دەزگاکانی داد بەئەرکەکانی سەرشانیان لەچەسپاندن و جێبەجێ کردنی یاساکاندا و ڕێزگرتن لەناوەڕکەکانیان لەپێناو بەدیهێنانی دادگەریدا بەگیانێك کەبەدیهێنانی ئامانجەکانی یاسای نوێ بگرێتەوە.

دووەم : وەستان لەگەڵ بەردەوامبونی داوەرەکان و فەرمانبەرانی دەزگاکانی داد دا لەیەکلای کردنەوەی ئەو کارانەیدا دەخرێنەبەردەمیان لەڕووی جوان ڕاپەڕاندن و خێرا ئەنجامدانەوە .

سێ یەم: ناسینی ئەو کۆسپ و لەمپەڕانەی دێنەڕێی کاروانی دادگەری و ئەهەلآنەی فەرمانبەرانی دەزگاکانی دادی تێدەکەون و پێشنیارکردنی چارە زامن و دەستەبەرەکان لەپێناوی چارەسەرکردنیان.

چوارەم : بەدواداچوونی جێبەجێ کردنی نەخشەوپلانەکانی وەزارەتی داد بۆ پێشخستنی دەزگاکانی و پێدانی هەل تابتوانن ڕێگرەکانی بەردەوام کارەکانیان بدۆزنەوە و کێشەکانی بەردەمیان چارەسەر بکەن.

پێنجەم : دەست نیشانکردنی کەسانی پرۆفیشناڵ و کارامەی شارەزا وەك ڕێخۆشکردن بۆ دانانیان لەو جێگانەدا کەگونجاوە لەگەڵیاندا.

## ٦-فەلسەفەی یاسای موڵکایەتی [1]

بەندی یەکەمی ئەم یاسایە تایبەت کراوە (تەرخان کراوە) بۆ ڕوونکردنەوەی فەلسەفەی یاساکە بەشێوەیەکی کورت ، ماددەی یەکەم لەم یاسایە ئامانجەکانی بەم شێوەیەی خوارەوە دەخاتە ڕوو:

یەکەم : ڕێکخستنی خاوەندارێتی خانوبەرەو ئەو مافانە کە پەیوەندی یان پێوەی هەیە لەلایەن دەزگاکانی دەوڵەتەوە و هەردوو کەرتی سۆشیالیستی و تێکەڵ، بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی جێبەجێ کردنی پلان و پرۆژەکانی.

---

١) ژمارە ١٢ بۆ ساڵی ١٩٨١.

دووەم: دانانی چەند ڕێسا و بنەمایەکی یەکگرتوو بۆ جێگرتنەوەو بژاردنی دادگەرانە لەخانوویەرە بەجۆرێك گەرەنتی ماف خاوەنەکانیان بکات بێ زیان گەیاندن بەبەرژەوەندی گشتی .

سێ یەم : ئاسانکردنی ڕێکارەکانی بونەموڵکی دەوڵەت بەجۆرێك کە خێرا جێبەجێ کردنی دابین بکات.

## ٧- فەلسەفەی یاسای سەلماندن [1] (الاثبات)

لەم یاسایەدا بەندی یەکەم تەرخانکراوە بۆ باسی ئامانجەکانی (فەلسەفەکانی ) بەم شێوەیەی خوارەوە:

١) فراوانکردنی دەسەڵاتی دادوەر لەئاراستەکردنی داوادا و ئەوەی پەیوەندی پێوەی هەیە لەبەڵگەکان بەجۆرێك کەگەرەنتی و دەستەبەری چەسپاندنی ساغی بڕیارەکانی یاسا بکات ، لەپێناو گەیشتن بەبڕیارێکی دادگەرانە لەوبابەتەدا.

٢) پابەندکردنی دادوەر بەشوێنکەوتنی[2](پەیڕەوی کردنی) ئەوهۆکارو پاڵنەرانەی قەناعەتیان پێگەیاندووە بۆ تەواو کردنی قەناعەتەکەی (م[2]).

٣) پابەند کردنی دادوەر بەپەیڕەویکردنی ڕاڤەی پێشکەوتوو بۆ یاساکەو ڕەچاوکردنی کاریەجێ یی( فەلسەفە) ی دانانی یاساکە لەکاتی جێبەجێ کردنیدا (م[3]).

٤) ئاسانکردنی ڕیکارەکان (الإجراءات)[3] تا ئەو سنورەی گەرەنتی بەرژەوەندی گشتی بکات و نەبێت بەهۆی [4] بەزایەدانی ئەسڵەکەی.

٥) دادوەری گوڕەپانی دادگەری و چەسپاندن و بەدیهێنانیەتی بەشێوەیەك پارێزراو بێت لەبێزێزی و بێ هودە تەماشاکردنی. دوولایەنی بەشەڕهاتوو یان نوێنەرەکانیان پابەند بکات

---

١ ) ژمارە ١٠٧ بۆ ساڵی ١٩٧٩ دەستکاری کراو.

٢ ) پێشینە کۆکراوەکانی ناو بیرەوەری و ئەو زانیاریە زۆرانەی لای هەن کە پەیوەندیان تێروانراوەکەوە.

٣ ) لەبەر ئەوەی دادوەر بڕیاری خۆی لەسەر رازی بوون دەدات.

٤ ) افراط :پەرگیری بەباری سنوربەزاندندا و

تخریط: دەرچونە لەسنور لە پێنەدانی مافی ئەو شتەدا

بەبڕیارەکانی یاساوە و لەسەر پرەنسیپی نیەت (نیاز)باشی لەپێش کەش کردنی بەڵگەکانی ئەگینا بەپێچەوانەوە سەرپێچیکار خۆی دوچاری سزادەکات (م٥).

## ٨-فەلسەفەی یاسای چاودێری کۆمەڵایەتی [١].

ئەم یاسایە بەشی یەکەمی خۆی تەرخان کردووە بەباسی فەلسەفەکەیەوە لەژێر ناونیشانی (ئامانجەگشتی یەکان) و ئەم ئامانجانەی بەشێوەیەکی کورت خستۆتە ڕوو لەم خالانەی خوارەوەدا:

١) هاوکاری کۆمەڵایەتی تاکە بنەمای کۆمەڵگایە و ماناکەی ئەوەیە هەموو هاوڵاتی یەك ئەرکی سەرشانی بەتەواوی جێبەجێ بکات بەرامبەر بەکۆمەڵگا و کۆمەڵگاش دەستەبەری هەموو مافەکانی هاوڵاتی بکات.

٢) دەوڵەت تێدەکۆشێت چاودێری کۆمەڵایەتی دەستەبەرو دابین بکات بۆ هەموو هاوڵاتیان لەماوەی ژیاندا و بۆ خێزانەکانیان پاش کۆچی دوای کردنیان (م٢).

٣)کار مافێکە پێویستە لەسەر دەوڵەت دابینی بکات بۆ هەموو هاوڵاتیەك ، پێویستە لەسەر هەموو کەسێك توانای هەبێت کار (ئیش ) بکات لەبەرئەوەی زەروری یە هەموو کەس بەشداری بنیات نان و پاراستن و پێش خستنی کۆمەڵگا بکات ، دەوڵەت ئامانجی دابین کردنی دەستەبەرکردنی کۆمەڵایەتی یە بۆ سەرجەم هاوڵاتیان لەهەردوو باروبۆخی بێ توانایی و پیریدا (م٣).

٤)یارمەتی دانی بێدەرامەت و کەم دەرامەتەکان ئەرکێکی قۆناغی و کاتی یە و کەم دەبێتەوە هەرکاتێك وڵات پێش بکەوێت لەڕێگەی بنیاتنانی سوشیالیستیدا ، لاواز دەبێت کاتێك کۆمەڵگا پێش دەکەوێت و کاربۆهەموو بەتوانایان دابین دەکرێت و دەستەبەری کۆمەڵایەتی بۆ هەموو تاکێك لەتاکەکانی گەل بەدی دێت (م٤).

٥)ئامانجی سەرەکی بۆ دەستەبەرکردنی خێزان پاراستنی ڕێز و شکۆی مرۆڤ و نەهێشتنی شوێنەوار و کاریگەریە نەرێکانە لەسەر خێزان و ئەندامانی لەئێستاو داهاتوودا

---

١ ) ژمارە ١٢٦ بۆ ساڵی ١٩٨٠ .

وای لێدەکات کەبتوانێت بەشداربێت لەبنیات نانی کۆمەڵگەی تازەدا بەهۆشیاری و دڵسۆزی یەوە (م٥).

٦)منداڵ ئایندەی نەتەوەیە لەبەر ئەوە دەوڵەت ڕەچاوی منداڵێتی دەکات بەڕێگەی جۆراو جۆر لەوانە دروست کردنی خانەکانی دەوڵەت (م٦).

٧)دەوڵەت هەوڵی کەمکردنەوەی دیاردەی کەم ئەندامی دەدات لەکۆمەڵگادا و چاودێری ڕەچاوی کەمئەندامان دەکات لەلایەنی جەستەیی و عەقڵی یەوە لەڕێگەی پێگەیاندنیان و کار پێدانیان ( بۆدۆزینەوە یان خستنە سەرکاریان) وەك ڕێخۆشکردنێك بۆ تێهەڵکێش کردنیان لەناوکۆمەڵگادا، گرنگی دان بەو کەسانەی کەتوانای ئیش کردنیان نی یە بەتەواوی – لەهەموو بوارە ماددی و تەندروستی و کۆمەلآیەتی و دەرونیەکاندا (م٧).

٨) چاودێری کۆمەلآیەتی ئامانجی بۆ کەمئەندامان لەڕووی جەستەیی و عەقڵیەوە (ئاوەزی) بەدیهێنانی ئەرکی کۆمەڵگە و دەوڵەتە بەرامبەر هاولآتیانێك توانای کاریان هەیە و بەناتەواوی یان کەهیچ توانایەکیان نیە لەڕێگەی خێزاندارکردن و پێش کەشکردنی ڕاژە کۆمەلآیەتی و پزیشکی و دەرونی و فێرکاری و پیشەی و ڕۆشنبیرییەوە تابتوانن زاڵ بن بەسەر ئەو (شوێنەوارانەدا) کەلە بێتوانیایانەوە دروست بووە (م٨).

## ٩- فەلسەفەی یاسای کار [١]

ئەم یاسایە لەماددەی یەکەمیدا دەڵێت: ( ئەم یاسایە ئامانجی دابین کردنی کارو زۆرکردنیەتی لەپێناو خزمەتکردنی پرۆسەی بنیات نانی ئابووی لەپێناو خۆش گوزەرانی و باشکردنی بارودۆخی ژیان. ئەم یاسایە دەستەبەرو گەرەنتی ماف کار کردن دەکات بۆ هەموو هاولآتیەك کەلەتوانایدا هەبێت بەچەند هەلومەرجێکی هاوسەنگ لەنێوان هەموو هاولآتیاندا بێ جیاوازی کردن بەهۆی ئاین یان ڕەگەز یان زمانەوە، ئەمەش دەبێتەهۆی ڕەخساندنی هەل بۆ هەموو هاولآتیەك لەڕاهێنان لەسەر چالاکی پیشەیی لەو سنورانەدا کەدەوڵەت دیار ی دەکات بۆ قەبارە و جۆری کار لەهەموو کەرتێکی پیشەیدا. هەروەك لەم یاسایە لەماددەی پێنجەمیدا دەڵێت (پەیوەندی یەکانی کار بەندە لەسەر بناغەی هاوکاری

[١]) ژمارە ٧١ بۆ ساڵی ١٩٨٧ گۆڕدراو.

کۆمەڵایەتی لەنێوان لایەنەکانیدا بەهەموو ماناکانیەوە لەیارمەتی یەکتردان و بەشداربوون لەبەرپرسیارێتیدا). ئەم ئەندازەیە بەس دەزانین لەڕوونکردنەوە و باسکردنی هەندێ لەیاسا ناوخۆی یە نوێ یەکانی عێراق.

- دەرئەنجام:-

لەو دەقەیاساییانەوە کەناومان بردن دەگەینە ئەم دەرئەنجامە کەفەلسەفەی هەموو یاسایەك لەڕووی دانان و گۆڕانکاری و هەڵوەشاندنەوەوە بریتی یە لەبەدیهێنانی بەرژەوەندی یەکانی تاکەکانی ئەو کۆمەڵگەیەی کەمل کەچە بۆ ئەو یاسایە لەگەڵ چاودێری کردنی ئەو بەرژەوەندیانەو پاراستنیان. بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێت لەسەر ئەم یاسا عێراقی یە نوێیانە ئەوەیە کەلەڕووی فەلسەفەیی و ئامانجەکانیانەوە لەجوانترینی یاسای نوێ یە پێشکەوتوەکانە کە ئامانجیان بەدیهێنانی بەرژەوەندی یەکانی کۆمەڵگایەکن کەمل کەچی ئەم یاسایانەن لەچاو یاساکانی جیهانی سێ یەم ، چونکە ئەم یاسا عێراقیانە ماف هەموو خاوەن مافێك دەستەبەر دەکات و هاوسەنگی دابین دەکات لەنێوان مافەکان و پابەند بوونەکانی هەموو تاکیك لەتاکەکانی کۆمەڵگەی عێراقی ، بەڵام زۆرێك لەوانەی کەلەژێر سایەی ئەم یاسایەدا ژیاون و واهەستیان دەکرد کەجیاوازیەکی فراوان هەیە لەنێوان ئەوەی یاسا دەیڵێت لەگەڵ ئەوەی دەسەڵاتی جێبەجێ کار دەیچەسپێنێت لەزیاتر لەبوارێك لەبوارەکانی ژیاندا ئەمە تەنها کاری یاسا دانەرەکانی عێراق نی یە بەڵکو سروشت هەموو یاسایەك لە یاساکانی جیهان زۆربەی جار هەروایە .

## فەلسەفەی یاسا دانانە سزاییەکان

ئەوەی وتمان لەفەلسەفەی یاسا سەبارەت یاسا دانراوە ناسزاییەکان بوو لەبەرئەوە واباشە بەکورتی کۆمەڵێك نمونە لەفەلسەفەی یاسا دانراوە سزاییەکان بەکورتی لەم خاڵانەدا بخەینەڕوو:

ئامانج و فەلسەفەی یاسا دانراوە سزاییەکان لە چەند ڕوویەکەوە تایبەتمەندی لەدوای تر هەیە وەکو:

أ-فەلسەفەکەی ناگۆڕێت بەهۆی جیاوازی یاساکانی سزادان لەهەموو وڵاتەکانی جیهاندا بەپێچەوانەی فەلسەفەی یاساناسزاییەکانەوە.

ب-فەلسەفەکەی پەیوەندی بە پاراستنی بەرژەوەندی یە گشتی یە هاوبەشەکانەوە هەیە لەنێوان تاکو و کۆمەڵگا و نەتەوەکاندا بەپێچەوانەی یاساکانی ترەوە کەتایبەتن بەتاکەکانی کۆمەڵگایەکی یەك دەوڵەتەوە.

ج-ئامانجەکانی دیاری کراوو بڕاوەیە (محصورة)لەبەرئەوەی سروشتی ئەم یاسا دانراوە ئەوە دەخوازێت.

بەپێی ئەو پرەنسیپە شەرعیەی کەدەڵێت( نەتاوان هەیە نەسزا بەبێ دەق ) لەسەر ئەم یاسایە فەلسەفە و ئامانجەکانی یاسادانراوە سزای یەکان بەشێوەیەکی گشتی لەسێ خاڵدا کورت دەبنەوە

**یەکەم: پاراستنی بەرژەوەندی یە گشتی یە هاوبەشەکان: ئەم بەرژەوەندییانەش هەندێکیان ماددین (بەرجەستەین) هەندێکیان مەعنەوین:**

١- لەبەرژەوەندی یە ماددیەکان پاراستنی سامانە کەلەسزادانی تاوانبارە دەست درێژکارەکاندا خۆی دەنوێنێت - کەدەست درێژی دەکەنە سەرماڵ و خەڵکی ، بەدەربڕینێکی تر لەتاوانەکانی سامانی سزادان لەسەر دزی و داگیرکردن و تاڵان و هەموو بەدەست هێنانێکی دارایی ناڕەوا (غیر مشروع).

٢- لەبەرژەوەندیە مەعنەویەکان پاراستنی ڕێز و شکۆی مرۆڤ و ناموس و شەرەفی کەلە سزادان لەسەر خستنە پاڵی نادروست (القذف)، جنێوپێدان و هەتکی ناموس وێنەی ئەوا لەوەی شکۆ و ڕێز و بیروباوەڕو لەکەدار دەکات ، بەم پێیە ، بەرژەوەندی ئاینی و سیاسی دەچنە چوارچێوەی بەرژەوەندی مەعنەویەوە

٣- لەو ماف و بەرژەوەندیانەی دەبێنە هۆی پاراستنی کەسی ، بەو مانایایەی کەیاسای سزای ئەم بەرژەوەندی و مافانە ناپارێزێت مەگەر خاوەنەکانیان وازیان لێبهێنن و مافەکەش وازلێهێنان هەڵبگرێت و ئەم جۆرە ماف و بەرژەوەندی یانە بەردەوام تایبەتە بەتاکەکانەوە

یان هاوبەشە لەنێوان تاك و كۆمەڵگەدا بەڵام مافی تایبەت تێیاندا زاڵە بەسەر مافی گشتی دا وەك لەتاوانی داگیركردنی ماڵ و دارایيەكاندا بەدی دەكرێت.

٤-ماف و بەرژەوەندیە گشتییەكان یان ئەوانەی مافی گشتی تێیاندا زاڵە ، ئەویش زۆربەی زۆرینەی ئەو ماف و بەرژەوەندیانە دەبنەجێگەی پاراستنێكی یاسایی بابەتی و تەماشای ڕازیبوونی خاوەنەكانیان ناكرێت ، بۆنمونە یاسا مافی ژیان دەپارێزێت باكوژراوەكەش ڕازی بێت بەدەركردنی گیانی بۆ ڕزگاربوون لەئازاروكێشەكانی نەخۆشیەك كەچاوەڕێی نەمانی ناكرێت.

**دووەم : دابین كردنی ئاسایش و دڵنیایی بۆ تاكەكانی كۆمەڵگا**

لەسەر هەموو دەوڵەتێك پێویستە ئەم جۆرە ئامانجەدابین بكات لەڕێگەی دانانی یاسای سزای دادگەرانەوە بەوردی و دروست بیچەسپێنێت و جێبەجێی بكات. لەم ئامانجەسەرەكی یەوە بۆمان دەردەكەوێت بەنیسبەتی ژیانی تاكەكانی هەموو كۆمەڵگەیەك كەیاسای سزادان لەناو هەموو لقەكانی یاسادا لەهەموو یان زیاتر پێویستی بە دارشتن هەیە و بەهەڵقوڵان لەم واقیعەوە ڕێسای (نەتاوان هەیە نەسزا بەبێ دەق) سەریهەڵداوە. ئەم ڕێسایە دەستورەكانی هەموو وڵاتانی جیهان باسیان كردووە لەسەردەمی نوێ و كۆمەڵێك پرەنسیپی سزایی گشتی لێ هەڵدەگوزرێت لەوانە:

أ-كردن و نەكردنی هیچ كارێك بەتاوان لەقەڵەم نادرێت مەگەر كاتێك بەپێی خواستی یاسا دەرچوو پێش یاسایەكی لەسەر پێچەوانەی ئەوەوە.

ب-بناغە لەشتە بەسودەكاندا ڕەوایی یە و شتەبەسودەكان لەبناغەدا ڕێپێدراون.

ج-تاوان ناخرێتە پاڵ بێتاوانە هەتا تاوانباركردنی دەسەلمێت بەبەڵگەی ڕاستی و وەرگیراو ( مقبول).

د-لەبناغەدا هەموو گەردنێك ئازادە لەهەموو بەرپرسیاریەتیەكی سزایی و مەدەنی چونكە مرۆڤ بێ تاوان لەدایك دەبێت ، كەوابوو پێویستە دادوەر ئەم حاڵەتە لەبەرچاو بگرێت لەهەموو تاوانباركردنێك دا كە دەدرێتە پاڵی ، پێویستە دادوەر هێشتا ئەو بەبێتاوان بزانێت.

هـ-سیفەتە پەیدابووەكان بەنەبوو دەدرێتە قەڵەم ، ئاشكرایە كە تاوان سیفەتێكی پەیدابووە پاش نەبوونی سەری هەڵداوە لەبەرئەوە كاتێك بەڵگەی داواكار (المدعی)لەگەڵ

بەلگەی داوالێکراو دا دژایەتی هەبوو ، دووەم پێش دەخرێت لەبەرئەوەی لەگەڵ ئەم بناغەدا دەگونجێت.

و– کردەوە تاوانکاریەکان سنوردار و دیاری کراون بەپێچەوانەی کارە زیان بەخشەکانەوە لەبابەتە مەدەنیەکاندا.

ز– گومان لەبەرژەوەندی تاوەنبارکراو ڕاڤەدەکرێت لەبەرئەوەی لەبناغەدا بەبێ تاوان دەزانرێت (دەدریتە قەڵەم).

ح– بواری پێوانەکردن نی یە لەبەتاوان دانانی کردارێك یان بڕیاردانی سزایەکدا. دروست نیە فراوان کردنی چوارچێوەی دەقی سزایی لەڕێگەی پێوانەکردنەوە لەبابەتە سزاییەکاندا لەبەرئەوەی بەکارهێنانی پێوانەکردن (القیاس) لەگەڵ پرەنسیپی شەرعیبوندا یەك ناکەون . ئەوەی شایەنی باسە کەشەریعەتی ئیسلامی سەدان ساڵ پێش کەوتووە بەسەر یاسای سزایی دا لەدان پێدانانی پرانسیپی شەرعی (نەتاوان نەسزا بێ دەق هەیە) لەچەندان ئایەتی قورئانی دا لەوانە : فەرمودەی خوا:(وما لنامعذبین حتی ینعث رسولاً)[1] واتە ( ئێمە سزای هیچ کەس و کۆمەڵێك نادەین هەتا نێردراوێك نەنێرین) ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێت کەنەزانین لەشەریعەتی ئیسلامدا وەك بەهانە و پۆزش وەردەگیرێت بەمەرجێك نەزانەکە کەمتەرخەم نەبێت ، بەبەڵگەی ئەم ئایەتە ((یتلو علیهم آیاتنا)) وتەکانمان دەخوێنیتەوە بەسەریاندا. فەرمودەی خودا :﴿ وأوحيَ اليّ هذا القرآن لأنذركم به ومَنْ بلغ﴾[2]. فەرمودەی خودا ﴿ وإنّ من أمّةٍ إلاّ خَلاَ فيها نذيرُ ﴾[3]. جگەلەم ئایەتانە چەندان ئایەتی تر هەیە کەبەڕاشکاوی باسی پرەنسیپی شەرعیەت دەکەن و ئەم بنەمایە لەیاسا دانانی سزای سۆڤیەت دا کەلە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٦ دا دەرچووە ، باسی لێوەنەکراوە لەماددەی شەشەمیدا بەڵام لەیاسای سزاکاندا کەلە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٠ دەرچووە لەماددەی (٢٧)دا وەرگیراوە.

---

[1]) سورة الاسراء / ١٥

[2]) سورة الانعام/ ١٩

[3]) سورة فاطر/ ٢٤

هەروەها یاسای ئینگلیزی لەڕابردوودا گرنگی بەیاسادانان نەداوە لەدوو بواری تاوانبارکردن و سزادان دا.

**سێیەم: بەدیهێنانی دادگەری لەڕێگەی دادگەرانە بوونی سزاوە.**

ڕوونە کەدادگەری سزادان گونجانی سزاکە دەخوازێ لەگەڵ قەبارەی تاوان و ترسناکی تاوانکار دا کەدەبێت دادوەر بارودۆخە ناوخۆیی و دەرەکییەکان تەماشا بکات ( لەبەرچاو بگرێت) کەلەگەڵ ئەنجامدانی تاوانەکەدان . بیرۆکەی دادگەری لەڕابردوودا مەبەست بووەبۆگوناھ سڕینەوە بەجۆرێك کە سزاکە لەجۆرەکەیدا و ڕێگەی جێبەجێ کردنیدا گونجاوبێت لەگەڵ ترسناکی کردەوە تاوانکاریەکەدا و بەپێی ئەم بنەمایە سزاکە مۆرکی توندوتیژی و دڕندەیی وەرگرتووە لەهەندێ بارودۆخەکاندا. پاشان بنەمایەکی تر سەری هەڵدا تاجێگەی بیرۆکەی گوناھ سڕینەوە بگرێتەوە و لەڕابردوودا لەسەر بیرۆکەی سود خوازی بوو واتە: سزا ئاڕاستەی ڕابردوو نەدەکرا بۆ لێخۆشبوون و داپۆشینی تاوانێك کەڕووی داوە و کۆتای پێهاتووە بەڵکو ئاڕاستەی ئایندە دەکرێت بۆ ڕێگرتن لەتاوانێك هەڵدەگرێت ڕوویدات بەڕێگەگرتنێکی تایبەت واتە ( ڕێگرتن لەتاوانکار لەنەگەڕانەوەی بۆ تاوانکردن) یان ڕێگرتنێکی گشتی واتە ( ڕێگرتن لەکەسانی تر لەشوێن پێهەلگرتنی) و ڕێباز و ڕێڕەوی ڕاست لەیاسادانانە سزاکاریە نوێ یەکاندا بریتی یە لە گەیاندنە یەك لەنێوان هەردوو بیرۆکەکە دا واتە : سزاکە هەردوو فەلسەفەکە کۆبکاتەوە:

أ–فەلسەفەیەکی سودخوازی کە بریتیە لەپاراستنی کۆمەڵگە لەتاوانەکان لەئایندەدا.

ب–فەلسەفەی ئاکاریی ئەویش بەدیهێنانی دادگەری یە. بەپێی ئەم ئاڕاستە نوێ یە سزادان دروست نی یە لەسەر کارەکان مەگەر بەجۆرێك پێویست بێت ڕێگری لێبکرێت وەك گرەنتیەك بۆ پاراستنی کۆمەڵگە و بەدیهێنانی دادگەریی بەئەندازەی پێویست. بێگومان ئاڕاستەی نوێ هۆکارێکی مرۆیی لەگەڵدایە هەوڵ دەدات سێ ئەرك بداتە سزا، ئەوانیش بەڕێگری تایبەت ،بەتوڕەبوون لەتاوانکار، ڕێلێگرتنی گشتی بەترساندنی کەسانی تر لەوتاوانکردنە ، چاك کردنی تاوانکار لەبری ئەوەی فەلسەفەی سزا تۆڵە لێکردنەوە بێت و سزادانی بڕیار بەسەردراوەکەدا بێت لەڕووی جەستەییەوە یان هێنانەخوارەوەی ڕێزی مرۆڤانەی بێت . لەسەر ئەم ئاڕاستە نوێ یە دەبینین هەندێ لەیاسا سزاییەکان بەسەر سزاکاندا زاراوەی هۆکارەکانی بەرگری کۆمەڵایەتی دەچەسپێنێت .

## یاسا دانان و دادگەری

ئەگەر ڕێسایەکی سزایی بەیاساکراوی نادادگەرانە لەڕێسایەکی دادگەرانەی بەیاسا نەکراو دژ وەستان یەکەمیان دەخرێتە پێش دووەمیانەوە لەبەرئەوەی دەقەسزاییەکە سەرەڕای ئەوەی کەسزایەکی توندی لەخۆگرتووە بەخەڵك دەڵێت کامە ڕەوایەو کامە ناڕەوا و قەدەغەکراوە کەوابوو بەهانەیان نی یە ئەگەر کارێکیان ئەنجامدا و شایستەی سزایەکی شیاو بوون ئەمە لەلایەکەوە ، لەلایەکی ترەوە ئارامی ئاسایشی هاوڵاتیان گرنگترە لە ڕەچاوکردنی دادگەریی لەبەرئەوە پرەنسیپی دادگەری دەکرێتە قوربانی ئەگەر لەوەدا بەرژەوەندی گشتی هەبوو [1]

[1] ) الدكتور محمود محمود مصطفى / شرح قانون الحقوبات / القسم العام و ط ١٠ رسنة ١١٨٢ ص ١٥ و پاش ئەو.

(المقارنة) بەراورد کردن لەزمانی عەرەبیدا لەبەشی(المقارنة) یە بۆ بەشداری کردن لەنێوان دوو شت دا یان زیاتر کەلەدوو کرداری (فعل)( قرن یقرنُ) قرناً بە کەسرە (ژێرەی) پیتی ڕاکە ، ەوە هاتووە داڕێژراوە. دەوترێت قَرَنَ الشيء بالشيء : لکاندنی پێیەوە ، شەتەکی دا پێ یەوە ، گەیاندی پێی، دەوترێت : قَرَنَ الثورين دووگاکەی کردە هاوڕێی : کۆی کردنەوە لەژێر نێڵێکدا بۆ جوت کردن .

لەزاراوەی یاسای بەراوردکاریدا یان بەراورد کردنی یاساکاندا زانایانی یاسا کۆدەنگ نین لەسەر پێناسەیەکی کۆگری (الجامع) ڕێگر (المانع) بۆی و ئەرکەکەیان دیاری نەکردووە و هەروەها ئەو ڕێگەیەی کەپێویستە بگیرێتە بەر لەلێکۆڵینەوەی دا بەڵکو هەموو ئەمانە جێگەی مشتومڕی کردبوو لەکۆنگرەی یاسای بەراوردکاریدا کەلەشاری پاریس گرێدرا لەساڵی ١٩٠٠ ز دا ، هەروەها لەلاهای لەساڵی ١٩٣٧ [١] . سەرەڕای ئەوە ئەوان ڕێك نەکەوتن لەسەر زاراوەکە ئایا یاسای بەراورد کاری بێ یان یاسادانانی بەراوردکاری یان بەراوردکردنی یاساکان یان یاسای هاوسەنگ ( الموازن)، ناونانی یاسای بەراوردکاری شتێکی تازەیەو تەمەنی لەسەدە و چارەکە سەدەیەك زیاتر نیە وەرگێڕدراوی ئەم دەربڕینە فەرەنسی یە یە Compae Droi و ئەم دەربڕینە ئینگلیزیە Law Comparative یەکێك لەپێناسەکانی ئەوەیە کەبریتی یە لەلێکۆڵینەوەیەکی یاسایی یان ( توێژینەوەی یاسایی یە) لەسەر بەراورد کردن لەنێوان دوویاسا یان زیاتر وەستاوە [٢].پێشنیاز دەکەم دەربڕینی (بەراوردکردنی یاسای) بەکاربهێنرێت لەبری هەموو ئەو دەربڕینە ناوبراوانە لەبەرئەوەی پیتی (ال)لەیاسای بەراوردکاریدا و وێنەی ئەو واتاکانی لەم پێنج واتایەی خوارەوە کۆدەبێتەوە:

---

[١]) الدكتور عبدالمغم البدراوي أصول القانون المدني المقارن ص ١٩ وما يليها.

[٢]) الدكتور عبدالسلام أتومانيني : القانون المقارن والنجاح القانونية الكبرى المحصارة ط/ ١٩٨٢ ص ١٨.

١- بۆ عەهدی دەرەكی (ناوبردن) وەك لەم ئایەتەدا هاتووە ﴿ كما أرسلنا الى فرعون رَسولاً فعصى فرعون الرسولَ﴾ [1] هەروەك ناردمان بۆلای فیرعەون نێردراوێك ، كەچی فیرعەون سەرپێچی لەو نێردراوەمان كرد و دژی وەستایەوە واتە : فیرعەون بەگوێی ئەو نێردراوە ناوبراوەی نەكرد .

٢- بۆ عەهدی زەینی : وەك ئەوە یەكێك لەمامۆستایانی كۆلێجێك لە كۆلێجەكان بلێت بەمامۆستایەكی تر لە هاوكارەكانی ( ڕاگرەكە لە پلەكەی دووربخەرەوە) دەزانین كەڕاگرەكە لەزەینی هەریەكەماندا ناسراوە كەكێ یە .

٣-بۆرەگەز (چیەتی) دەوترێت (الذهب خير من الفضة) واتە : چیەتی (ماهية)یەكەم باشترە لەچی یەتی دووەم.

٤- بۆگرتنەوەی هەموو تاكەكان وەك وشە(بێژە)ی (الجرائم - تاوانەكان) لەدەستەواژەی ( جێبەجێ دەبێت بڕیارەكانی ئەم یاسایە بەسەر هەموو تاوانەكاندا كەلە عێراق ئەنجام دەدرێت) [2].

٥- بۆ ئامارەكردن بۆ ئەوە كەناوی (ال) دارشتێكی سەرپێی نیە ، بەڵكو گوێزراوەتەوە لەو شتەی كەكراوە بەناو بۆی كەلەپێشدا وەك: ( الفضل و الحارث و النعمان . ابن مالك دەڵێت (الألفية) وبعض الأعلام عليه دخلا للمح ماقد كان عنه نقلا) وە (أل) یش لە ( یاسای بەراوردكردندا) دا ، ناگونجێت بڵێین (أل) بۆ دوو مانای یەكەمە، لەبەرئەوەی (المقارنة) بەراوردكاری لەیاساكاندا (القوانين) كراوەیە بێ دیاری كردن و سنوردار كردن. هەرقانونێك پێش كەش كرابێت هەروەها مەبەستمان مانی سێ یەم نیە، لەبەرئەوەی چی یەتی (الماهية) یاساكان بەراورد ناكرێت، لەبەرئەوەی چیەتی یاسا(الماهية القانون)هەموی یەكە لەهەموو وڵاتانی جیهاندا.هەروەها ناتوانین بڵێین واتای چوارەم دەگەیەنێت ، لەبەرئەوەی عادەت بەراوردكاری ئەنجام نادرێت لەنێوان هەموو یاساكاندا. هەمدیس ناگونجێت بڵێین مانای پێنجەمە ، لەبەرئەوەی نابێتە ئامارە بۆ یاسایەك كەبەراوردكاری تێدا كرابێت ، بەپێی ئەوەی گوتمان دەربڕینی ڕاست ئەمەیە كەبوترێت (المقارنة القانونية) وەپێناسە دەكرێت

---

١ ) سورة المزمل ١٥-١٦

٢ ) المادة (٦) من القانون المحتويات العراقي النافذ .

بەوەی بەراوردکرنە لەنێوان کۆمەڵێك یاسادا بەمەبستی (ئامانجی) دەرهێنان و پاڵفتەکردنی لایەنەلێکچوو جیاوازەکان لەنێوان یاساکاندا.

بۆوەرگرتنی گونجاوترین و باشترین . سروشتی بابەتەکە پێویستی بە دابەش کردنی لێکۆڵینەوەکە هەیە لەڕوی روخسارەوە بەسەر سیٚ جێباس دا :

یەکەم: بۆ هۆکارەکان و پێداویستی یەکانی بەراوردکاری.

دووەم: بۆ سەرهەڵدان و نمونەکانی بەراوردکردن.

سیٚ یەم: بۆ فەلسەفەی بەراورد کردن.

# جێباسی یەکەم:
# هۆکارەکان و پێداویستی یەکانی بەراوردکردنی یاسایی

بۆ بەراوردکردنی یاسایی وەك هۆکارێکی خۆویستانە کۆمەڵێك هۆکار و پێداویستی و توخم هەیە ، ئەم بابەتە دەکرێت بە دوو بەشەوە یەکێکیان تایبەتە بەهۆکارە سەرەکیەکان و دووەمیان : بۆ ڕەگەز و توخمەکانەوە.

## بابەتی یەکەم:
## هۆکارەپێویستەکان بۆ بەراوردکردنی یاسایی

بۆ بەراوردکردنی یاسایی هەرلەسەرەتای سەرهەڵدانیەوە و لەبواری سەردەمەکانی گەشەسەندن یەوە هۆکارێکی زۆر هەیە بەپێی کات و شوێن دەگۆڕێت ، لێرەدا بەتایبەتی باسی هۆکارە سەرەکی یە بەراوردکردنی نێوان یاسا نویێ یەکان دەکەین کەگرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

١- شۆڕشی گەیاندن و پەیوەندی یەکانی نێوان گەلان و نەتەوەکان لەوڵاتانی جیهاندا بەشێوەیەکی تایبەت پاش جەنگی دووەمی جیهانی بویە هۆی گواستنەوەی بیرۆکەکان و لافاوی زانیاری یەکان کورتکردنەوەی کات و کورت هەڵهێنانی شوێن بەجۆرێك جیهانی ئاوەدان لەسەر ئەستێرەی زەوی وەك گوندێکی بچوکی لێهاتووە، لەهەر وڵاتێك شتێك ڕوویدات و وڵاتەکەی تر نزیك بێت لێی یان دوور دەکەوێتە ژێرکاریگەریی چ لەبواری یاسایی یەوە بێت یان ڕامیاری یان کۆمەڵایەتی یان ئابووری یان وێنەی ئەوانە.

٢- لەبەردەم گەشەسەندنی تەقینەوەیی لەجیهاندا پێویستە لەسەر پیاوانی یاسا لەهەموو کۆمەڵگەیەك دا زانستە یاساییەکانیان بەکاربهێنن و سەلیقە فیقهیەکانیان بخەنە گەڕ لەپێناو گەشەپێدانی پەیوەندی یە یاسای یەکان وڵاتانی جیهاندا پاش ئەوەی کەجاران

تەنها گرنگیان بەلێکۆڵینەوەی یاسا ی ناوخۆیی دەدا بەبێ بایەخدان تێڕوانینی یاسایی لای گەلانی تر.

٣- زیادکردنی (پتربوونی) لۆخەکانی چەسپاندنی یاسای بێگانە لەسەردەمی نوێدا لەبەرچەند هۆکارێکی زۆر لەوانە:

أ- زیاد بوونی پەیوەندی یە ئابوورییەکان لەنێوان تاکەکانی وڵاتانی جیهاندا لەئەنجامی بەرپابوونی پەیماننامە بازرگانیەکان و وەسود هێنانی سامان لەدەرەوەی وڵات و بانکەبیانیەکان و کاری کارگەکان لەدەرەوەی وڵاتەکانی وێنەی ئەمانە کەبوبونە هۆی پێویستی زانینی ئەو یاسا بیانیانەی کە ئەم پەیوەندی و پەوەستی یانە هەڵدەسوڕێنێت.

ب-زیادبوونی پەیوەندی یەکانی باری کەسێتی نێودەوڵەتی بەهۆی بڵاوبونەوەی ژن هێنانی تیکەڵاو و ، پێشکەوتنی هۆکارەکانی گەیاندن کە بەشەکانی جیهانی لێکتر نزیك کردۆتەوەو ئەم لاولاکانی پێکەوە بەستووەتەوە ، هاتوچۆی بۆ تاکەکانی ئاسان کردووە تابتوانن لەوڵاتە بیانیەکاندا نیشتەجێ بن و ئەمەش بویە هۆی بڵاو بوونەوەی ژن و ژنخوازی لەنێوان ڕەگەزە جیاجیاکاندا ، ژن و ژنخوازیش کۆمەڵێك مەرجی هەیە ، هەندێکیان بابەتین و هەندێکیان ڕواڵەتین بەهۆی بەدی هاتنیانەوە کۆمەڵێك ماف و پابەندی خێزانی سەر هەڵدەدات کە ئەوانیش بەپێی یاساکان دەگۆڕێت ، لەبەرئەوەی بەراوردکردنیان بۆ ناسین و زانینی یاسایەك کەپێویستە بچەسپێنرێت لەپێویستی و زەروریەکانی ژیانە لەسەردەمی تازەدا.

٤- بڵاوبوونەوەی گرێبەستە نمونەییە نێودەوڵەتیەکان ڕاستەوخۆ یان لەڕێگەی هۆکارە تازەپێشکەوتووەکانەوە ، ئەم گرێبەستانە لەبابەت و فۆرم و زمان و کاریگەریەکاندا جیاوازی یەکی گەورەیان هەیە لەگەڵ ئەو گرێبەستانەی کەپێیان ئاشناین لە یاسا نیشتمانەکانماندا ، لەبەر ئەمە بۆ تێگەیشتنی ئەم گرێبەستانە و ڕێکخستنیان و ڕاڤەکردنیان پێویستمان بە پرەنسیپەکانی یاسا بیانیەکان هەیە لەڕێگەی بەراوردکردنەوە.

٥- فراوان بوونی تایبەتمەند بوونی دادگا نیشتمانیەکان کێشە بیانیە تایبەتەکاندا، ئاڕاستەوەرگرتنی دادوەریی بەرەو وەرگرتنی سیستەمێکی فراوانتر لەمل ملانێکردنی

یاساكاندا ، لەگرنگترین هۆكارەكانە كەدەبێتە هۆی پێویستی بەراورد كردن بۆ ناسینی یاسایەك كەپێویستە جێبەجێ بكرێت لەبابەتە خاوەن ڕەگەزە بیانیەكاندا [1].

## بابەتی دووەم:
## پێویستیەكانی بەراوردكردنی یاسایی

جەند مەرجێك لێرەدا بەدی دەكرێت ،هەیانە دەگەڕیتەوە بۆ ئەوكەسەی كەبەم بەراورد كردنە هەڵدەسێت،هەیانە دەگەڕێتەوە بۆئەوشتەی كەبەراوردكردنەكەی تێدا دەكرێت .

یەكەم: مەرجەكانی كەسێك هەڵدەسێت بەم بەراوردكردنە:-

لەو یاسایانەدا كە هەڵدەستێت بەئەنجامدانی بەراوردكاری لە نێوان یاساكاندا پێویستە كۆمەڵێك مەرج هەبێت گرنگتریان ئەمانەی خوارەوەن:-

١-دەبێت بەراوردكارەكە (المقارن) سەلمێنەیەكی فیقهی و هۆشێكی یاسایی پێگەیشتوی هەبێت توانای شیكردنەوەو هەلگۆزینێ و پاڵفتەكردنی ئەو بەندە یاسایانەی هەبێت كە گونجاوترینن تا تێهەلكێشی بكات لەیاسا نیشتمانیەكەیدا بەپێچەوانەوە ئەگەر ئەم مەرجانەی تێدا نەبێت،ئەوا بەراوردكردنەكە تەنها گواستنەوەی یاساكانەو بەلەپێش دانانێكی و ڕاست زانینێكی روكاری نەك هێنانی شتێكی نوێ.

٢-دەبێت بەراوردكارەكە زۆر شارەزابێت لە زانستە ئامێرییەكاندا(لۆجیك ، فەلسەفە ، أصول الفقة ،زمان) هەروەك جۆن دارتاش ناتوانێت تەختەكە بكات بەو شتەی خۆی دەیەوێت بێ بەكارهێنانی ئامێرەكانی دارتاشی ،ئاسنگەر ناتوانێت لە ئاسن ئەوشتانە دروست بكات كەدەیەوێت مەگەر بەبەكارهێنانی ئامێرەكانی ئاسنگەریی هەروەها (بەهەمان شێوەیە) ئەو كەسەی مامەڵە لەگەڵ دەقەكاندا دەكات ناتوانێت هەمو لایەنەكانی بپشكنێ و باشی و خراپەكانی بزانێت هەتاوەكو ئاگای لەهەموو زانستە ئامێریەكاندا دەستێكی باڵای نەبێت.

---

[1] ) الأستاذ الدكتور عبدالمنعم البدراوي أصول القانون المدني المقارن ص ٨٢ پاش ئەو

٣-پێویستە بەراوردکار یەکەمجار ویستی ملکەچ پێبکات بۆ ئەقڵی نەك بەپێچوانەوە ،بەپێی ئەم ڕستە پڕحیکمەتە بجولێتەوە: (انظر الی ماقیل ولا تنظر الی منّ قال) واتە: بۆوتراوەکە بڕوانە و بۆ خاوەن وتەکە مەڕوانە). لە غەزالیەوە دەگێڕنەوە کەفەرمویەتی (هەرکەس گومان نەبات و لەگوماندا نەبێت وردنابێتەوە و سەرنج نادات هەرکەس ورد نەبێتەوە ڕێدەرناکات و هەرکەس نەبینێت ڕێدەر ناکات لە کوێریەو گومرایدا دەمێنێتەوە) کەوابو ئەو لێکۆڵەرەی ڕاکانی بەلاوە بێرۆزە ناتوانێت ڕاست و ناڕستی ئەو ڕایانە جیابکاتەوە.

دووەم :لەو مەرجەدا واکراوانەی کەپێویستە هەبێت لەو یاسایانەدا کەبەراوردی تێدادەکرێت

١- لێکۆڵینەوەی هەموو یاسایەك لەویاسایانەی کەبەراورد کردنی تێدا دەکرێت بەتەنهایی و بەدوور لەیاساکانی تر تابەراوردکار بتوانێت لایەنە لێکچوو جیاوازەکان لێکتر جودا بکاتەوە پاشان ئەوە وەربگرێت کەگونجاوترینە.

٢- دەبێت لەنێوان ئەو یاسایانەدا کەبەراوردکردنی تێدادەکرێت ئەندازەیەك هاوبەشی هەبێت لەپەیوەندی یە ڕێکخراوەییەکان بەجۆرێك جیانەبێت (جیاوازنەبێت) لەچارەسەرکردنی بڕیارەکانی ئەو کارانەدا کەدەکەونە چوارچێوەیەوە و ملکەچن بۆی.

٣- دەبێت لەنێوان ئەو دوو دەوڵەتانەدا کەبەراوردکردن لەیاساکانیدا ئەنجام دەدرێت نزیکی بیروباوەڕی یان ڕێکخستنی یان ڕامیاریی ئابووری یان کۆمەڵایەتی یان نەریتی یان وێنەی ئەمانە هەبێت ، لەبەرکەم سودبوون لەنێوان یاساکانی چەند وڵاتێکدا کە ئاراستەی دژبەیەکیان هەبێت ،لەبەر ڕەچاو نەکردنی ئەم مەرجە یاسادانەری عێراقی کەوتوەتە هەڵەیەکی گەورەوە ، چونکە برگەی یەکەمی لەماددەی (٤٣)ی لەیاسای باری کەسێتی عێراقی ئێستەی لەیاسای سۆڤیەتی وەرگرتووە،چونکە ئەم برگە ماف دەدات بەژن داوای جیابوونەوە بکات ڕاستەوخۆ لەمێردەکەی ، ئەگەر کاتێك بڕیاردرا بەسەر مێردەکەیدا بەسزایەك کەسەر بەستی مێردەکەی دەبەستەوە بۆماوەی سێ ساڵ یان زیاتر ، باپیاوەکەش دارای هەبێت ژنەکە بتوانێت خەرجی بکات بۆ بەڕێوەبردنی ژیانی، لەگەڵ ئەوەش کەیاساکانی وڵاتانی تری جیهانی ئیسلامی و نائیسلامی ئەم مافە ناداتە ژن ، مەگەر

پاش تێپەڕبوونی ماوەیەك بەسەر جێبەجێ کردنی بڕیارەکەدا لەنێوان ساڵێك بۆ دوو ساڵدایە.

٤- دەبێت بەراوردکاری لەنێوان یاسای نیشتمانی و لەنێوان یاسایەکی تردا کەکارپێکردنی هەڵوەشابێتەوە ئیتر ناوخۆی بێت یان دەرەکی نەکرێت مەگەر لەکاتی ئامادەکردنی پڕۆژەکەیدا لەم بارودۆخەدا دەگونجێت یاسا هەڵوەشاوەکە یەکێك بێت لەسەرچاوەکانی پڕۆژەکە لەکارێکی زۆر پێویستا، زۆرێك لەیاسا نویێ کان هەندێك دەق لەخۆدەگرن یان هەندێك لەبڕیارەکانی یاسا هەڵوەشاوەکان.

٥- دەبێت بەراوردکرنەکە لەنێوان یاسای- دانراو - و ئەویاسایەدانە بێت کەبەیاسای سروشتی ناودەبرێت ، لەبەرئەوە یاسای سروشتی بەپێی تایبەت مەندی یەکانی بێسەرەتاو بێکۆتا و نمونەییە یە بەپێی کەسەکان و کات و شوێن ناگۆڕێت ئەمە تەنها خەیاڵ و پڕوپوچی یەو لێرەدا بواری سەلماندنی ئەم قسەیەمان نی یە.

٦- دەبێت بەراورد کردنەکە لەنێوان یاسا هاوجوتەکاندا بێت ، وەك بەراورد کردن لەنێوان یاسا شارستانیەکانی چەند وڵاتدا یان یاساکانی کاردا ، یان یاساکانی باری کەسێتی،شتێکی ژیربێژیانە نی یە بەراوردکردن لەنێوان یاسای مەدەنی و یاسای سزاییدا یان لەنێوان یاسای مەدەنی و یاسای کارکردن دا بۆنمونە بەمەرجێك ئەندازەیەکی هاوبەش نەبێت لەنێوان یاسا ناهاوجوتەکاندا کەبەراورد کردن بخوازێت.

# جێباسی دووەم:
# سەرهەڵدان و نمونەکانی بەراوردکردن

مرۆڤی تایبەتمەندکار خاوەن ویستی ئازاد هیچ شتێك لەناو کۆمەڵێك لەشتە هاوجوتەکاندا یان دژەکاندا هەڵنابژێرێت تا هەڵنەستێت بەهاوسەنگ کردنی بەتەرازووی عەقڵی ساغ ،پاشان خستنەپێشی یەکێکیان بەسەر ئەوی تریاندا لەپێناو هەڵبژاردنی ئەوەیان کە گونجاوترین یانە:

لەم سەرەتا فەلسەفی یەوە بەراورد کردن سەری هەڵدا بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ گەشەکردنی پێگەیشتنی عەقڵی مرۆڤدا و لێك لێکگیرانەکانی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگە و دژوەستانی بەرژەوەندی یەکانیان بەبەرامبەر یەکتر. کەواتە شارستانیەتە مرۆڤایەتیەکان زادەی خستنەپێش و هەڵسەنگاندن و دۆزینەوەی شتە نادیار و نەزانراوەکانە. لێکۆڵەران (توێژەران) دەڵێن: سەرهەڵدانی بەراوردکردنی یاسایی دەگەڕێتەوە بۆ بەرلەزاین بۆ نمونە :( لکورج) یاسا دانەری (اسبارتە) : یاساکانی خۆی لەسەدەی (١٩)ی پێش زایندا دانا پاش سەردان کردنی ئاسیای بچوك و کریت و میسر و لێکۆڵینەوەی یاساکانیان. (سولون) ٦٣٨ — ٥٥٦ پ.ز یاسا دانەری ئەسینا : کۆمەڵەیاسایەکەی پاش گەڕانێك (گەشتێك) دانا کە ١٠ ساڵ بەردەوام بوو. ئەفلاتون (٤٢٧ — ٣٤٧ پ.ن) هەستا بەبەراورد کردن لەنێوان یاساکانی سەردەمی خۆیدا لەکتێبەکەیدا گفتوگۆیەك دەربارەی یاساکان ( dialoguesurl eslois ) پاشان قوتابیە فەیلەسوفیەکەی دێت کە ئەرستۆیە (٣٨٤ — ٣٢١ پ.ز ) کەلەکتێبەکەیدا بەناوی (السیاسة) وە بەرواوردی لەنێوان یاساکانی ئەسینا و یاساکانی ئەسبارتە و کریت و قرطاجة و یاسای وڵاتانی تردا کردووە ، ئەو دەیوت لەسەر یاسادانەر پێویستە کاربکات لەسەر (بۆ )قایم کردنی یاساکان لەڕێگەی زانینی یاساکانی دەوڵەتان بۆ شارەکانی تر و جیاوازیان لەنێوان دا بکات و ئەو یاسایە وەرگرێت و سودیان لێ ببینێت کە

بۆ شارەكەی گونجاون [1]، لەدیارترین فەیلەسوفەكانی یاسا لەدوو سەدەی حەڤدەهەم و هەژدەهەم فەیلەسوفی فەرەنسی (مونتسكیو)یە

( ١٦٨٩ز–١٧٥٥ز )لەپەرتوكەكەیدا(روح الشرائع) كەپێك هاتووە لە (٣١) دەروازە كەدابەش كراوە لەنێوان شەش بەش دا و چارەسەری هەموو بچوك و گەورەیەكی تێدا كردووە لەوشتانەدا كەپەیوەندی بە سیستەمە یاساییەكانەوە هەیە لەسەر ئەم شێوازە بەردەوام بوو هەلەسەرەتای گەنجی یەوە وەك قازی (دادوەر) و

فەیلەسوف و لێكۆلەرو توێژەرو هۆكاردۆزێك تالەم بەراورد كردنە گەیشتە ئەو دەرئەنجامەی كەپێویستە یاساكان جیاواز بن بەپێی جیاوازی هەرێم و رەگەز و بیروباوەرەكان ، ئەم پەرتووكە سەرەرای گرنگ بوونی ناكرێت (ناگونجێت) كەبلێین تیۆرێكی گشتی تۆكمەی بنیات نا لەگەشەسەندنی یاساكان و بەراورد كردنیان دا. لەوتە بەناوبانگەكانی (مونتنسكیر): ( یاسای هەرولاتێك ناگونجێت بۆ ولاتێكی تر ) لەسەر ئەو بنەمایەی كەیاسا لەواقیعی كۆمەلگاوە هەلدەگوزرێت ، كۆمەلگاكانیش لەبیرو باوەرو داب و نەریتیاندا جیاوازن سەربای رامیاری و ئابووری یەكان . بەلام لەرێگەی لێكۆلینەوەی بەراوردكاریەوە دەركەوتووە كە ئەندازەیەك هاوبەشی لەنێوان یاساكانی ولاتانی جیهاندا هەیە ، پەنای پێدەبرێت لەدانانی یاساكان و بەرەو پێش بردنیان و راڤەكردنیان. جگەلەمانەش لەئەركەكانی بەراورد كردنی یاسایی لەجیهانی عەرەبی و ئیسلامی دا تەنها ئەم بەراورد كردنە لەنێوان یاساكاندا ئەنجام نادرێت بەلكوبەراوردكردنی تر هەن لەنێوان ئاینزانەكان و رێسا بنەمایی و رافیقهیەكاندا هەروەك لەم نمونانەی خوارەوەدا بەدی دەكرێت:

١– بەراورد كردن لەنێوان رێچكە فیقهیەكاندا : كۆمەلێك لە شەرع زانان شەریعەتی ئیسلام هەلسان بەئەنجام دانی بەراورد كردن لەنێوان هەندێك لە رێچكە فیقهیەكاندا ،

---

[1]) كتاب (السياسة لارسطو ترجمة أحمد لطفي السيد ط / دارالكتب القاهرة ١٩٤٧ ص ٣٠٨ نقلا عن كتاب القانون المقارن و المناهج والقانونية الكبرى المحاصرة د.سلام نزمانيني ط ١٩٨٢ ص ٢٧.

لەپێشەکی ئەم بەراورد کردنانە (–بەراورد کردنەکەی م:(ابن رشدی حەفید)) [1]ی نەوە:
بێگومان لەشێوازی بەراورد کردنەکەیدا شوێن ڕێگەی خستنەڕووی ڕافیقهیەکان نەسازەکان دەکات لە هەموو بابەتێك دا لەگەڵ باسکردنی هۆکاری ڕاجیاوازەکان کەدەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی لە ڕێسا أصولیەکان دا یان لەڕاڤەی دەقەکان دا بێ دەمارگیری بۆ ئاینزایەکی دیاری کراو یان خستنەپێشەوەی ڕایەك بەسەر ڕایەکی تردا ، فەلسەفەی بەراوردکردنەکەی ئاگادارکردنەوەی خەڵکی یە لەهۆکاری ڕاجیایی شەرع زانەکان .

٢– بەراورد کردنەکەی عبدالوهاب ی شەعرانی [2] و بەرنامەیەی لەم بەراورد کردنەکەدا، بریتیەلە باسکردنی ئەو خاڵانەیە کەجێی کۆ دەنگی زانایانە لەهەر بابەتێك دا پاشان خستنەڕووی ڕافیقهیەکان لە تێیدا لەگەڵ هێنانی بەڵگەکانی و کۆتای بەم بەراورد کردنە دێنێت بەهەڵسەنگاندنی ئەم ڕایانە لەڕووی قورسی و ئاسانی یەوە بێ هیچ لایەنگیریەك یان بەڕاستر دانانی ڕایەك بەسەر ڕایەکی تردا ئەم نرخاندن و هەڵسەنگاندنەش فەلسەفەی بەراورد کردنەکەیەتی.

ب– بەراورد کردن لەنێوان ڕێسا اصولیەکاندا : زۆریەی سەرچاوە باوەڕپێکراوەکانی اصول الفقة (بەنەماکانی فیقهو)بەراوردکردنی یاسا اصولیەکان لەخۆدەگرێت و لەم سەرچاوانە:–

١– الإحكام في أصول الأحكام [3]و ئەو شێوازەی بۆ بەراوردکردن لەم سەرچاوەدا پەیڕەوکراوە بریتی یە لە خستنەڕووی ڕاجیاوازەکان دەربارەی ڕێساکانی بنەماکانی فیقھ کە لە ڕا پشتگیرەکانەوە بەڕەهای دەست پێدەکات پاشان ڕادژە ڕەهاکان و ئەمجابە درێژی قسەیان لەسەر دەکات لەڕووی پشتگیری لێکردنەوەیان وەرنەگرتن و دانە دواوەی لەڕوویەکی ترەوە ، کۆتای هێنان بەم بەراورد کردنە بەڕوونکردنەوە و باسکردنی ڕای هەڵبژێردراو لەلای نوسەرەوە ، ئەمەش فەلسەفەی بەراورد کردنەکەیەتی .

---

١) ابو الوليد محمد بن أحمد بن رشد القرطبي الأندلسي المالكي (ت–٥٩٥ ه) في كتابة بداية المحتصد والنهاية اعققد

[2]) پێشەوای گەورەم عبدالوهاب الشعراني لەپەرتوکەکەیدا ( الميزان الكبرى الشعراتيه )

[3]) زانا سيف الدين أبو الحسين علي بن محمد الآمدي الكردي لە ٣ بەرگ دا.

٢- (جمع الجوامع)ی عبدالوهاب سویکی [١]: شێوازی بەراورد کردن لەم سەرچاوەیەیدا پێك دێت لەخستنەڕووی ڕاجیاکان (جیاوازەکان) لەهەموو ڕێسایەکی اصولی ڕاجیادا لەگەڵ ناوهێنانی خاوەنەکانیان هەندێك جار و هێنانی وشەی (وقیل) هەندێکجاری تر بێ ئەوەی زۆرکات باسی ئەو بەڵگانە بکرێت ، سویکی بەراوردکردنەکەی کۆتای پێدێنێت بەدەست نیشانکردنی ڕای پەسەند تر لەدیدگای خۆیەوە لەژێر ناونیشانی (والأصح)دا یان (الأشبە)دا ودەست نیشانکردنی پەسەندترین ڕا لای نوسەر ، فەلسەفەی بەراورد کردنەکەیەتی.

ج- بەراوردکردن لەنێوان فیقهی ئیسلامی و فیقهی ڕۆژئاوایدا لەجوانترین نمونەکانی ئەم بوارە ئەو بەراوردکارییەیە کەخوالێخۆش بوو (سنهوری)پێی هەڵساوە لەبەراورد کردنی فیقهی ئیسلامی و ڕۆژئاوای لەڕووی سەرچاوە بونیان بۆ ڕاستی ، شێوازی بەراوردکردنەکەی چەند تایبەت مەندی یەکی هەیە لەوانە:

١) زۆربەی جار لەفیقهی ڕۆژئاوای یەوە دەست پێدەکات پاشان ئەو بابەتە دێنێت کەبەرامبەریەتی لەفیقهی ئیسلامیدا بەپشت بەستن بەسەرچاوە پشت پێبەستراوەکان بەتایبەتی فیقهی ئاینزای حەنەفی و زۆرجار دەقی فیقهی لێوە دەگوێزێتەوە کەپەیوەندی بەبابەتەکەوە هەبێت پاشان بەرئەنجامیان لێ هەڵدەگوزێت

٢) باسی ڕووەکانی جیاوازی و لێکچونی دوو فیقهەکە ( ئیسلامی - ڕۆژئاوایی) ناکات لەبەر پاراستنی مۆرکە تایبەتی یەکەی فیقهی ئیسلامی سەبارەت بەم باسە دەڵێت (هەوڵ نادەین نزیك کردنەوە دروست بکەین لەنێوان فیقهی ئیسلامی و فیقهی ڕۆژئاوایدا لەسەر بناغە گەلێکی نەبوو (موهومة) یان هەڵە، چونکە بەڕاستی فیقهی ئیسلامی سیستەمێکی یاسایی گەورەیە سیفەتێکی سەربەخۆی هەیە وەلەسیستەمە یاسای یەکانی تر جیایە لە دارشتنی دا و وردەکاری و دەست پاکی زانستی داوامان لێدەکات کە مۆرك و پایەکانی بپارێزین ) [٢] . پێم وایە کەجیهانی ئیسلامی قەرزاری ئەم زانا گەورەیە ، بەهۆی ئەو بەراوردکرنەکەی ئەنجامی داوە کە پلەو پایەی فیقهی ئیسلامی تێدا دەردەکەوێت گشتگیری و پێشکەوتن و وردی و پێگەیشتنەوە . ئەگەر لەسەرەتای گەنجی یەوە دەستی بەم کارە

---

[١]) پێشەوا تاج الدین عبدالوهاب السیبکي لە ٢ بەرگ دا.

[٢]) مصادر الحق ب / ل ٦

بکردایە ئەوا بێگومان موعجیزەی دەهێنا سەرەڕای ئەوە ئەو لەهەندێك لەدەرئەنجام دەرهێنانی لەفیقهی ئیسلامی سەرکەوتوو نەبووە بەهۆی بەکارنەهێنانیەوە بۆ زانستە ئامێریەکان وەك شەرعزانەکانی فیقهی ئیسلامی . بەلآم بەراورد کردن لەنێوان فیقهی ئیسلامی و ئەو یاسانە دا کەکارتێکردنی لەسەریان هەیە وەك یاسای شارستانی عێراقی [(١)] و ئەردەنی [(٢)] و یەمەنی [(٣)] ئەم بەراوردکردنە بەرهەمێکی کرداری بەدیناهێنێت ئەگەر بیٚ هودە نەبێت لەبەرئەوەی (٩٠ ٪) ئەم یاسایانە لەفیقهی ئیسلامی وەرگیراوەو وەکو بەراوردکردنی شتێك وایە لەگەڵ خۆیدا (بەخۆی) بەپێچەوانەی یاسایەك کاریگەر بێت بەفیقهی ڕۆژئاوایی وەك یاسای میسری [(٤)] و سوری [(٥)] و لوبنانی [(٦)] جگەلەمانەش.

بەشێوەیەکی گشتی فەلسەفەی بەراورد کردن لەنێوان ئاینزا فەلسەفیەکاندا ناسینی ئاڕاستە فەلسەفەکانیەتی و وەرگرتنی گونجاوترین ئاڕاستەیە یان دەرئەنجام گیری باشترین ئاڕاستەیە بەپێی هەموو کات و شوێنێك . فەلسەفەی بەراورد کردن لەنێوان ئاینزا فیقهی یە ئیسلامیەکاندا بریتی یە لەکارکردن بەوەی کەسود و بەرژەوەندی و گونجانی زیاترە و لەڕووی پێشکەوتنەوە دەگونجێت لەگەڵ ئەو سەردەمەی کەبەراورد کەرەکەی تێدا دەژی بیٚ ئەوەی پابەند بێت بە ڕێچکەیەکی دیاری کراوەوە.

کەوابوو خۆبەستنەوە ڕێچکەکەیەوە و دەمارگیری بۆی و گواستنەوەی لەنەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر گەورەترین هەڵەیە کەمرۆڤی مسوڵمان لەم سەردەمەدا دەیکات لەبەرئەوەی ئاینی ئیسلام بەسەردەمی زێرینی خۆیدا تێپەڕی ڕێچکەیەك نەبوو لەوکاتەدا پەیرەوی لیٚ بکرێت و بۆ جێنشینە ڕاشدینەکان و شوێن کەوتەکانیان و شوێن کەوتووی شوێن کەوتووەکان و ڕێچکەیەکی نوسراو نەبوو کەخەڵك شوێنی بکەوێت و پابەند بێت پێوەی . لەگەڵ ئەوەش دا ئەوان پلەزانستی و پایەی شکۆیان بەرزتر بوو لە جگەلەخۆیان لەو

---

١) ژمارە (٤٠) بۆ ساڵی ١٩٥١
٢) ژمارە (٤٣) بۆ ساڵی ١٩٧٦
٣) ژمارە (١٩) بۆ ساڵی ١٩٩٢
٤) ژمارە (١٣١) بۆ ساڵی ١٩٤٨
٥) ژمارە (١٤٣) بۆ ساڵی ١٩٤٩
٦) ژمارە (١٩٣٤) دەستکاری کراو

ئاینزایانەی پاش ئەوان سەریان هەڵداو تەنانەت لەسەردەمی پێشەوایانی فیقهی دا( شەرعزاندا) ڕێچكە ی فیقهی نەبوو بەڵكو قوتابخانە(فێرگەی) فیقهی هەبوو وەك قوتابخانەی خاوەنی ڕاكات ( أهل الرأي) لەشاری كوفەدا و هەوادارانی پێشەوا أبو حنیفەیە ( ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت) قوتابخانەی هاوەڵانی فەرموودە (أهل الحدیث) و مەڵبەندەكەی شاری مەدینە بوو لەشوێن كەوتووەكانی ئەم فێرگەیە پێشەوا مالك ە ( ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت) ، قوتابخانەی مامناوەند كە هەردوو ئاڕاستەكەی تێكەڵ كرد (كرد بەیەك) و ئاڕاستەیەكی سێیەمی پێك هێنا پێشەوا شافعی ئەم ئاڕاستەیە.

## جێباسی سێ یەم:
## فەلسەفەی بەراوردكردنی یاسایی

بەراوردكردنی یاسایی كۆمەڵێك ئەركی فەلسەفەی زۆری هەیە كەبەپێی جیاوازی كات و شوێن و پێشكەوتنی شارستانی و گەشەسەندنی یاسایی وێنەی ئەمانە دەگونجێنێت گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن:-

یەكەم: دانانی یاسایەكی نویٚ: شتێكی ڕوون و ئاشكرایە كەدانانی هەریاسایەكی نویٚ بەكۆمەڵێك قوناغ دا تێدەپەڕێت بەدەست پێكی (بدء) دامەزراندنی لیژنەیی بۆ ئامادەكردنی پرۆژەكەی تاكۆتای هێنان پێی بەواژۆ لەسەر كردنی لەلایەن سەرۆكی دەوڵەتەوە .

یەكەم كاری لیژنەكەش بریتی یە لەلێكۆڵینەوەی بەراوردكردن لەنێوان یاساكانی وڵاتدا كەپەیوەندی یان بەبوارە كۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕامیاری یەكانەوە هەیە ، یان لەباری سیستەمە یاسایی و بیروباوەڕ و داب ونەریتەكانەوە دەدوێت . [1] بەخشەرەكە پابەند دەكات بەدانە دەستی بەخشراوەكە بەپیٚ بەخشراوەكە ،بەڵام بەخشینەكە مافی پێبەخشراوەكە لەبەخشراوەكەدا دروست ناكات مەگەر پاش وەرگرتنی . [2] وەرگرتن

---

١) تەماشای پەرتوكیالاوضاع التشریعی في الدول العربیة مافیها و حاضرها للاستاذ الدكتور المحمصاني ل ٥

٢) تەماشای الشرح المخیر للدردیر مع حاشیة الصاوي ب، ل ٢٩٠

لەفیقهی ئیسلامی دا نەپایەو نەمەرجە لەگرێبەستە ماددیە ڕاستی یەکاندا (بەخشین و قەرز و بارمتە دانان ،خواستن و سپاردن)، ئەم گرێبەستانە تەنها بەگفتگۆی مامەڵە دادە مەزرێت (الایجاب والقبول) وەك گرێبەستە (ڕازیبونیەکان) کۆمەڵێ پابەند بوون دروست دەکات بەس ماف دروست ناکات مەگەر بەوەرگرتن (القبضی) ئەم گرێبەستانە دانانەمەزرێن لەڕووی کاریگەری و شوێنەوارەوە نەك لەڕووی ڕەگەز و توخمەوە. [1]

چوارەم: پەرەپێدانی یاسا : گرنگترین هۆکارە کاریگەریەکان لەیاسای نیشتمانی و پەرەپێدانی سەرباری بارودۆخە ناوخۆی یەکان لەوڵاتدا، لێکۆڵینەوە بەراورد کاریەکە لەنێوان یاسا بیانیە پەیوەندی دارەکاندا ، ئەرەستۆ سەربارەت بەگرنگی بەراورد کردن و پێویستی یەکی لەپەرەپێدانی یاساکاندا لەپەرتوکەکەیدا (السیاسة) دەڵێت :( لەسەر یاسادانەر پێویستە هەوڵی باشکردنی یاساکان بدات لەبەرئەوە پێویستە لەسەری کە ئاشنا بێت لەگەڵ یاساکانی میری وڵاتانی تردا و جیاوازیەکانیان بزانێت و یاسا گەلێکیان لێوەربگرێت کەدەگونجێت لەگەڵ وڵاتەکەیدا) [2] .

پەیوەندی یەکان و سیستەمە یاساییەکان لەبارەکانی ململانێی یاساکاندا چونکە بابەتەکە ڕای جیاوازی لەسەرە ئایا گونجاندن پێویستە بەپێی یاسای دادوەر بێت یان بەپێی ئەو یاسایە بێت کەبابەتەکە دەبات بەڕێوە یا زاڵە بەسەریدا؟ لەڕێگەی لێکۆڵینەوە بەراورد کاریەکانیەوە دادوەر دەبینێت کە بەراوردکردنی یاسای باشترین یارمەتیدەرە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی گونجاندن [3]

شەشەم: یەك کردنی یاساکان : بەراوردکردنی یاسایی گرنگی یەکی گەورەی هەیە لەیەککردنی یاساکانی دەوڵەتانی خاوەن پەیوەندی ڕامیاری و کارگێری و مێژوییدا وەك هەرێمەکانی ئەمریکا یان خاوەن پەیوەندی یەکی ئابووری و سەربازیی و وەك لەیەکێتی ئەوروپادا بەدی دەکرێت یان خاوەن پەیوەندی یەکی ڕەگەزی و زمانی بیروباوەری وەك

---

١) تەماشای دانراوەکان دەکرێت (الالتزامات في الشريعة الاسلامية و التشريعات المدينة العربية) ص ٢٣٤ پاش ئەو

٢) كتاب السياسة لارسطو ص ٣٠٨ ترجمة لطفي السيد نقلاً عند ترمانيني ط / ١٩٨٢ ص ٢٧

٣) بۆ زیاتر ئاگاداربوون تەماشای (أصول القانون المقارنة المرجع السابق للبدراوي ص ١١١ پاش ئەو

ولاّتە عەرەبيەكان . چەند هەولّيّك هەيە بۆ يەككرتنى (توجيد) ياساكانى هەموو ولاتەعەرەبيەكان يان هەنديّكيان ، لەو هەولاّنە ئامادەكردنى پرۆژە ياساى عەرەبى يەككرتوو بۆ بارى كەسيّتى پيّك هاتووە لە(٩١) ماددە پرۆژە سيستەمى دادوەرى يەككرتوو پرۆژەيەكى نمونەى بۆ خولێكى راهيّنانى دادوەرانى نەوجەوان لەولاّتە عەرەبيەكاندا [١] و چەندان دانرا و پەرتوك هەيە بانگەشەى ئەم يەككردنە دەكەن.

دەرئەنجام:

لەم باسانەوە كەلەمەو پيّش نوسران لەم بەشەدا دەگەينەكۆمەلّيّك ئەنجام كەگرنگترينيان ئەمانەن:

١– پيّويستە بەراورد كردنەكە هاوسەنگ بيّت بەتەرازووى عەقلّ نەك بەتەرازووى ئەقلّ .

٢– پيّويستە لەبەراورد كردنەكەدا ويست مل كەچى عەقلّ بكريّت نەك بەپيّچەوانەوە تابەراورد كردنەكە خلّتەى دەمارگيرى و چاولێكەرى كويّرانەى تيّدانەبيّت.

٣–پيّويستە وتى وتى كەم بكريّتەوە لەبەرئەوەى بەراوردكردن لەنيّوان دەقەكاندا دەبيّت نەك راڤەكانيان .

٤–پيّويستە بەراوردكردنەكە پاش ليّكوّلّينەوەى هەموو ياسايەك لەياسا پەيوەندى دارەكان و دوربيّت لەياساكانى تر تابەراوردى لايەنە ليّكچوو جياوازەكان دەربكەويّت.

٥– پيّويستە لەبەراورد كردنەكەدا جەخت لەسەر لايەنە جياوازەكان بكريّت لەبەرئەوەى ئەم خالّە تاكە ديدێكى سەرەكى يە بۆ هەلّبژاردنى گونجاوترين.

٦– پيّويستە بەوريای يەوە لەياسا بيّگانەكان ياسا وەربگيريّت تانەوەكو ياسا وەرگيراوەكە لەگەلّ سيستەمى گشتى و داب و نەريت و ريّورەسمى ناو ولاّت دا دژايەتى هەبيّت.

---

١) المجلد العربية للغة والقضاء التي تصدرها الأمانة العامة لمجلس وزراء الدول العربية العدد الثاني السنة الثانية الثانية تشرين الأول / ١٩٨٥

٧- پێوستە لەفیقهی ئیسلامی سود وەربگیرێت پاش چاوپێدا خشاندنەوەی بەبەراورد لەنێوان ڕافیقهیەکاندا دوور لە دەمارگیری پاش لابردن و سڕینەوەی نمونە ڕزیو و پۆرتکاوەکان و ئەو ڕایانەی ناگونجێت مەگەر بۆ ئەو سەردەمەی کەتێیدا وتراوە.

٨- پێویستە کەسی بەراورد کار خۆی پڕچەك بکات بەچەکی کارامەبوون لەزانستە ئامێریەکاندا تائەنجامی بەراوردکردنەکە پڕاوپڕی ئامانجەکە بێت و تەنها فۆرم (شێوە) و ڕوو نەگرێتەوە.

٩- پێویستە لەبەراورد کردندا یاسا وەهمیەکان (نەبوەکان) دووربخرێنەوە وەك یاسای سروشتی و یاسا هەڵوەشێنراوەکان پێویستە بەدوور زانینی بەراورد کردن لەنێوان فیقهی ئیسلامی و ئەو یاسایانەی لەوەوە وەرگیراون [1] چونکە ئەم بەراورد کردنە وەك بەراوردکردنی شتێك وایە لەگەڵ خۆیدا.

١) وەك یاسای شارستانی عیراقی و ئەردەنی و یەمەنی

بیرۆکەی سەربەستی بوونی یان نەبوونی ویست لەبوار و دیدگای فەلسەفیەوە لەسەربنەمای کارو کارتێکراوی فەلسەفی بنیات نراوە کەڕاو بۆچونی فەیلەسوفەکانی یۆنانە پێش زاین لەپێش هەموو یانەوە ئەرەستۆ [1] (الفعل)کار لەزاراوەی فەلسەفیدا واتە: کارتێکردنی شتێك لەشتێکی تردا ،( الأنفعال) یش کاریگەری بوونی شتێکە بەشتێکی ترەوە. ئەم دوو (وتراوەی) ئەرەستۆ چەسپاندنێکی زۆریان هەیە لەدوو بواری تیۆری و پراکتیکی دا لەزۆربەی لایەنەکانی ژیاندا. بۆ نمونە لەچەسپاندنە فیزیایی یەکاندا: وزەی گەرمی کاریگەر لەمەعدەنەکانزاییەکاندا کارە(الفعل) کشانی مەعدەنەکانی و کاریگەربوونیان بەم وزەیە(انفعال)ە کاروەرگرتن. شکانەوەی ئەو شتانەی کەکشاندن هەڵدەگرن (کارە)و وەرگرتنی ئەو شکانەوە و کاریگەربوونی پێیەوە (انفعال) ساردی توند لەسروشتدا کارە (کردارە)بەستنی ئاو وەرگرتنی کارە (انفعال)زۆرلێکردن لەمامەڵە دارای و بابەتە سزاییەکاندا کارە ئەو ترسەی لەزۆرلێکردنەوە دەکەوێتەوە و دروست دەبێت لەکاری زۆرلێکراوەکەداو پێی دەوترێت عەیبی ویست و (انفعال) و و پاڵی پێوەدەنێت کەشتە زۆرلێکراوەکە ئەنجام بدات لەترسی زۆرکەرەکە. هەروەها نمونەی ترمان هەیە لەسەر ئەم کار و کاروەرگتنە لەسروشتدا و لەهەڵسوکەوتە ڕەوا و ناڕەواکاندا ئەوەی بەلامانەوە گرنگە لەم لێکۆڵینەوەیەدا ئەندازەی ڕۆڵی کار و کاریگەری وەرگرتن لەچالاکیە سزای یەکاندا و ئەندازەی ژێرکاریگەر کەوتنی تاوانبار لەسەر بەرپرسیارێتی سزایی، کاتێك تاوانێکی ئەنجام دا لەژێرکارو ژێرکاریگەری کەوتنی فەلسەفیانە.

بۆنمونە ڕۆڵی انفعالی تاوانکار بەهۆی ئەو دیمەنە قێزەونەی ئەوتۆ دەیبینێت خێزانەکەی (هاوسەرەکەی) یان یەکێك لەخزمە نزیکەکانی لەناو تاوانی داوێن پیسیدایە ئەم ، ژێرکاریگەر کەوتنەپاڵی پێوەدەنێ کەزیانکارە پیاوەکە و هاوسەرەکەی خۆی بکوژێت . کەواتە تا چ

---

١) ئەرەستۆ دەڵێت :هەموو بویەك لەگەربوندا دەچێتە ژێر یەکێك لە دەوترلوەکە(کاتیگۆریەکان) کە بریتین لە (جوهر و کارو کارتێکراو چەند و چۆن و کوێ و کەی دانەپاڵ ،بار ، خاوەنێتی) بۆ زانینی ئەمانە بڕوانە (فلسفة المسؤلية القانونية في ضوء المقولات الأرسيطة).

ئەندازەیەك لەیاسای سزایی ئەم هەڵچوون و کارلێکردنە بەبەهانەیەکی سوك یان چاوپۆشی لێکراو دەداتە قەڵەم ؟ ئایا فەیلەسوفەکان و زانایانی یاسا لەم بارودۆخەدا کەسەکە بەسەرپشك و خاوەن ویستی ئازاد دادەنێت کاتی ئەنجام دانی تاوانەکە ، یان بەناچارکراو و زۆرلێکراو دەدرێتەقەڵەم کەهیچ تواناو دەسەڵاتێکی لەڕاستەوخۆ ئەنجامدانی کارە تاوانکاریەکەیدا؟ یان ئەو کەسە لەدۆخێکی (حالة) میانە و ناوەڕاستایە لەنێوان زۆرلێکردندایە یان سەرپشککردن (التحیز) ئەم لەوبابەتانەیە کەدەمێکە زانا فەیلەسوفەکان و یاساناسەکان لەئاینزا فەلسەفیەکانیاندا ڕای جیاوازیان لەسەری هەیە و دەبن بەسێ ئاڕاستەوە.

ئاڕاستەی سەربەستی و ویست و کاریگەرنەبوونی (کارتێنەکرانی) بەهۆی فاکتەر و کارتێکەرە ناوەکی و دەرەکی یەکانەوە.

## ئاڕاستی ناچارکردن و زۆرلێکردنی ڕەها (الجبر)

ئاڕاستەی ناوەنجی (میانڕەو)لەنێوان دوو ئاڕاستە نارەواکەدا . بەپێی ئەوەی لەم پێشەکیەکەدا باسمان کرد سروشتی بابەتەکە دەخوازێت کەلێکۆڵینەوەکەی لەسێ جێباس دا کۆبکەینەوە ، جێباسی یەکەم بۆ ڕای فەیلەسوفەکان و دووەم: ئاڕاستەی زانایانی یاسا ، سێ یەم: بۆ ڕوونکردنەوەی هەڵوێستی فەیلەسوفە موسڵمانەکان.

# جێباسی یەکەم:
# هەڵوێستی فەیلەسوفەکان
# دەربارەی سەرپشك کردن و زۆرلێکردن

ئاشکرایە ئەم هەڵوێستە لەسێ ئاڕاستەدا خۆی دەنوێنێت:

ئاڕستەی هەڵبژاردنی ڕەها

ئاڕاستەی زۆرلێکردنی ڕەها

ئاڕاستەی ناوەندی میانڕەو

کەواتە هەموو هەڵوێستێك لەبابەتێکی تایبەتی دا قسەی لێوە دەکرێت.

## بابەتی یەکەم:
## سەرپشککردنی ڕەها

کۆمەڵێك لەفەیلەسوفەکانی یۆنانی کۆن و فەیلەسوفەکانی سەدەی ناوەڕاست و سەردەمی نوێ بەم ڕێڕەوەدا ڕۆشتووە وەك لەم ڕوونکردنەوەیە دا دەردەکەوێت:

یەکەم:سەربەستی ویست لەفەلسەفەی ئیخریقدا [1] .

أ-لەگرنگترین فەیلەسوفەکانی ڕۆژهەڵاتی کۆن

١- زەردەشت (سەدەی ٧-٦ پ.ن) سەرکردەیەکی ئاینی فارسە کتێبەکەی ناوی ئاڤێستای یاساو (زەند) ئاڤێستایە کەتەفسیری ئاڤێستا دەکات.

٢- بوزا (٥٦٤ - ٤٨٣ پ.ن) نازناوی سەرکردەی ئاینی هیندی کەدامەزرێنەری ئاینزای بوزیە.

---

١) تەماشای الموسعة العربية الميسرة / ل٩٢١

٣- کۆنفزشیوس (٥٥٥-٤٧٩ پ.ن) فەیلەسوفی سینی دەڵێت : ڕێنماییەکان مرۆڤی گەورە دروست ناکات ، بەڵکو تەنها مرۆڤی گەورە ڕێنماییەکان دەکاتە شتێك و تاپەیڕەوی لێبکرێت و کەسانی تر لەسەری بڕۆن.

ب- لەگرنگترین فەیلەسوفەکانی یۆنان:

١- سقراط (٤٦٩ - ٣٩٩ پ.ن) لەقسەکانی :یا ئەوەیە کە بەهێزترین پێی چاکە. هەروەها دەڵێت ڕێز لەیاسا بگرە باستەمکاریش بێت.

٢- أفلاطون: (٤٢٧ - ٣٤٧ پ.ن) ئەو ژیرترین و ڕەوان بێژترین و زاناترین کەسی سەردەمی خۆیەتی.

٣- أرسطو:( ٣٨٤ - ٤٢٢ پ.ن) دامەزرێنەری بیرۆکەی دە گوفتارەکەیە کەوتویەتی : هەرچیەك پەیدابووە دەچێتە ژێریەکێکیانەوە.[1]

ج- لەفەیلەسوفەکانی سەدەی ناوەڕاست

١- فارابی(ت - ٥٩٠ ك) لەدیمەشق ئەسپەردەکراوە ، لەڕەگەزدا فارسە لەبارەی زاتی خواو سیفەتەکانیەوە بیرۆزەو دیمانەی هەیە کەتێکەڵە لە ئاینزا یۆنانیە کۆنەکان و بیروباوەڕە قورئانیەکان و ڕێنمای زانایانی ئیسلامی .

---

١) دەگونجێت بوترێت بەشێوەیەکی گشتی کەفەلسەفەی ئەعزیقی لەبناغەدا ئەوەی سەلماندووە کەمرۆڤ ویستێکی ئازادی هەیە لەوشتانەدا ئەنجامی دەدات لەکردار و گوتار ئیتر ئایا ڕەوا بێت یان ناڕەوا لەلایەن گرانی ئەم ئاراستەیە (ئەفلاتون و ئەرەستۆ ) رایان وایە کەچاکە و خراپە دووشتی ویستین (أرادتیان) ئەفلاتوون دەڵێت مرۆڤ لەهەڵبژاردنی چاکە یان خراپە ئەو تەنها بەپرسە ئاسمان بەرپرس نی یە لەهەڵەکانی . ئەرەستۆ وتی چاکەوخراپە شتێکی ویستین (خۆویستین) ویژدانی مرۆڤ گەواهی ئەوە دەدات هەڵسوکەوتی یاسا دانەران و دابەشکردنی خەڵاتەکان و وازۆکردنی سزاکان و خوێندنەوەی باروئۆخەکانی سەربەستی و ڕۆڕلێکردن و نەزانین جگە لەمانە لەباروو ئۆخە توندەکان یان سوککراوەکان لەگەڵ ئەنجامدانی تاوانەکاندا ، کەوابوو قورس کردنی لەبەر ئەو باروئۆخە توندکراوە کەدەوری تاونکارەکەی داوە لەکاتی تاوانکردنەکەدا یان سوککردنی سزاکە لەبەرسوکی باروئۆخی تاوانەکە بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر ئەوەی کە تاوانبار کاتی ئەنجامدانی تاوانەکەی خاوەنی ویستێکی سەربەست و ئازادی هەڵبژاردنە ئەو سەربەشتە لەبەکارهێنانی هۆشە بیرکارەکەی بۆ ئەندازەگرتن و زانینی ئەنجامی کارەکەی (١١)

(١١) تەماشای الموسعة الفلسفية المختصره ص ١٠٧ د.رؤوف عبيد التسير والتخبير بين الفلسفة العامة و الفلسفة القانون ص ١٠٢

٢- ابن رشد (١١٢٦ - ١١٩٨ ) ئەو بەناوبانگترین فەیلەسوفە موسڵمانە عەقڵ گەراکانە.

٣- القديس أوغسطين (٣٥٤ - ٤٣٠ ز) ئەو دەڵێت : خوا ڕۆژی دەرونە بەڵام نابێت لەمەوە واتێبگەیت کەکوت و بەندێك لەسەربەستی و ویستی مرۆڤ هەیە [1].

٤- ئیبن سینا(٩٨٠ ز - ١٠٣٧ ز) فەیلەسوفێکی فارسی نەژادە و یەکێکە لەپزیشکە هەرەگەورەکان . فەلسەفەکەی بریتی یە لەیەکخستنی شەریعەتی ئیسلامی و فەلسەفەی یۆنانی ، بەڵگەکانی ئەم فەیلەسوفە لەسەربوونی خوا : مرۆڤ ئارەزووی بەختەوەری دەکات بەسروشت و میزاجی ، خواش بەختەوەرییەتی ، مرۆڤ لە عەقڵیدا وێنا ناکات کەکەسێك هەبێت لەخوا گەورەتربێت ، ئەوەی لەڕاستی و واقعدا هەیە گەورەترە لەوەی لەعەقڵدا هەیە بێگومان بوونی خوا خۆی لەخودی خۆیدا ئاشکراو ڕوونە.

٥- توما الأكويني : ( ١٢٢٥ - ١٢٧٤ ز) دەڵێت : بێگومان فەلسەفە جۆرێکە لە مەعریفە ( زانین).

د- لەبەناوبانگترین و گرنگترین فەیلەسوفەکانی سەردەمی نوێ.

١- دیکارت رینیە ( ١٥٩٦ ز - ١٦٥٠ ز) فەیلەسوفی فەرەنسی زۆر دڵسۆزی بیروباوەڕە کاثولیکیەکەی بوو.

٢- نبدکة رو سبنیوزا (١٦٣٢ - ١٦٧٧) لەسەر ئاینی جولەکە بوو خاوەن پەرتووکی (پەیامێك لەچاکسازی عەقڵ دا).

٣- لیبتز (١٦٤٦ ز - ١٧١٦ ز) لەلایەنگران و پشتیوانانی زۆرگەرایی یە دەڵێت: هەموو شتێك مل کەچی ئەو شتەیە کەبۆی دروست کراوە ویستی بەدەستی خۆی نیە.

٤- بیکون فرانیس( ٥٦١ - ١٦٢٦ ز) پێویستە سەرلەنوێ تەماشای هەواڵی پێشین و ڕابوردووەکان بکرێت ئەوشتانە بدرێتە دواوە کەعەقل دەبەستنەوە لەبەرئەوەی سروشتی شتەکان بەپێی چەند یاسایەك جێ بەجێ دەبن ( لەسەر چەند یاسایەك دەڕۆن) پێی وایە هەموو کارێك خۆویستانەیە لەبەرئەوەی ملکەچی بۆ بڕیاری عەقڵ.

---

١) مرسعة الفلسفة والفلاسفة / المرجع السابق ص ٢٢.

٥- لول یوضا (١٦٣٢ - ١٧٠٤ ز) وتویەتی: هەمووکارێك خۆویستانەیە لەبەرئەوەی مل کەچە بۆ داخوازیەکانی عەقلّ.

٦- جۆرج بارکلی ( ١٦٨٥ - ١٧٥٣ ز) لە ایرلندا لە دایك بووە وباوك وباپیرانی لە ئینگلیزە بیروباوەڕ پروتستانتەکان بوون.

٧- دیفید هیوم : (١٧١١-١٧٧٦ز) ئیسکۆتلەندا هاتۆتە دنیاوە کەچی بە فەیلەسوفێکی ئینگلیزی دەدرێتە قەڵەم.

٨- کانت عمانوئیل (١٧٢٤ - ١٨٠٤ ز) فەیلەسوفێکی ئەڵمانی یە پێی وایە کەویست و ئەزموون دوو تایبەتی یەکتر تەواوکەرن.

٩- جۆرج هیگل (١٧٧٠ - ١٨٣١ ز) فەیلەسوفی ئەڵمانی لەگەورەترین فەیلەسوفەکانە کەکاریگەری هەیە لەهەموو سەردەمێك دا.

١٠- برجسون هنری ( ١٨٩٥ - ١٩٤١ ز) لەسەر ئاینی جووەکانە خەڵکی فەرەنسایە و پێی وایە مرۆڤ واهەست دەکات سەربەستە لەکاتی هەر کارێکا ئەنجامی دەدات.

١١- برتراندرسل (١٨٧٢ - ١٩٧٠ ز) فەیلەسوفێکی بەریتانیە، ئەو لەبابەتەکانی ئایندا هەندێ جار خۆی بەتاکێك لەگروپی لا ( نازانم ) دەداتە قەڵەم و هەندێ جاری تر بەنکولی کار.

دووەم: سەربەستی ویست و خواست لەفەلسەفەی ناوەڕاستی نوێدا هەندێك لەگەورە (کەڵە)فەیلەسوفەکان لەسەردەمی ناوەڕاست و نوێدا گرنگیان داوە بە سەلماندنی سەربەستی ویستی مرۆڤانە باتا سنورێکیش بێت و لەسەر ئەم باسە کۆمەڵێك بەڵگەی بەهێزی فەیلەسەفی جۆراو جۆریان هێناوەتەوە و لەو فەیلەسوفانە:-

أ-قەشە أوگستین : ئەم فەیلەسوفە باسی و ویستی مرۆڤ دەکات بەوەی کەتوانای مرۆڤە لەوەرگرتنی وێناکردنی کارلێك دا یان دانەدواوەی داو پێی وایە کەویست یاسایەکی هەیە و پێویستە پەیڕەوی لێبکرێت و ئەو یاسایەکی سروشتی یە پێی دەزانین (ڕێگەی پێدەبەین) کاتێك لەخۆمان و شتەکان ورد دەبینەوە چونکە ئەم نوارین و وربونەوەیە پێمان دەڵێت کەهەموو ئافەرێنراو دروست بویەك چیەتێکی ( ماهیة) جێگیر و سیستەم و ئارەزیەکی سروشتی هەیە بۆ ئامانجەکەی بەڵام بەدیهاتوو (دروستکراو)ی ناعەقڵ بەسروشت و غەریزە ڕوو دەکاتە ئامانجەکەی ، بەڵام دروست کراوی عەقڵ دار بەزانین و

زانست و ویستی ئازادەوە بەرەو ئامانجەکانی دەچێت. کاتێك ئەمەمان زانی ئەرکی سەرشانمانە ڕێزلەم بەپلەدانانە (الترتیب) بگرین لەیاسادا ، بڕیاردان و داواکردنی ڕێزگرتن لە سروشتەکان و یاساکانیان بۆیە بەدیهێنانی یاسای گشتی یە کەوابوو چاکە چاکە لەبەرئەوەی پڕاوپڕی یاسایی گشتی یە ، خراپە کردن خراپە لەبەرئەوەی دژی یاسایی گشتی یە ، مل کەچی و فەرمانبەرداری بۆ یاساچاکەیەو شایەنی پاداشتی باشە ، سەرپێچی کردنی خراپە و نزمی یە سەرپێچی کەر شایەنی سزایە. وپرەسیپی بنەڕەتی بۆیاسای ئاکار (ڕەوشتی) مرۆڤ کرد [1] بریتی یە لەمل کەچ بوونی هەستەوەرەکان بۆ عەقلّ (ئاوەز) و ملکەچ بوونی عەقلّە بۆ خوا بەجۆرێك ژینمان ڕوو دەکاتە ناسینی خواو بەدەست هێنانی لەبەرئەوەی ئەم ئاراستە گرتنە تەنها دانانێکی سروشتی یە.

تاوانکاران دەنگی یاسا دەبیستن لە ویژدانیاندا و هەولّی تاساندن و خنکاندنیان دەدەن بەلاّم سەرکەوتوو نابن. [2] ئەوەی تێبینی دەکرێت لەسەر ئەم یاسایە کەدەلّێت : ویست و خواهیشتی مرۆڤ ئازادیەکی بەستراوەی هەیە ، ویستی مرۆڤ ئازادی پێدراوە بەلاّم پێویستە بەپێی داوای عەقلّ بەکاربهێنرێت، بەپێی ئەوەی کەخوای گەورە دەیەوێت.

ب- دیکارت [3]: ئەو لەو فەیلەسوفانەیە کەبانگەشەی سەربەستی ویست دەکەن ، کەدەلّێت:- شتێکی ئاشکرایە کەئێمە ویستێکی ئازادمان هەیە دەتوانێت شتەکان قبولّ بکات (وەربگرێت) یان بداتە دواوە هەرچۆنێك بمانەوێت ، بەلاّم ئەو پێی وایە دژایەتی ئاشکرا لەنێوان سەربەستیمان و نێوان پێشکەوتنی قەدەردا هەیە (واتە ئەوەی برابێتەوە و نوسرابێت لەسەر مرۆڤ لەکار و کارلێك وەرگرتن ) لەبەرئەمەیە فەیلەسوف گومان دراوەتە قەلّەم (ناسراوە). ئەوەی تێبینی دەکرێت لەسەر قسەکەی (وتەکەی) دیکارت ئەوەیە : ئەو دەلّێت دژایەتی و بەگژیەکداچووندا هەیە لەنێوان سەربەستی و ئێمە و قەدەردا ، واتاکەی بەم جۆرە نی یە کەئەو وێنای کردووە و بۆی چووە، بەلّکو ئەوەیە کەخوای گەورە هەمو

---

[1] ) الوضعي :بەرامبەر قانونی طبیعي یە : سروشتی

[2] ) د.ڕۆوف عبید لەسەرچاوەی پێشوو ل ١٣٣

[3] ) فەیلەسوفێکی فەرەنسایی یە (١٥٩٦ ز – ١٦٥٠ ن)

شتێکی بەقەدەر واتە بەئەندازەو تەرازوو دروست کردووە هەروەك بەدرێژی لەجێی خۆیدا باسی دەکەین بەویستی خودا.

**هەڵسەنگاندنی ئاراستەی هەڵبژاردنی رەها (سەربەستی ویست).**

شتێکی وێناکراوە کەمرۆڤ هەڵبژاردنی رەهای هەبێت لەهەڵسان بەوکارانەی کە پەیوەندیان بەکەسی خۆیەوە هەبێت لەو هەڵسوکەوتانەی کەبەرژەوەندی کەسێ یان سودی خۆیان هەیە یان کۆمەڵایەتی کاتێك مامەڵە دەکات لەگەڵ ئەندامانی کۆمەڵگەکەیدا ، یان کەسانی تردا ، بەپێی هەڵسانی بەوکارەی کەئامانجێکی دروستی (رەوای) تێدایە یان مەبەستێکی جوان و ماقوڵ . ئەمجا بەگوێرەی هەڵسانی مرۆڤ بەکارە خراپەکان یان نارەواکان بەنیازی زیان گەیاندن بەکەسانی تر لەرووی ئەنقەستەوە ئیتر با وەو کارانەلە باسە سزاییەکان یان شارستانیەکان بن چونکە رودانی کارێکی وا بەهۆی ویستێکی ئازادەوە و هەڵبژاردنێکی رەهاوە بێ هیچ کاریگەرێکی دەرەکی یان خۆی کاریگەر کەکاریگەری تێیدا هەبێت پاڵی پێوەبنێت بۆ هەڵسان بەم کارە نارەوایانە کارێکی نەهاتووە یان لەشتە دەگمەنەکانە بەنیسبەت مرۆڤەی هاوسەنگی پابەند بووە لەرووی یاساییەوە لەبەرئەوەی هەموو مرۆڤێك کاتێك کارێکی پێچەوانەی یاسا یان سیستەمێکی گشتی یان رێو رەسمە گشتی یەکان ئەنجام دەدات دەکەوێتە ژێرکارتێکردنی کارێکی دەرەکی و کاریگەری لەسەر دروست دەبێت بەهۆی کارتێکەری خۆی یان دەرەکی لەبەرئەوەی کەسی عاقڵ کاتێك هەرکارێکی باش یان خراپ ئەنجام دەدات لەتوانیادا هەیە( دەتوانێت) پێشەکی (لەپێشدا) سەرئەنجام و دەرئەنجامی ئەو کارە بخەملێنێت کەپێی هەڵدەستێت لەوتار و کردار. بنیات لەسەر ئەم واقیعە راستەبەڵگە نەویستە (البدهی) دەتوانرێت ئەم رەحتانەی خوارەوە ئاراستەی پشتیوانانی ( هەڵبژاردنی رەها و سەربەستی ویست و خوا هیش) بکرێت:-

١- بێگومان ئەم ئاراستە ناوبراوە نەدیو (وهمی) و گریمانەیی و دورە لەواقیع و راستی یەوە بریتی یە لە قسەیەکی هەڵە دواین (الخلف) لە پێشینەوە (السلف)گواستویەتەوە بێ وردبوونەوە و قوڵبوونەوە تێدا و مشتومڕ لەسەر کردنی. مرۆڤی ئاسایی خوای گەورە عەقڵ و هۆشی پێ بەخشیوەو تاچاك و خراپی پێ لێك جیابکاتەوە و ئەندازەی سەرئەنجامەکانی

کردەوە و کارەکانی لەئایندەدا پێ بخەملێنێت . لەبەر ئەمە بەڵکو زیاتر لەمە عەقڵ کراوەتە جێگەی پێ سپاردن و هەڵگرتنی بەرپرسیاری و لێپرسینەوەی سزاییەکانی ئەنجامدانی کارێکی پێچەوانەی شەرع یان یاسا لەلایەن مرۆڤەوە.

٢- ئەو قسەیە کەدەڵێت تاوانکار لەکاتی تاوانەکەدا خاوەنی هەڵبژاردنی ڕەهایەو تاوانەکەی زادەی ویستە ئازادەکەی بووە بێ ئەوەی بکەوێتەژێر هیچ کاریگەریەکی دەرەکی یان خۆیی (ذاتي) قسەیەکە واقعی بەرجەستە بەدرۆی دەخاتەوە بۆ نمونە: ئەو بکوژەی تاوانی کوشتن ئەنجام دەدات لەحاڵی کاریگەری قبوڵ کردن دایەو کارتێکراوە بەسوکایەتی کردن بەشەرەفی یەوە ، ئەو دزەی تاوانی دزی ئەنجام دەدات لەژێر پاڵەپەستۆی هەژاری دا و پێویستی زۆر و پاڵنەری ڕزگار کردنی ژیانی خۆی و ژیانی کەسانێك لەسەریەتی، کەسێك هەڵدەستێت بەکوشتنی کەسێك کەدەست درێژی دەکاتە سەری لەکاتێکدا ئەو ئامانجی پاراستنی خۆیەتی یان ناموسی یان سامانی یان گیان و ناموس و دارای کەسانی تر یان وێنەی ئەمانە لەسەدان هەڵسوکەوتی ناڕەوا لەخودی خۆیدا و بەوکارەی لەلایەن مرۆڤەوە ئەنجام دەدرێت لەژێرکاریگەری و پاڵپەستۆ کارتێکەرە دەرەکیەکان یان خودی یەکان ، چۆن دەوترێت هەریەك.لەوانە (بکوژەکە ، دزەکە....) ئازادو سەربەست بوون لەویست دا و بەئارەزووی خۆیان ئەو کارانەیان کردووە و ژێرکاریگەرەکە و توند بوون و کاریگەر نەبوون بە کارێکی کارتێکەر پێش ئەنجامدانی کارە تاوانکاریەکانیان وەك نمونەی ئەو کارتێکەرانەی لەمەوپێش و ئێستادا باس کران.

٣- سەلماندنی ئەم گریمانەیە بەوەی کەتاوانەکە زادەی ویستی ئازادی تاوانکارەکەیە کۆمەڵێك سەرئەنجامی ترسناکی لێدەکەوێتەوە لەوانە : ئەم گریمانە دەبێتە ڕێگر لەبەردەم ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی زانستی لەلایەن بڕیارەکانەوە لەسەر (دەربارەی)هۆکارە ڕاستەقینەکانی ئەنجامدانی تاوان و تاوانەکان ، هەروەها هەمدیس دەبێتەهۆی پشتگوێ خستنی لێکۆڵینەوەی لایەنی کەسی گومانلێکراو چارەسەرکردنی هۆکارە کاریگەرەکان تێیدا و ئەوەی بۆتە هۆکاری ئەنجامدانی تاوانەکە ،وەپاشان دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی پشێوی و تێکچونی سیستەم کۆمەڵگە بێبەش دەبێت لەگرنگترین ڕۆزیەکانی یان کەئەویش ئارامی و ئاسایشی و جێگیری بارودۆخ و دڵنیایی یە،لەبەرئەوەی گرنگی دانی لێکۆڵەران (بەتاوان) بێ(تاوانکارەکە) واتای گرنگی دانە بە وارس(العَرَض) پشتگوێ خستنی جەوهەر.

کەوابوو تاوانکردن دیاردەیەکی کۆمەلآیەتی یە لەهەموو کۆمەلگەیەکدا دەروونێکی نەخۆشی پێچ پێچی ، (ئالۆزی) لاڕێ بونیشان دەدات ، بەلگەیە لەسەر بوونی کەسێکی نەخۆش کەدژی بەرژەوەندی یەکانی کۆمەلگە کاردەکات ، ئەوەی ترسی لێدەکرێت ئەنجامدانی کارە تاوانکاریەکەیە و پلەی ترسناکی و سروشتی پێك هاتن و دەروونی یەتی و ئەو شتانەی دەوریان داوە لەچەندان کارلێکردن و ئالۆزی و پشێوی. بەپێیە ناتوانرێت ئاسایش و جێگری کۆمەلگا بپارێزرێت گرەنتی و دەستەبەری مافەکان بکرێت مەگەر بەئاراستەکردنی لێکۆلینەوەی زانستی بۆ کەسی تاونکار و پشکنین و ناسین و زانینی ئارەزوو خواستەکان و هۆکارە کاریگەرەکانی سەریان ئیتر ئەو هۆکار و فاکتەرانە کۆمەلآیەتی بن یان ژینگەی یان دەروونی یان جەستەی بن یان وێنەی ئەمانە ، دەرون ئەوەیە نەخۆش و دەردەکە دەست نیشان بکرێت و چارەسەر بکرێت بەو دەرمانەی کەئەم ئەم نەخۆشی یە لەناو دەبات هەموو ئەمە دژایەتی هەیە لەگەلّ بنیات نانی بەرپرسیارێتی تاوانکاری بۆ کەسی تاوانکار لەسەر بنەمای سەربەستی ویست و هەلّبژاردنی ڕەها [1].

١ ) تەماشای پەرتوکەکەی د.علي راشد بکە : فلسفة وتأريخ القانون الجنائي المطبوعة علي الرونيو ل ١٦٥ پاش ئەو .الأستاذ عبدالجبار عريم نظريات العلم الاجرام ل٤٥ پاش ئەو

## باسی دووەم:
## ناچارکردن و سەپاندنی (الجبر المطلق) ڕەها

مەبەست لەسەپاندنی ڕەها یان ناچارکردن ئەوەیە کە هەرشتێك لەمرۆڤەوە دەردەچێت وتە یان کردەوەوە بەشێوەیکی تایبەت بابەتە سزای یەکان هەموو ئەوانە لەژێرکاریگەریی دەرەکی و کارێکی کاریگەردا دەبێت وای لێدەکات بکەوێتە ژێرکاریگەری ئەوەوە و مرۆڤ ببێتە کارتێکراوێکی بەکارهەڵسێت یان ئەو کارئەنجام نەدات لەحاڵێکدا کەهیچ دەسەڵات و هێزێکی نیە. ئەم بارە(دۆخە) چوێنراوە بە پوشێك یان پەڕەمریشکێك بەدەم باوە ، هەروەك دەزانین کەبیرۆکەی سەربەستی ویست و هەڵبژاردنی ڕەها لەهەموو سەردەمە کۆن و نوێکاندا پشتیوانی هەیە هەروەها ئاڕاستەی زۆرلێکردنی ڕەها پشتیوان و لایەنگری هەیە لەفەیلەسوفەکانی گریك و سەردەمەکانی ناوەڕاست و سەردەمی نوێ.

أ- لەپشتیوانانی زۆرلێکران ڕەها و ناچارکردن ڕواقیەکانن ئەوان لەفەیلەسوفەکۆنەکانی یۆنـانن و دامەزرێنـەری قوتابخانەی(ڕواقیـە) فەیلەسـوفی زینـونی ئـەکتیومی یـە [1] فەیلەسـوفەکانی ئـەم فێرگەیـە قوتـابی و شـاگردەکانیان لەهەیوانـدا فێردەکـرد و هـەموو فەیلەسوفێ ڕای وابوو (پێی وابوو) کەبەختەوەری لەچاکەدایە و فەیلەسوف دەبێت گوێنەدات بەوەی کەدەروون پێی دەکات لەخۆشی و چێژ یان ئازار و ئێش لەبەرئەوە هەموو هەیوانیەك (ڕواقی) دەرونی و دڵنیابوو هۆگرو دامەزراو بوو بەهیچ شتێك دڵخـۆش نـەبوو ، بـاکی نـەبوو لەهیچ ناڕەحەتی و کێشەیەك . ئەم بارە ڕای دەکێشا بۆ ئـەو بـیرو بـاوەڕەی کـەپێی وابـوو مـرۆڤ بەشـێکە لەگـەردوون و هەرچیەك لەسروشـت دا ڕوودەدات تـەنها بـەهۆی کاریگـەری عەقڵی گشتی یەوە (العقل الکلی) دەبێت کە گەردوون بەڕێوە دەبات یان قـەدەر لەبەرئـەوە پێویستە لەسەر مرۆڤ کەهەڵسوکەوتی پڕاوپڕی سروشت بکات لەو شتانەیدا کەسروشت پێی دەڵێت و گوێنەداتە سۆز و ئەو بیرۆکانەی (هزرانەی) کەوای لێدەکـەن لەشـارێگەی یاسـایی

---

١ ) زینون الاکتیومی (٣٣٣ – ٢٦٢ پ.ن) لەئەکتیۆم لەدایك بووە کەسەریە قوبروسـە ، قوتابخانـەی ڕواقـی ناوەکەیان لە (رواق) هاتووە کەمانای هەیوانە / تەماشای (الموسوعة الفلسفیة المختصرة) بکە ل ٧٥

سروشتی ( یاسای گەردوون) لابدات. [1] وتویانە:سیستەمێکی ئاکاری لەگەردووندا هەیە پێویستە مرۆڤ ملکەچی بێت تالەژیاندا بەڕاستی ڕێبکات و لەڕێ لانەدت هەروەك وتویانە زەرورەتێکی کوێرانە هەیە کەخواکان و خەڵك ملکەچنی وەکو یەك ، هەروەك هەموو بەدیهێنراوەکان بەگیاندار و بێگیانەوە مل کەچن بۆی بێ جیاکردنەوە. ئەوەی لەسەر ئاراستەی رواقیەکان تێبینی دەکرێت ئەوەیە ناکۆکی و هاو دژی هەیە لەڕاکانیاندا زۆر بەڕوونی لەنێوان ناچار بوونی مرۆڤ بۆ ئەو شتانەی کەسروست پێی دەڵێت ویاسا سروشتی یەکانی بونەوەردا و لەنێوان ناچارکردنی بەو ناونیشانەی کە ئەو بەشێکە لەم گەردوونەو وەك بەشەکانی تری مل کەچی یاساکانە ، هەروەك چۆن ئاژەڵان و ڕووەك و بێگیانەکان مل کەچن.

ب- (أوگست کونت) [2] خاوەنی ئەو ڕێچکە فەلسەفەییەیە کە باوەڕی بەزۆرلێکران ناچارکرانی ڕاها هەیە ، هەروەك ناوبراوە بەئاینزای واقعی کەڕای وایە دیاردە کانی بوون - بەتاوانیشەوە - کەدیاردەیەکی کۆمەڵایەتی یە - بەپێی چەندیاساو ڕێسایەك دەڕوات بەڕێوەو تەنها دیاردە سروشتی یەکان ناگرێتەوە بەڵکو لەدیاردە کۆمڵایەتی یەکانیش دا دەچێت بەڕێوە ، لەوانەتاوان وەکو هەموو دیاردەیەك لەبوونەوەردا دەگەڕێتەوە بۆ فاکتەری جیاجیا کەهەرەکاتێك کۆبوونەوە وادەکەن لەتاوانکار تاوانەکەی ئەنجام بدات ئەوانیش هۆکارە ئاکاری و کۆمەڵایەتی و سروشتی یەکانن ، ئامادەبوونی خودی تاوانکار و ئەو بارودۆخە کۆمەڵایەتیانە وەك نەزانین و خراپی پەروەردە و هاوڕێی خراپ و جگەلەمانە کەیارمەتیدەری ئەون لەهەموو مەرجە سروشتی یەکانی وەك گەرماو سەرما جگە لەهەموو ئەم هۆکارانە پشکێکی گەورە یان لاوازیان هەیە لەڕوودانی تاواندا . کەواتە تاوان هیچ نی یە جگە لەدەرئەنجامی پەیوەستی ، کۆی ئەم هۆکارانە چونکە هەرکاتێك ئەو بارودۆخانەی کەکاریگەرن و ڕۆڵی کارەکە دەبینن هەبوون ئەوا تانکارەکە هەڵدەنێن بۆ ئەنجامدانی تاوانەکە ( واتە وەك فەلسەفە دەڵێت کاریگەری ئەمانە کارەکەی پێ ئەنجام دەدات) .

---

١ ) المعجم الفلسفي / د.جميل صليبا ب / ل٦٢٣

٢ ) (١٧٩٨ ن) فەیلەسوێکی فەرەنسی یە لەساڵی ١٨٢٦ ز کومەڵێك کۆڕ و سیمیناری پێش کەش کرد لەبارەی فەلسەفەکەیەوە (الموسوعة الفلسفية المختصرة المرجع السابق ل ٢٦٦).

کورتەی قسە کاتێك تیۆری ویستی ڕەها و سەرپشك کردنی ڕەها شکستی هێنا لە قەڵاچۆکردنی تاوان و چارەسەرکردنی هاوکارەکانیدا سەرەنجامی خەتی ئەوەبو تاوانکارەکان سوکایەتیان کرد بەدادگەری تاوانکاری و بازنەی تاوانەکان ، فراوانتربون هەروەك لێکۆلینەوە ئامارییەکان گەواهیان بەمەداوە لەلایەن زانا (أنر یکوفری) یەوە ئەنجامدران لەوڵاتی فەڕنسا لەنێوان ساڵەکانی (١٨٤٦ — ١٨٧٨ ن) ، کەلەو کاتەوە بنەمای ناچاربوون سەری هەڵداو تیۆری بەرپرسیارێتی سزایی حەتمی لەسەر بنەمای ڕوخاندندنی پرەنسیپی ویستی ئازاد و بیردۆزی بەرپرسیارێتی سزایی حەتمی کەناوەڕۆکەکەی دەڵێت: تاوانکار تاوانی چاولێکەریانە ناکات بەویستی خۆی بەڵکو ڕا دەکێشرێت بۆ ئەنجامدانی لەزۆربەی کاتەکاندا لەژێرکاریگەری هۆکاری جۆربەجۆردا ئیتر ئەو هۆکارانە خودی بن یان دەرەکی کەلەواقیع و ڕاستی دا دەبنەهۆکاری نەبوونی سەربەستی و هەڵبژاردن یان ویستن و خواهیش ئیفلیج دەکەن.

لەم کاتەدا کۆمەڵگە مافی ئەوەی نیە بەدەس بەستراوی دانیشێت و بێ دەنگ بێت بەرامبەر تاوانبار ، چونکە تارادەیەکی گەورە ئەو بەرپرسیارە لەو هەڵسوکەوتە تاوانکارییەی تاوانکارەکەی تێکەوتووەپاشان ئاوەز پەسەند نیە ڕێگی خاڵی بکرێت بۆ تاوانکار هەرچییەك دەیەوێت بیکات وە بەهەر شێوەیەك ئەنجامی بدات ، چونکە نەهێشتنی تاوان و خۆ پاراستن لێی لە گرنگترین ئەرکە سەرەکیەکانی کۆمەڵگەن ، بەپێی ئەم تاوانکار بە حەتمی بەر پرسیارە بێ هیچ جیا کردنەوەیەك و بارودۆخی کەسی و کۆمەڵایەتی و ماڵی هەرچۆنێك بێت. لەبەر ئەوە ئەو بەرپرسیاریەتیەکە کە ڕاستیەکەی بەرژەوەندی گشتی و پیویستیەکانی بەرگری کۆمەڵایەتیە.

کەوابوو بەرپرسیاریە تیە کۆمەڵایەتیەکە بۆ بەربوون و بێتاون دەرکردنی پێویست بەپەنابردنە برە پرەنسیپی میتافیزیقیانە ناکات وەك باوەڕ بوون بەبوونی ویستێکی ئازاد یان هەڵبژاردنێکی ڕەهاو بەڵکو بۆ ڕاڤەی ئەم بەرپرسیارێتیە ئەوەندە بەسە کەبڵێین تاوانکار —ئەهلیەتی نەبێت — لەکۆمەڵگادا دەژی و بەئەنجامدانی تاوانەکە ڕووی ترسناکی خۆی نیشان دا لەسەر ئاسایشی کۆمەڵگە و شیرازەی کەبەبێ هیچ مشتومڕێك دەتوانرێت پلانی بۆ دابنرێت تا کۆمەڵگە پارێزراو بێت لەزیانی ئیتر چارەسەر و پلانەکان چارەسەری بێت وەك سزاکان یان خۆپاراستن پێش ڕوودان و ئەنجامدانی تاوانەکە یان پاش ڕوودانی . لەم

خستەڕووە کورتەدا دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کەبنەمای بەرپرسیارێتی سزای لەئاینزای فەلسەفەی ڕاستینی مرۆڤ کرددا بریتی یە لەترسناکی نەك گوناه و تاوان ، نەك ویستی ئازاد یان هەڵبژاردنی ڕەها هەروەك لایەنگرو پشتیوانانی ئاینزای فەلسەفی ڕابردوو (كۆن)دەڵێن: کەوابوو ترسناك ترین تاوانبار بەپێی ئەم ئاراستەیە (زۆرلێکردنی ڕەها ) تاوانکارێکە کەوەها لە دایك بووە هەروەك (لومبروزو) [1] وتویەتی لای وایە چارە نیە بۆ لەناوبردن و ڕیشەکێشکردنی بۆ دورخستنەوەی زیانی لەکۆمەڵگە لەهەمان کاتد ( فیزی) پێشنیاز دەکات کەڕای لەگەڵ بیرۆکەی لەناوبردن دا نی یەو ڕای وایە کەدووبرخرێتەوە لەکۆمەڵگە و لێی دابڕدرێت . بەڵام تاونکاری شێت یان عەقڵ نەخۆش دەخرێتە شوێنێك بۆ چارەسەر کردن وەك ئەو نەخۆشخانانەی تایبەت بە نەخۆشی عەقڵی یەکانەوە

واتە: ئەو تاوانکارەی ئومێدی چاك بوونی لێدەکرێت دەنێردرێت بۆ دامەزراوێکی چاکسازیانە. تاوانکاری عاتفی کەبارودۆخەکەی ترسناك نیە تەنها مامەڵەی لەگەڵ دا دەکرێت بە تەکبیرێکی پڕ لەمیهرەبانی و نەرم و نیانی . ئەو بچوکانەی لادەرن (لاسارن) و ترسناکی بۆ کۆمەڵگە دروست دەکەن لەئایندەدا _ ئەگەر وازیان لێبهێنرێت – دەنرێدرێنە قوتابخانەو ڕێکخراوە پەروەردەی و چاکسازیەکان[2] .

ج– لایەنگرانی زۆرلێکردنی ڕەها لەسەردەمی نوێدا فەیلەسوف و نوسەری خوالێخۆش بوو محمد حسێن هیکل [3] لەپەرتوکەکەیدا ( الإيمان والمعرفة والفلسفة) دەڵێت: لەچوارچێوەی کۆمەڵێك دەستەواژەی ڕوون و ئاشکرادا دەریدەخات کە ئەو لایەنگری (زۆری ڕەها ) یەلەم دانراوەی دا دەڵێت : ڕای ئێمە ئەوەیە کەهەڵبژاردن و سەرپشك بوون بەهیچ شێوەیەك لەگەڕدووندا نی یە و هەڵسوکەوتی ئێمە یاسا گەلێکی ڕێکخراون دەیان زانین و کۆمەڵێك ڕێکەوت و شتی لەناکاون کەلەوانەیە بەپێی چەند یاسایەك دەچێت بەڕێوە کەنایان

---

١ ) (١٨٣٥ – ١٩٠٩ ز) بەناوبانگترین زانای ئەنثرولوجي یە لەبارەی تاوانەکانەوە لێکۆڵینەوەی زۆری هەیە دامەزرێنەی قوتابخانەی ئیتالیا یە ئاینزای مرۆڤ کردە و مامۆستای پزیشکی شەرعیەو نەخۆشی یە عەقڵیەکانە.

٢ ) تەماشی مامۆستا علي راشد بکە نوسراوی (الفلسفة وتأريخ القانون الجنائي ) المرجع السابق ص ١٦٧، الأستاذ عبدالجبار عريم نظريات على الاجرام المرجع السابق ل ٤٩.

٣ ) (١٨٨٨ – ١٩٥٦ ز) زاناو نوسەر و فەیلەسوفێکی میسر یە.

زانین کەوابوو کۆمەڵێك هێز هەن کاریگەریان لەسەر ژیان هەیە و زاڵن بەسەر سەربەستی پاژی و (الجزئية) خودی گیانی ژیاندا کەواتە ئەم گیانەو ئەو هێزە ناچار کراون لەهەموو ئاراستەکانەوە ئیتر لەرووی پێك هاتنی راستەوخۆی یەوە بێت یان لەرووی بارودۆخە دەرەکی یەکانەوە کەبەشێوەیەکی کاتی لەناویاندا دەژین و ئەویش دەکەوێتە ژێرکاریگەری کۆمەڵێك فاکتەر کەهیچ رۆڵێکیان تێدا نیە، ئەگەر گریمان کاریگەریشی هەبێت ئەوا لاوازە تا پلەی نەبوون ئەم سەربەستی یە جوزئی یەی کەباوەڕمان وایە خاوەنێتی و بەپێ خواستی ئەو دەجولێنەوە لەژیانی رۆژانەماندا هیچ بوونێکی نیە تاکو دەڵێت: بێ گومان ئەو فاکتەرانەی کەکاردەکاتەسەر ویست و هەڵی دەسورێنێت لەناوەندەکاتی و شوێنی یەکاندا ، بریاری بۆماوە و نەریت و رێکەت ئەوانە کاردەکاتە سەر ژیان و ویستمان و ئەوانەش دەکەونە ژێرکاریگەری کردارەکانمان ە دەگوێزرێتەوە بۆ ئەو نەوەی پاش ئێمە کە دەبێتە کەهەڵگری رابردووی درێژی مرۆڤایەتی، یە و کاریگەری لەسەر ئەم نەوە نوێ یە هەیە. هەرتاکێك لەئێمە جێدێڵێت لە ناو جەرگە و ناوەندی جیهانی گەورەدا وەك هەر گەردێك لەگەردەکانی لەچوارچێوەی سیستەمێك دا بەرێوە دەچێت کەمل کەچی کۆمەڵێك یاسای نەمرەو ناتوانێت نەسود نەزیان بۆ خۆی رابکێشێت.[1]

### هەڵسەنگاندنی ئاراستەی ناچاری رەها

ئەم رێچکە فەلسەفیەی کەباوەڕی بەزۆرلێکردنی رەها و ناچارکردنی رەهایە لەکردەوەکانی مرۆڤدا لەچاکەو لەخراپە و بەتایبەتی کردەوە تاوانکاریەکان : فەزاڵێکی گەورەی لەژیانی کرداری مرۆڤ و کەمردنەوەی رووداوە تاوانکاریەکانی نێو جیهاندا هەیە ، بەهۆی ئاراستەی تێروانینی لێکۆڵەرەکان بۆ گرنگی دان بە خودی تاونکارەکە و لێکۆڵینەوەی بەلێکۆڵینەوەیەکی زانستی دروست لەهەموو لایەکانی پەیوەندی دار بەتاکەوە چ لەبواری جەستەیی یەوە یان دەرونی یەوە یان کۆمەڵایەتی و عەقلی یەوە دەبێت. بێگومان ئەم ئاراستە فەلسەفی یە دەنگدانەوەیەکی گەورەی هەبوو لەدارشتنی یاسا تاوانکاریە نوێکاندا لەرووی بەهەند وەرگرتنی بارودۆخە تایبەتەکاندا بۆ هەموو تاوانکارێك و

---

١ ) نقلا عن رؤوف عبيد / المرجع السابق ل ٢٠١ پاش ئەو.

وەستاندنی جێبەجێ کردنی سزاکان بەنیسبەت هەندێ لەتاوانکاران و دانپێدانانی زانایانی یاسا سزای یەکان بۆ سزا ماوە نادیارەکان و پشت بەستن بەئامرازە چاکسازیەکان بەپێی (بالنسبة)لادانی نێوجەوانان و گرنگی پێدانیان بەچاککردنی تاوانکارانی خوگرتوو بەتاوانەوە ، هەروەها دانانی سیستەمە خۆپارێزیەکان و چارەسازی یە بەدەست هێنراوەکان (الاحـران) و چاودێری گومانلێکراوان و دەربەدەران سەرەڕای داهێنانی بیرۆکەی سزای دارایی (سزا پارەییەکان) لەبری سزاکانی تر پاشان بەڕاستی ئاراستەی ناچاری ڕەها (الجبر المطلق)چاکەیەکی گەورەی هەیە بەشێوەیەکی ڕاستەو خۆ لەبەرەو پێش بردنی بەندیخانەکاندا و گۆڕینیان بەکۆمەڵێك خوێندنگای چاکسازی لەسەر ئەو بنەمایە کەسزاکان ئامێرگەلێکن بۆچاککردنی تاوانکار ، نەك ئامێرانێکی تۆڵەسەندنەوەلێی یان بۆ سڕینەوەی تاوانەکانی وەك لەڕابردوودا. بەڵام لەگەڵ ئەم خاڵە ئەرێنی و پۆزەتیڤانەدا بێگومان ئاراستە ( ناچاریی ڕەها ) هەندێ تێبینی و ڕەخنە رووی تێدەکات وەك.

١- هەندێ لیکۆڵەرەوەو فەیلەسوف و زانایانی یاساو کۆمەڵناسی و دەروونزانی ئەو گومانەیان بەرپەرچ داوەتەوە کە دەڵێن:تاوان دەگەڕێتەوە بۆ ئامادەبوونی سروشتی لای تاونکار .

٢-لێکۆڵەرەکان ڕەخنەیان لەبیرۆکەی تاوانکاری بەسروشت گرتوە هەروەك نکۆڵیان لەتایبەت مەندی و نیشانەکانی کردووە کەزانا (لوبروز) و بانگەوازی بۆ کردوون.

٣-بێگومان ڕەخنەی توند ئاراستەی بیرۆکەی بەرپرسیاری سزای لەسەر تەنها ئەنجامدانی کاری بەرجەستەیی و ترسناکی تاونکارەکە لەسەر کۆمەڵگا بێت بەبێ لەبەرچاوگرتنی سەرپشك بوونی تاوانکارەکە کاتی ئەنجامدانی تاوانەکەی و شایستە بوون و توانا بوونی لەبەراوردکردنی چاکە و خراپەدا .

٤- ڕەخنە دەگیرێت لەو قسەیەی کەدەڵێت : تاوانکار تەنها ئامێرێکە بەدەستی بارودۆخەکان و کاریگەریە جۆربەجۆرەکانەوە و کە بەرەو تاوانەکە بەرێیان کردووە و تاوانکارەکە ناچارکراو زۆرلێکراو بووە نەك سەرپشك کراو (مختار) بەهۆی کارو کارتێکردنی هۆکارە زۆرکاریەکانەوە و ویستی ئەو کاریگەرە بووە بەو هۆکارانە بەجۆرێك ئیفلیج بووە و توانای بەرگری نی یە .

٥- ئەگەر سەلمانمان کەتاونکار لێهاتووی و شایستەیی نی یە لەبەرشێتی یان بچوکی یان وێنەی ئەمانە نەی دەتوانی زاڵبێت بەسەر هێزی ئارەزویدا و سودی لەهێزی عەقڵی خۆی وەرنەدەگرت و دەکەوتە ژێر کاریگەری کارکەرە جۆربەجۆرەکان ، هەرچیەك سۆز و هەستە ئاڵۆزە و جیاوازەکان پێیان دەووت هەڵدەستا بەجێبەجێ کردنی و ملکەچی کارلێکردنەکانی نەستی بوو، بێگومان ئەم قسەیە ناچەسپێت بەسەر کەسێکی ئاسای دا کەساغ بێت و خاوەنی هێزی عەقڵی خۆی بێت لەبەرئەوەی واقع پێمان دەڵێت بەئاشکرای کەئەو کارەکانی بەویستنی ڕووت و هەڵبژاردنی خۆی جێبەجێ دەکات لەکاتێك دا دەتوانێت تارادەیەك بەرگری کارکەرەکانی خراپەو خراپەکاری بکات و لەوروژاندنیان دوور بکەوێتەوە .
کورتەی قسە ئەوەیە : کەمرۆڤ هەرچەندە بکەوێتە ژێرکاریگەری کارەدەرەکیەکان یا خوددیەکان وە کاریگەر بوونی لەهەر پلەیەك دابێت بەکاریگەرە (کارتێکەرە ) دەرەکی یە یان خوددی یەکانەوە ، بێگومان بارودۆخی مرۆڤ لەهەموو بارەکاندا ناگەیەتە پلەیەك کەهەموو سەرپشکی یەکی بەتەواوی لێ دابڕێنرێت و ویستی ئیفلیج بێت بەجۆرێك نەتوانێت ئەنجامی کارەکانی بخەملێنێت (دیاری بکات) چ کاری خراپ چ کاری چاکە.

## داواکەی سێیەم:
## ئاراستەی ناوەندی میانڕەو

هـــەوڵی زۆر دراوە بـــۆ یەکخســـتنی نێـــوان زۆرگـــەری و سەرپشـــککردن لەلایـــەن فەیلەسوفەکانی هەردوو سەردەمی ناوەڕاست و نوێوەلەدیارترینی ئەم فەیلەسوفانە :

١– فەیلەسوفی قەشـە(توما الاکوینی):[1] لـەبارەی زۆرکـردن و سەرپشـککردنەوە ئـەم فەیلەسـوفە دەپرسـێت ئایـا سەربەسـتی دەخوازێـت کـەکاری ویسـت لەبناغـەدا لـەوەوە سەرچاوە بگرێت ، بەڵێ بێگومان ئەمە وتراوە بەڵام ڕاست نی یە لەبەرئەوەی خوا بزوێنەری یەکەمـە کەهــەر هێزێـك دەجولێنێـت بـۆ کارەکـەی کـەوابوو خــوا ویسـت دەجولێنێـت بەلارکردنەوە و ئارەزوو پێدانی لەڕووی هەناوەوە بـەڵام ئـەم جوڵاندنـە ناچـارکردن نـی یـە (زۆرلێکـردن نیـە) لەبەرئـەوەی زۆرلێکراوەکەیـە (ناچـارەکراوەکە) دژی ئـارەزووی خـۆی دەجولێت: خوای گەورەش ویستەکە دەجولێنێت بەوجۆرە ئارەزوو گەرایشی تایبەتی خۆی پێدەبەخشێت و ئەویش لەلایەن خۆیەوە دەبزوێت لەبەرئەوە پاداشت و سزا لاناچن بـەڵکو کاتێك لاچونی سزا پێویست دەبێت یان پاداشت ئەگەر ویستەکە لەلایـەن خـواوە بزوێنرێـت نەك خـۆی لەخۆیـەوە ببزوێـت. پاشـان بـەردەوام دەبێـت لـە قسـەکانیدا : بێگومـان مـرۆڤ بەئارەزووی خۆی خۆی دەجولێنێت بۆ کارکردن بەڵام پێویست ناکات بۆ بوونی هەڵبژاردن و سەرپشـککردن کەهەڵبژێردراوەکە تەنها هۆکـاری یەکـەم بێـت بـۆ خـۆی هـەروەك پێویسـت ناکات بۆ ئەوەی شتێك ببێتە هۆکاری شتێکی تر کەئەو هۆکارە فاکتـەرە یەکەمەکـەی بێـت ،کەوابوو خوا هەروەکو بەجوڵاندنی هۆکارە سروشتی یەکان ئەوە زیاد ناکات کـە کارەکـانی سروشتی بن ، هەروەها بە (هەمان شێوە) یە بزواندنی هۆکار خۆویستەکان ئەوە زیاد ناکات کەکارەکانی خۆویست بن ، چونکە هەموو شتێك بەپێی سروشتی شتەکە هەڵدەسوڕێنێت ، لەکۆتایدا دەڵێت : سەربەستی ئێمە لەزاڵ بونمان بەسەر بڕیارەکانمانـدا کـورت هەڵدێنێت ،

---

١ ) یەکێکە لە فەیلەسوفە دیارەکانی سەدەی ناوەڕاست لە ئەوروپا لە ساڵی (١٢٢٥ ز –١٢٧٤ ز)

زاڵ بوونمان و دەستەڵاتدار بوونمان بەسەر بڕیارەکانماندا کورت دەبێتەوە [1] (کورت هەڵدێنێ) لەزاڵ بونمان بەسەر ئاگاداربونەوەماندا.

٢- هۆبزتۆماس: [2]

ئەم فەیلەسوفە لەبارەی سەربەستی و ویستەوە دەڵێت: وشەی (حُر) ئازاد دەچەسپێنرێت (پیادەدەکرێت) بەپیادەکردنێکی (تەواو) بەسەر مرۆڤ و کردەوەکانیدا نەك بەسەر ویستیدا کەهیچ نیە جگە لەئارەزووی کۆتایی لەپرۆسەی بیرکردنەوە و ڕاماندا و مرۆڤ ئازادە ئەگەر پاڵپەستۆ لەسەر کردەوەکانی نەبێت لەگەڵ ئەوەش دا کارەکانی زەرورەتێکەوە کراوە لەبەرئەوەی هەموویان هۆکاری خۆیان هەیە با ئەم کارانەش ئازاد بن لەبەرئەوە کە وشەی (عَرضي) نەك وشەی (خرة) ئازادی بەرامبەرە لەگەڵ وشەی (ضرورية) پێویستیدا . [3]

٣- نیولا مالبرانش:-

ئەو پێناسەی ویست دەکات بەوەی کەبریتی یە لەخۆشەویستی چاکە لەهەموو شتێکدا. وەئێمە لەهیچ شتێك ناکۆڵینەوە مەگەر ئەو شتە کەلەڕاستیدا چاکەبێت یان وادەربکەوێت و ئەم خۆشەویستی یە خودا لەئێمەدا بچەسپێنێت ، کەوابوو ویست ئەو کاریگەریە بەردەوامەیە (پەیوەستە) کەلەبەدیهێنەری سروشتەوە دەردەچێت و ئاڕاستەکەری دەرونەبەرەو چاکە بەشێوەیەکی گشتی . مادام بابەتی ویست چاکەیە مرۆڤ لە توانایدایە کەبەرگری و ڕێگری بکات لەخۆشەویستی واتە چاکەیەکی پاژی(جزئی) لەبەر کورت هێنانی چاکە جورئیەکان (پاژیەکان) لەلەخۆگرتنی خۆشەویستی دا و ڕازی کردنی ویستی بێ سنوریدا، ویست تەنها کارێکی فۆرمیە(ڕواڵەتیە) یان کارێکی ناوەکی لەبەرکاری خراوە لەو ڕووەوە کە تەنها خوا بکەرو ئەنجامدەری کارە، هەرخوایە ویستەکانی مرۆڤ بەدی دێنێت، بیرۆکەی چاکەی بەشی(پاژی -الجزئی) مان بۆ وێنە دەکێشێت و بەئاڕاستەی ئەو پاڵ مان پێوە دەنێت، کەوابوو نەفس هیچ کارێکی بۆ نامێنێتەوە ئەگەر پرسییان چۆن تاوان بدەینە

---

١ ) د. ذکریا إبراهیم / مشکلة الحریة / چاپ ٢ ل ١٦٠ - ١٦١

٢ ) (١٥٨٨ - ١٦٧٩ ) لەلایەنگرانی یەکخستنی ئاڕاستەی زۆر و شرشکردنە.

٣ ) الموسوعة الفلسفیة المختصرة سەرچاوەی پێشوو ل ٣٨٩

پاڵ خوا دەڵێیت بێگومان تاوانکار هیچ ئەنجامنادات لەو ڕووەوە کەخراپی نەبوونە (عدم) بەڵکو ئەو لای چاکەی جوزئیدا دەوەستێت نەك وەستانی پاڵ پێوەنانی خواو ئاراستەکردنی پێویستی بەبەخشینی کارینە . پاشان دەڵێت: عەقڵ دەنگی خوایە لەناوماندا و هەرکەس گوێی بۆ شل ناکات دەکەوێتە وێرانکردن و هەڵەو تاوانەوە [1]مرۆڤ .بریاردەدات بەسەر شتەکاندا بەعەقڵی (وێڵی) تایبەتی خۆی نەك بەو عەقڵە هەمەکی یەی (الكلي)کەتیاماندا هەیە و خوای گەورە بەتەنها هۆکاری ڕاستەقینەیە (الحقيقيه) ئەم هۆکارە ناگونجێت کەهێز و تواناکەی خۆی ببەخشێتە دروست کراوەکان .

٤- کانت یان کنت یان کانط[2]ی فەیلەسوف

ئەو لەهەموو فەیلەسوفەکان زیاتر هەوڵی یەکخستنی نێوان ئاراستەی زۆرلێکردن و سەرپشککردنی داوە ، ئەو ڕای وایە کەبەگژداچوون و ناسازگاری لەنێوان سەربەستی و (ئازادی) زۆرلێکردندا دەگونجێت چارەسەر بکرێت بەگەڕانەوە بۆ ئەو جیاوازی خستنە بەناوبانگەی نێوان دیاردە مل کەچەکانی کات وشوێن و نێوان ئەو ڕاستیانەی کەلەکات و شوێن بەدەرە، کەوابوو ژیانی مرۆڤایەتی لای ئەم فەیلەسوفە(پێتۆڵە) دولایەنە (دوایزمانەیە) لەبەرئەوەی لەوێ بوونی بەرهەست کەوتوومان هەیە کەلە کۆمەڵێك و زنجیرەیەك لەکردارە دەرەکیەکاندا خۆی دەنوێنێت و ئەمانەش دەچنە ژێرجیهانی ئەزموونەوە ، ئەم کردارانەش لەبەرئەم هۆیە پێکەوە بەندن وە لەدیاردەکانی تر بۆ گونجاندن و ڕێکەوتن بۆ یاساحەتمی بوون و لەم بوارەوە دەگونجێت مرۆڤ تەنها دیاردەیەك بێت و لەلایەنێکی ترەوە بێگومان کردەوە دەرەکی یەکانمان تەنها چەند هێماو (سومبولێکن) یان ڕواڵەتێکن ناخمان دەردەبڕن و خودمان دەخەنەڕوو ئەم خودەش لەکات وەخت دا نەشاردراوەتەوە بەڵکو زاڵ و بەرزترە لەکات ، کەواتە ئێمە ملکەچین بۆ یاساکانی زەرورەت لەو بوارەماندا کەمل کەچی کاتە و لەجیهانی ئەزموندا دێتەدی [3]

---

١ ) جیاوازی نێوان (خطأ و خطيئة) ئەوەیە : خطأ واتە وێناکردنی شتەکان نەك لەسەر ڕاستەقینەی خۆیان ، ئەم لەهەموو مرۆڤێك ڕوو دەدات (خطيئة): واتە ئەنجام دانی کارێك پێچەوانەی شەرع بێت یان یاساو پێغەمبەران پارێزراون لێی.

٢ ) ل (١٧٢٤ – ١٨٠٤ ن)

٣ ) د.ڕؤوف عبيد / سەرچاوەی ڕابردوو ل ٢٣٥.

دەرئەنجام:-

لەڕاوبۆچونی ئەم فەیلەسوفە ناوبراوانە و فەیلەسوفانی تریش، لەلایەن گرانی یەکخستنی نێوان سەرپشك بوونی ڕەها و زۆرلێکردنی ڕەهاو وەرگرتنی ناوەندی میانڕەو لەنێوان ئەم دوانەدا دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کەمرۆڤ پەیداکەرەو بەهەڵبـژاردن و ئارەزووی خۆی ڕاستەوخۆ هۆکارەکان دەخاتەکار و خوای گەورەش تەنها دروست کەرە بەرهۆکارەکان(المُسَبَبات) دەخولقێنێت پاش دەستپێکردنی هۆکان کاتێك کەپێك تـوخمی هەبوون و بەرگرەکان لەڕێدا نەمان ،کەوابوو مرۆڤ ئەنجامدەری خراپەیە و لەبەردەم یاسای شارستانی یان تاونکاریدا بەرپرسە لەبەرئەوەی هۆکارەکانی بەکارهێناوە بەویستی خۆی هەروەك شایستەی پاداشتە لەسەر کردەوە چاکەکانی لەبەرهەمان هۆ، بەپێی (ئەم بنەمایە) هیچ جیاوازیەك بەدی ناکەین لەنێوان ڕای ئەو فەیلەسوفانە و نێوان بیروڕای ئەو فەیلەسوفە موسڵمانانە ئەشعەریانەی ڕێگەی ناوەڕاست و میانەیان هەڵبـژاردووە لەنێوان هەردوو فەلسەفەی (جەبری) وقەدەریەکاندا ، خوا یار بێت لەشوێنی تردا ئەمە زیاتر ڕوندەکەینەوە.

# جیّباسی دووەم:
# هەڵویستی یاسازانەکان دەربارەی سەرپشك بوون و زۆرلێکردن

شتێکی ئاشکراو ڕوونە کەپایەگشتی یەکانی هەموو تاوانێك بریتی یە لە سێ پایە:- پایەی شەرعی و ماددی و مەعنەوی

یەکەم: پایەی شەرعی: ئەویش بریتی یە لە سیفەتێکی نادروست بۆ ئەو کارەی کەهەڵگریەتی کاتێك ئەم دوو مەرجەی خوارەوەی تێدابوو. یەکەمیان : ئەبێ ئەم کارە ملکەچی دەقێکی تاوانکاری کەیاسا بڕیاری سزای تێدا دەدات بۆ کەسێك ئەنجامی دەدات دووەمیان: نەکەوێتە ژێر( نەچێتە ژێر) هۆکارێك لەم هۆکارەکانی بەڕەوا دانان .

دووەم: پایەی ماددی:بریتی یە لەو ڕواڵەتە ماددیەی کەشتەکە لەجیهانی دەرەوەدا دەخاتەڕوو ئەم پایە لەسەر ئەم سێ بەشە وەستاوە:

أ- کردەوەی تاوانی (الجرمي): ئەو چالاکی یە پۆزەتیفە ئەرێنی یەیە یان ئەو هەڵوێستە خراپەیە(نەرێنی)یە کەتاوانکاری پێ تاوانبار دەکرێت و دەدرێتە پاڵی.

ب- ئەنجامی تاوانکاریانە: بریتی یە لەکاریگەریی دەرەکی کارە تاوانکاریەکە کەدەست درێژکردن سەر مافێکە یاسا دەیپارێزێت .

ج- پەیوەستی هۆکاری( العلاقة السببية) بریتی یە لەپەیوەندی نێوان کارو ئەنجام بەجۆرێك دەیسەلمێنێت کەسەرهەڵدان و ڕوودانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەنجامدانی کارەتاونیەکە.

سێ یەم پایەی مەعنەوی : ئەمیش پێی دەگوترێت( ویستی تاوانبار) کەلەگەڵ کارەکەدایە جا ئەگەر شێوەی ویستی تاونکاری وەرگرت ئەوا تاوانەکە بەتاوانی ئەنقەست (عمدی) دەناسرێت، ئەگەر خۆی لەشێوەی هەڵەدا نواند ئەوا تانەکە بەنائەنقەست یان بەهەڵە دەناسرێت. وەهاش گریمانە دەکرێت لەهەموو پایەیەکی مەعنەوی دا کەتاوانکار بەپێچەوانەی بڕیارەکانی یاسادانەر یان قەدەغەکانی هەڵسوکەوتی کردەوە وەلەسەر ئەم بناغەیە (سەرزەنشتی) ویست دەکرێت لەڕای گشتی دا لەڕوویەکەوە و لەڕوویەکی ترەوە

پرسیار لەخاوەنەکەی دەکرێت وەك سزایەك کەبۆچی بەوشێوەیە ویستی خۆی ئاراستەکردووە لەکاتێك دا دەیتوانی بەشێوەیەکی پڕاوپڕی داواکاریەکانی یاسادانەر و قەدەغەکانی ئاراستەی بکات . بناغەی لێپرسراویەتی سزایی کەدێت بەبیرو زەینی مرۆڤدا بونی سەربەستی هەڵبژاردن بۆ ئەنجامدەری کاری تاوانییە، چونکە وادانراوە و گریمانەکراوە کەتاوانکار بواری هەبوو کەیەکێك لەو دوو ڕێیە هەڵبژێرێت:– ڕێگەی گونجاو لەگەڵ یاسا و ڕێگەی پێچەوانە و دژی یاسا لەسەر بناغەی ئەم ویستە سەربەستەی کەتاونکار هەیەتی پێویست بوو لەسەری کەبەشی یەکەم هەڵبژێرێت. بەڵام بابەتی سەربەستی ویست یان هەڵبژاردن یاسا زانەکان ڕای جیاجیان هەیە وەك فەیلەسوفەکان لەم بوارەدا و لەسێ ئاراستەی جۆراو جۆردا دەردەکەون: هەیانە دەڵێت مرۆڤ خاوەنی ویستی ئازاد و هەڵبژاردنی ڕەهایە و بەشێکی تریان ڕایان وایە کەمرۆڤ ناچار کراوو زۆرلێکراوە لەکارەکانیدا، گروپێکی تریشیان (گروپی سێ یەم) هەوڵی گونجاندنی نێوانی ئەو دوو ئاراستە پێشووە دەدات واتە : لەسەر ئەم پێشەکی یەو لەدیتگای ئەم دەست پێکەوەی وتمان بابەتی پەیوەندی دار. بەلێکۆڵینەوە دەبێت بەسێ لقەوە ، یەکەم تایبەتە بەڕێچکەو ڕاڕەوی سەرپشك کردن و هەڵبژاردن ، دووەم: ڕاڕەوی زۆرلێکردن و ناچارکردن، سێ یەم : گونجاندنی نێوان هەردوو ڕێچکەکە.

## داواکاری یەکەم:
## ڕێچکەی سەربەستی هەڵبژاردن

سەربەستی هەڵبژاردن ڕێچکەی چاولێکەری یە (التقليدي) لەدیاریکردنی بناغەی لێپرسراویەتی سزاییدا بۆ ئەنجامدانی تاوانەکان ، پشتیوانیانی ئەم ڕێبازە پییان وایە کە تا وانکار بەرپرسە لە تاوانەکەی لەبەرئەوەی بواری هەبوو دەیتوانی پێش ئەنجامدانی تاوانەکە ئەوە بزانێت کەتاوانەکەی ترسناکی و زیانی بۆ تاك و کۆمەڵگە هەیە ، هەروەك دەیتوانی کەبەراوردی چاکی و خراپی ئەنجامدانی کارەکە یان نەکردنی بکات و ئەنجامەکانی کارە تاوانکاریەکەی بخەملێنێت و لەدوایيدا یان کارەکە بکات یان وازی لێ بێنێت و پێی هەڵنەستێ ، ئەم بەڵگەیە لەسەر ئەوەیە کەتوانا زەینی یەکان و ویستە سەربەستەکەی بەو شێوەیە بەکار نەهێناوە کە یاسا دانەر نەخشەی بۆ کێشاوە و بەرژەوەندی کۆلگە

دەیخوازێت . لەسەر ئەم بناغەیە بە لێپرسراوی دەزانێت لەروی سزادانەوە لەسەر ئەو ڕێژەوەی گرتویەتی و شایستەی سزای گونجاوە بە ئەندازەی قەبارەی تاوانەکەی. ئەم قسەیە بەرهەمەکەی ئەوەیە کە ئەگەر کاتێك سەرپشکی ویست نەما بەڵگەیەك نامێنێت بۆ بەرپرسیاریەتی سزادانەوە . وە ئەگەر ئەم سەرپشکی یە کەموکوری بەسەر داهات ئەوا دەڵێت :ئەم لێپرسراویەتیە پێویستە سوك بکرێت ، مەبەست بەسەرپشکی لە هەڵبژاردندا (الإختيار) توانابونە بەسەر لە نێوان هۆکارە جیا جیاکاندا وئاراستەکردنی ویستراو بەپێ ی یەکێکیان واتە: توانای تاوانکار لەسەر بڕینی ڕێگەیەك کەپڕاوپڕی یاسا بێت یان پێچەوانەی و بەچاك زانینی ئەوەی دوایی .وەشایانی باسە ئەم هێزە (توانا) پێوانە دەکرێت لەگەڵ ئەندازەی توانینی تاوانکارەکەدا لە بەرگریکردن و ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو پاڵنەرانەی کەپاڵی پێوەدەنێن بۆ بڕینی ڕێگەی تاوانەکە. کەوابوو ئەگەر هاتوو ئەم توانابوونە لای توناکار هەبوو سەرەڕای ئەم بوونەش نەویست بەکاری بێنێت و مل کەچی پاڵنەرەکانی خراپەبوو ئەوا بەسەرپشك و بەرپرسیار دەدرێتەقەڵەم لەکارە ناتاوانکاریەکەیدا . وەبەوئەندازەیەی توانای سەرپشکبونی کەم دەبێتەوە ، بەهەمان ئەندازە بەشی کەسە تاوانکارەکە لە سەربەستی کەم دەبێتەوە و لەبەرپرسیارێتیەکەی دا دەشکێت زۆربەی بەڵگەکانی پشتیوانانی سەرپشکبون لە هەڵبژاردن ئەمانەی خوارەوەن:-

أ- بێگومان سەرپشکی هەڵبژاردن تەنها بناغەیە بۆ لێپرسراویەتی سزایی لەبەرئەوەی ئەم بەرپرسیاریەتیە لە جەوهەرەکەیدا سەرزەنشتیکردنە لەپێناوی بڕینی ڕێگەیەکی پێچەوانەی یاسادا و جێگەی سەرزەنش بوون نیە مەگەر کاتێك کەتاوانکار بتوانێت ڕێگەیەکی تر بگرێت بەڵام ئەگەر ڕێگە دژبەیاساکە بەسەر تاوانکاردا سەپێنرابێت ئەوا هیچ بەرپرسیاریەتیەك ڕوو ناکاتە تاوانکارەکە.

ب- سەرپشکی هەڵبژاردن وەکو یەکێك لەوبیروباوەڕانە وەهایە کەلەکۆمەڵگا بڵاوە و هەژمونی (دەستەڵاتی) بەسەر بیرکردنەوەی خەڵکدا هەیە ، بڕیاردانی بەسەر تاوانکارەکەدا دیاری دەکات ، شتێکی ئاشکرایەکە پێویستە یاسا ئەم بیروباوەڕە دەربڕێت و دەنگ دانەوەی بڕیاری کۆمەڵگابێت.

ج- ڕێچکەی سەرپشکبوونی هەڵبژاردن لەگەڵ ئەرکی کۆمەڵایەتی سزادا ڕێك دەکەوێت (سازە) لەبەرئەوەی ئەگەر مەبەستی سزادان ڕازی کردنی دادگەری و بەدیهێنانی بەرپەرچ

دانەوەی توندی تایبەت و گشتی بێت و دادگەری بەدی نایەت مەگەر کاتێك سزای کەسێك بدات کەشایستەیەتی لەبەرئـەوەی ڕێگـەی گرتویەتەبـەر جێگـەی سەرزەنشـکردنە.هەروەك بەرپەرچ دانەوە بەهەردوو جۆرەکەیەوە وێنا ناکرێت مەگەر بـەگوێرەی کەسێك کـەخاوەنی سەرپشـکی هەڵبژاردنـە بـەجۆرێك کەهـەژموونی بەسـەر هەڵسـوکەوتەکانیدا هەیـە وخـۆی پابەنددەکات بەهەڵس و کەوتی پڕاوپڕ لەگەڵ یاسا دا. [1]

## نرخاندنی ڕێچکەی سەرپشکی هەڵبژاردن:-

هەمان ڕەخنە ڕووبەڕووی ئەم ڕێچکەیە دەبێتـەوە کـەدەگونجا ئاراسـتەی پشـتیوانانی سەرپشککردنی ڕەهاو سەربەستی ویست بکرێت لەلایەن فەیلەسوفەکانەوە و هیچ پاسـاوێك نی یە بۆ دووبارەکردنەوەیان لێرەدا دووبارە .بەڵام سەرەڕای ئەو ڕەخنانە ڕەخنەیەکی تـر بخرێتە ڕوو ئەویش ئەوەیە ئەو بەڵگانەی کەخاوەنی ڕێچکە سەرپشکی هەڵبـژاردن دەکەنـە بەڵگە بۆ دژایەتی ڕێچکەی زۆر گەرایە. لەبەرئەوەی بەرپرسـیەتی سزایی ویسـتێکی ئـازادی ڕێژەیی بەسەو پێویستی بەسەرپشکی هەڵبژاردنی ڕەها نیە.

## داواکاری دووەم:
## ڕێچکەی ناچارکردن

ئەم ڕێبازە بەهەوڵێك دەژمێردرێت بۆچەسپاندنی یاساکانی هۆکاری حەتمی بەسـەر ئـەو هەڵسـوکەوتانەیاندا لەلایـەن مرۆڤـەوە ئـەنجام دەدرێـت، هـەروەك دەچەسـپێت بەسـەر بوونەوەرە سروشتی یەکاندا بۆ نمونە وەك بەهەڵم بوونی ئاو لەپلەیەکی گەرمی دیاریکراوداو کشانی تەنە ئەندازەییەکان هەرکاتێك توشی وزەیەکی گەرمی بـووە بەئەندازەیـەکی دیـاری کراو چۆنیەتیەکی تایبەت. ئەم ڕێچکە پابەندەو بەسراوە بەو بەرەو پێش چونەی کەزانستە سروشتی یەکان بەدەستیان هێنا کەبەرهەمەکانیان دۆزینەوەی ئـەو یاسـایانەبوو کـەدیاردە گەردوونیەکان هەڵدەسوڕێنن بەشێوەیەکی هەمیشەیی و لۆژیکیانە ،چونکە عەقڵ وێناناکات

---

١ ) تەماشای نوسراوەکەی (دکتور محمود نجيب الحسني)بکە / الموهر شـرح القـانون العقوبـات المصـري / القسم العام ل ٤٠٠.

کەهەندێك لەدیاردەکانی گەردوون خاوەنی هۆکاری حەتمی بن بێ هەندێکی تریان، لەبەرنەبوونی هیچ بەڵگەیەك لەسەر ئەم جیاوازیە لەنێوان دروست کراوەکاندا. هەمدیس (دیسان) وتویانە:– ئەو کارانەی کەلەمرۆڤەوە دەردەچن لەو ڕووەی کەئەوانە دیاردەگەلێکی سروشتی و دەرونین ملکەچی ئەو یاسایانەن و ئەنجامی حەتمی ئەو هۆکارانەن کەدەگەڕێنەوە بۆ ئەو دیاردەسروشتی و دەرونیانە،کەواتە تاوان دیاردەی سەربەستی نیە بەڵکو ئەو بەرهەمی دوو جۆرە لەکارکەرەکان: یەکەمیان هۆکاری خودی(ذاتي) دووەمیان: هۆکاری دەرەکی ژینگەیی یان کۆمەڵایەتی یان بۆماوەیی یان وێنەی ئەوانە وەئەوەی بەسەربەستی هەڵبژاردن ناودەبرێت هیچ بونێکی نی یە لەلایەنی واقیعی و زانستی یەوە،بەڵکوتەنها زادەی وەهم بێ ئاگاییە لەهۆکارە ڕاستینەکانی تاوان. ئەوانەی باوەڕیان بەسەربەستی هەڵبژاردن هەیە هەندێك لەوهۆکارانە دەناسن بێ هەندێکی تریان ، ئەو ئەندازەیەی لێی بێئاگان دەیدەنە پاڵ ویستی تاونکار .هەرکەسێك تەماشای ئەم بابەتە بکات لەگۆشەی دەرونیەوە ڕاست نیە کەبلێت: تاوانکار دەتوانێت بەراورد بکات لەنێوان هۆکارە جۆربەجۆرەکاندا بەو جۆرە ویستی ئاڕاستە بکات بەپێی یەکێك لەو فاکتەرانە. بەڵکوڕاستی ئەوەیە کەئەو مل کەچ دەکات بۆ بەهێزترین فاکتەرلەنێوان ئەو فاکتەرانەدا بێ ئەوەی توانای بەرگری کردنی هەبێت بەڵکو ویستە ئاڕاستەکراوەکەی بۆ ئەنجامدانی تاوانەکەی هیچ نیە جگە لەئەنجامی حەتمی (لەسەدا سەدی) ئەو بەهێز ترین هۆکارە. باوەڕبوون بەڕێچکەی ناچاربوون(الجبر) و نکوڵی کردن لەسەربەستی هەڵبژاردن و شایستە بوونی تاوانکار لەبواری تاونیەوە بۆ پاداشت و سزا سەرئەنجام بۆ داڕنینی بەرپرسیارێتی سزایی لەبنەما ئاکاریەکەی و بنیات نان و دروست کردنی لەسەر بنەمایەکی کۆمەڵایەتی ڕووتە،لەبەر ئەمە بەڕاستی پشتیوانانی (أنصار) وتویانە:– تاوانکار پرسیاری لێدەکرێت لەبارەی تاوانەکەیەوە لەبەرئەوەی ترسناکیەکی شاراوە نیشان دەدات کەلە کەسی ئەودا پەنهانە و (شاراوەیە) هەڕەشەی لەکۆمەڵگا دەکات و پێویستە لەسەر کۆمەڵگا پێش تاوانکارەکە پلانی خۆبەدوور گرتن و بەرگری کۆمەڵایەتی هەبێت تالەم ترسناکی یە بیپارێزێت.

پوختەی قسە: بێگومان پشتیوانانی پرەنسیپی تیۆری و بەرپرسیاریەتی سزایی حەتمی و ڕوخاندنی پرەنسیپی ویستی ئازاد و لەناوبردنی تیۆری بەرپرسیاریەتی ئاکاری

لەچوارچێوەی یاسایی سزاییدا :– رایان وایە کەتاوانکار تاوانی چاولێکەری( شوێن کەوتەیی) بەویستی خۆییە بەڵام دەدرێتەبەر بۆی بۆلای تاوانەکە زۆرجار لەژێرکاریگەری هۆکار و فاکتەرە حەتمی یەکان تاوانکار ناچارکراوە لەسەر ئەنجامدانی تاوانەکە ،بۆیە ئەرکی سەرشانی کۆمەڵگا نەهێشتنی تاوان و خۆپاراستنە لێی. تاوانکار با توانای نەبێت لەبەرپرسیارێتی یان هەرنەخۆشی یەکی عەقڵی تر یان بچوکی یان وێنەی ئەوانە، لەگەڵ ئەوەش لەکۆمەڵگادا دەژی و بەئەنجامدانی تاوانەکەی جەختی لەسەر نیشاندانی بارودۆخە ترسناکەکەی خۆی کردوەتەوە، کەواتە تاونکار پرسیاری لێدەکرێت نەك لەسەر بناغەی ئازادی ویست و هەڵبژاردن ، بەڵکو لەسەر بناغەی ترسناکی یەکی شاراوە لەکەسێتیدا هەیەو (شخصیە)هەڕەشە لەکۆمەڵگا دەکات [1]

## نرخاندنی رێچکەی زۆر (الجبر):-

بێگومان ئەو رەخنانەی کەدەگونجێت ئاراستەی پشتیوانانی ناچاری رەها لەفەیلەسوفەکان بکرێت هەروەك رابورد، دەکرێت کەئاراستەی رێچکەی ناچار کران لەیاسازانی یاسایدا بکرێت. سەرباری ئەو رەخنانەی وتران و ناوبران دەگونجێت چەند رەخنەیەکی تر ئاراستەی پشتیوانانی رێچکەی ناچارکردن بکرێت لەزانایانی یاسا: لەوانە ئەم رێچکەیە ئەوە دەگەیەنێت کەدەبێت نکوڵی بکرێت لەلەمپەرەکانی(رێگرەکانی) بەرپرسیارێتی سزایی خۆنەویستانە وەك شێتی و بچوکی و خۆویستانە وەك سەرخۆشی خۆنەویستانە و پێویستی (الضرورة) . بۆ نمونە شێت بەرپرسە بەرامبەر کۆمەڵگە لەو ترسناکی یەی کەلە کەسێێتیدا شاراوەیە و ئەوەی شێت و عاقڵ لەیەکتر جیادەکاتەوە جیاوازی جۆری ئەو نەخشەو بەرامبەری هەریەکێکیان دەیگرێتە بەر، بەڵام هەردوکیان لەسەر رێچکەی ناچارکردن هاوبەشن لەلێهاتن و شایستەیی وبەرپرسیاریەتی کۆمەڵایەتی دا. ئەم رەخنەیە دەگونجێت وەڵامی بدرێتەوە بەوەی کەهیچ دڵرەقی یەك لەلێپرسینەوەی کەسانێك دا نیە کەچاك و خراپ لێك جیاناکاتەوە یان توانای جیاکردنەوەیان ناتەواوە

---

١ ) دکتور علي راشد / المرجع السابق / ل ١٦٧

لەبەرئەوە ئەو ڕێگانەی بەرامبەر ئەمانە دەیگرێتە بەر مەبەست لێی ئازاردان نی یە بەڵكو تەنها چارەكردنی ئەو ترسناكی یە شاراوەیەیە لەكەسیدان دا [1]

## باسی سێیەم:
## گونجاندنی دوو ڕێچكەكە

زۆربەی یاسازانان ڕایان وایە كەدەبێت ئەم دوو ڕێچكە ناوبراوە بگونجێنرێت لەبەرئەوەی هەریەك لەوان لایەنێكی ڕاستەقینەو ڕاستی تێدایە ، چونكە هەریەك لەم دوانە لەناتەواوی كەم و كوڕی زیادەڕۆی یان شلگیری بەدوور نیە لەدانپێنانی (إقرار) ئازادی هەڵبژاردن یان ناچاری بۆمرۆڤ لەو كارانەیدا پێی هەڵدەستێت، بەشێوەیەكی تایبەت لەكردەوە تاوانكاریەكاندا، ڕاست نیە بوترێت مرۆڤ لەهەموو كارەكانیدا خاوەنی ئازادیەكی ڕەهایە لەنێوان ئەو كارانەی دا ئەنجامی دەدا و بەهەڵبژاردنی ڕێگەیەك بێ ئەوی تر. واقیع گەواهی دەدات بەملكەچ بوونی هەركەسێك لەو كارانەیدا كەپێی هەڵدەستێت بۆ كۆمەڵێك هۆكاری خودی (ذاتي) یان دەرەكی جیا كە (چوارچێوەی) ئازادی لێ تەسك دەكەنەوە. هەروەها ڕاست نیە كەبوتریت مرۆڤ مل كەچە لەشێوەیەكی نەرێنی ڕووت دا بۆیاساكانی هۆكاری حەتمی. كەوابوو یەكسان بوون لەنێوان مرۆڤ و بونەوەرە سروشتی یەكانی تری كەملكەچی یاسا سروشتی یەكانی و هۆكارە خۆنەویستەكان بەوجۆرەی پشتیوانانی (ناچاری ڕەها) دەڵێن جیاوازی یە بەڵگە نەویستەكان. كەلەنێوان مرۆڤ و دروست كراوەكانی تری گەردوندا هەیە بەدرۆی دەخاتەوە (دادەنێت). شتێكی ئاشكرایە كەمرۆڤ بونەوەرێكی هۆشیارە خاوەنی هۆشێكە كەبەهۆیەوە چاكەو خراپەو سودو زیان لێكتر جیادەكاتەوە توانای لەنێوان شتەجیاكاندا و پێش خستنی لایەنێك بەسەر لایەنێكی تردا هەیە و دەتوانێت ڕێگەیەك هەڵبژێرێت و ڕێگەیەكی تر وازی لێبهێنێت. هەروەك مرۆڤ دەتوانێت بارودۆخەكانی دەوروبەری بزانێت و لەباریدا هەیە ئەنجام گەلێك دیاری بكات كەهەوڵ دەدات بەكردەوەكانی بەدی بهێنێت. ڕاستی ناوەندە لەنێوان هەردوو قسەكەدا چونكە مرۆڤ لەبارە

---

١ ) الدكتور محمود نجيب حسني / المرجع السابق ل ٤٠٣.

ئاساییەکاندا خاوەنی ئازادیەکی بەستراوەیە (مقیدة) نەك ڕەها ئەو بەرێکەوت توشی چەند هۆکارێکی خودی دەبێت یان دەرەکی ناتوانێت زاڵ ببێت بەسەریاندا بەڵکوئاراستەی دەکەن بەشێوەیەك کەهیچ ویستێك و سەرپشکێکی نیە تێیدا،بەڵام ناگەیەتە سنوری سەپاندنی کارەکە بەسەریدا بەڵکو ئەندازەیەك ئازادی دەدرێتێ کەبتوانین پێ جموجۆڵ درکات وەئەم ئەندازەیە بەسە بۆ ئەوەی کەسەرزەنشتی ئاراستە تاوانکار بکرێت و بەرپرسیاریەتیە سزایی یەکەی لەسەر بنیات بنرێت. ئەگەر کاریگەری ئەم هۆکارو کارکەرانە لەپلەیەکدا بوو کە ئازادی هەڵبژاردنی لێ دادەڕنێ بەشێوەیەکی هەمەکی (کلی)لەم حاڵەتەدا بەرپرسیارێتی هیچ جێگەیەکی نی یە ، لەم کاتەدا شایەنی پاداشتی سزایی بریاردراو نیە بۆ تاوانەکە بەشێوەیەکی هەمەکی یان شایەنی سزا دەبێت بەشێوەیەکی پاژی (جزئی) ئەگەر بارودۆخەکە سوك کرابوو.

بەپێی ئەوەی وتمان یەکخستن لەنێوان دوو ڕێچکەکەدا دەگونجێت بەهۆی وازهێنان و دوورکەوتنەوە لەئاراستەی پەرگیری و وەرگرتنی ئاراستەی ناوەندی میانڕەو لەرووی ئەنجامەکانەوە.

# جێباسی سێ یەم:
# سەرپشکبون و ناچاری
# لای فەیلەسوفە موسوڵمانەکان

ئاراستە بەناوبانگ و باوەکانی فەیلەسوفە موسڵمانەکان هەروەك فەیلەسوفەکانی تـرو زانایانی یاسا بەگوێرەی (ناچار و سەر پشکبون)، سێ ئاراستەن:- کە سەرپشکبونی ڕەها و ناچاربوونی ڕەهاو ئاراستە ناوەڕاست و میانڕەوە . لەبەرئەمە لێکۆڵینەوەی بابەتەکە لەلایەنی (ڕووی فۆرمەوە) دابەش دەکرێت بەسەر سێ باسدا هەرباسێك تایبەت دەکرێت بەیەکێك لەو سێ ئاراستەیە.

## بابەتی یەکەم:
## ئاراستە(ڕێڕەو)ی سەرپشکبونی ڕەها

فەیلەسوفە موعتەزیلە موسڵمانەکان سەرکردایەتی بیرۆکەی سەرپشکبون ڕەها یان گرتە دەست و کردیانە بیروباوەڕیان و بەرگیان لێکرد ، مرۆڤ یان بەئەنجامدەر و بکەری سەرپشك کراو دایە قەڵەم و بەخولقێنەری کارە بژاریەکانی خۆیان دەزانی بەهۆی توانایەکەوە کەخودا پێی بەخشیبوو، ئەو بەڵگانەی کە موعتەزیلە دەیکەنە پاڵپشتی بۆچونەکەیان ، هەیانە (هەندێکیان) بەڵگەی عەقڵین و (ئاوەزی- وێڵی)ن ،هەربەشێکیان بەڵگەی گواستراوە(نقلی)

أ- هەندێك لەبەڵگە عەقڵی یەکان : کەموعتەزیلەکان دەیکەنە بەڵگە ئەمانەی لای خوارەوەن[1]:-

---

۱ ) المعتزلە (موعتە زیلە): ناوێکە بەولتا کاتێك سەری هەڵدا کە(واصل) کوڕی (عطا) لە (حسن) ی بەسری دوور کەوتەوە لەبەر ڕاجیاییەك کەلەنێوانیان هەبوو بەڵام بویە ناوێك بۆ ڕێبازێکی فکری کەمۆرکێکی تایبەتی هەبوو ئەویش ئەوەبوو بابەتەکانی ئاین دەبێ بە عەقڵ هەڵبسەنگێندرێن و بەبەڵگەی بەهێز ←

١- ئەگەر مرۆڤ ئازاد نەبوایە لەهەڵبژاردن دا بەجۆرێك هەرچیەك بكات كەدەیـەوێت یـان واز لەهەرچیەك بێنێت كەنایەوێت ئەوا پێ سپاردن(التكلیف) هیچ مانایەكی نـەبوو پـوچ بـوو یان لانی كەم بێهودە بوو لەبەرئەوەی داوالێكردن و پێسپاردنی مرۆڤێك كەبرینی رێگەیـەكی دیاری كراوی لەسەر نوسرابێت (بریـار درابێـت) كـەهیچ رێگایـەكی تـر نـەبرێت ، داواكردنـی شـتێكە لێـی كەلەتوانایـدا نیـە وە ئەمـەش قورئـان قبـوڵی نیـەو و بەرپـەرچـی دەداتـەوە بەدەقێكی یەكلا كەرەوە (قاطع) لەم فەرمودەیـەدا (لایكلـفُ الله نفسـاً إلاّ وسـعها) [1] واتـە : خواداوا لەهیچ كەسێك ناكات مەگەر بەئەندازە تواناى نەبێت بێژە(وشە)ی (نفساً) ناسراوە (نكرة) لەجێگەی نەرێ دا مانای گشتی بوون دەگەیەنێت بە بەڵكو دەنگـی هـەموو عـاقڵانی (زانایـانی) كـۆن و نـوێ چەسـپاوە داوا لـەمرۆڤ بكرێـت لـەنێوان بونـەوەرە زیندوەكانـدا و ئاراستەكردنی دلواكاری و قەدەغەكردنی شتەكان لێی لەهەموو كات وشوێن و كۆمەڵگەیەكدا ئیتر سەرچاوەی ئەم پێسـپاردن و داوالێكردنـە شـەرعی خودابێـت یـان یاسـای مـرۆڤ بێـت لەمەوە دەگەینە ئەم دەرئەنجامـە كـەمرۆڤ ئـازادە لەهەڵبـژاردنی بـرینی رێگـەی چـاكە یـان خراپەدا. ئـەم بەڵگـە لۆجیكییـە مشـتومڕی لەسـەر دەكرێـت [2] بـەوەی سـەرەڕای سـاخ و دروست بوونی ، ئەنجامێكی گشتی تر بەرهەم دەهێنێت كەداواكە (الدعوى) پێشەكی گشتی تر ، تایبەت تری لێوە پێك نایەت (پێچەوانەی پێچەوانەوە) واتـە: ئـەم بەڵگەیـە تـەنها دژی بیرۆكەی ناچاركدنەوە (الجبریە) دەوەسـتێت و دژی كەسـێك كـەداوای ناچـار بـوونی ڕەهـا دەكات كەوابوو هەڵبژاردنی ڕەهای پێ ناسەلمێت بۆ مرۆڤ چـونكە بـۆ دروسـتی داواكـردن و پێسپاردن ( التكلیف) پێویستە پێسپێردراو تەنها سەرپشـككردن و هەڵبـژاردنێكی بەشـی (

---

بخرێنـــەروو نـــەك تـــەنها بەپشـــت بەســـتن بەگێڕانـــەوە لەپێشـــینانەوە.ناكۆكی نێـــوان موعتەزیلەوناچارگەران(الجبریە) چڵەپۆپە كاتێك (جبریەكان) رێچكەی ناچاریونیان هەڵبـژارد بەبەڵگـەی دەقە قورئانیەكان بەرگریان لێكردگروپـی یەكـەمیش (موعتـەزیلـە) بیرۆكـەی سەرپشـككردنی رەهایـان هەڵبژارد وهەوڵیاندا بەبەڵگە ئادەژی دقەكانی قورئان بسەلمێنن.

١ ) سورة البقرة / ٢٨٦

٢ ) بەڵگەكە قیاسێكی لۆجیكی جیاكراوە یـە (إستثنائي) پێك هـاتووە لـەدوو پێشـەكی (مقدم وتـالي) لەلابردنی تالیەكە مقدمەكەش نامێنێت بەڵگە لاچوونی تالیەكەش كۆدەنگی یەك ڕای عاقڵانی لەسەرە .

الجزئی) هەبێت وەك ئەشاعیرەکان دەڵێن ( ڕای میانڕەو) کەلەلقی سێ یەمدا باس دەکرێت (بەویستی خودا).

٢-ئەگەر مرۆڤ سەرپشك کراوێکی ڕەها نەبێت ئەوا حەتمی و بێگومان پاداشت و سزا شتێکی بەتاڵن ( پوچن) لەبەرئەوەی ئەم دووانە سەرئەنجامی کاری جوان و کاری ناشرینن کەدەدرێتە پاڵ مرۆڤ لەو دیدگاوەی کەمرۆڤ ئەنجامدەریانە بە ئارەزوو و هەڵبژاردنی ڕەهای خۆی ، ئەگەر وتمان ئەو کاری باش ئەنجام دەدات لەبەرئەوەی لەسەری نوسراوە و ناچار و زۆرلێکراوە تابیکات ئیتر ئەو شایانی سوپاس نیە لەدونیادا و شایستەی پاداشتی پاشەڕۆژیش نیە. هەر بەو شێوەیە ئەگەر کارێکی خراپ و ناشرینی کرد لەژێرباڵە بەستۆی ناچاربوندا ئاوا شایەنی سەرزەنشت کردن نیە لەلایەن کۆمەڵگاو ڕای گشتی یەوە لەدونیادا وەهەروەها سزا نیە لەدونیاو نەلە پاشەڕۆژدا. بەڵام پاداشت و سزا جێگیرو چەسپاون بۆ مرۆڤ بەکۆدەنگ و ڕای هەموو بەرنامە خواییەکان و یاسا مرۆڤ کردەکان. کەواتە مرۆڤ ئەگەر کردەوەی چاك بوو ئەوا پاداشتەکەی چاکەیە و باشەیە ، وەئەگەر کردەوەی خراپ بوو ئەوا پاداشتی خراپ و سزایە و سەرزەنشت کردن وەئەمە شتێکی جێگیرو بەڵگەنەویستە مشتومڕ و گفتوگۆولێدوان هەڵناگرێت و پێویستی بەبەڵگە نیە پاش ئەوەی کەقورئان بەدەق دانی پێداناوە لەزۆرێك لەئایەتەکانیدا لەوانە دەفەرموێت :﴿ فَمَنْ يَعْمَل مِثقالَ ذرّةٍ خيراً يرهُ ، وَمَنْ يَعْمَل مثقالَ ذرّةٍ شراً يره﴾[1] واتە : هەرکەسێك کێشی وردیلەیەك چاکەی کردبێت ئەنجامەکەی دەبینێتەوە ، هەرکەسێکیش کشێشی وردیلەیەك خراپەی کردبێت تۆڵەکەی دەبینێتەوە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کەمرۆڤ سەرپشك کراوە بە سەرپشك کردنێکی ڕەها کاتێك ڕێگەی چاکە هەڵدەبژێرێت یان ڕێگەی خراپە و بەرتەری یەکێکیان دەدات بەسەر ئەوی تریاندا لەکاتی . ئەم بەڵگەیەش هەمان مشتومڕی بەڵگەی یەکەمی لەسەر دەکرێت لەبەرئەوەی پاداشت و سزا پێویستیان بەبوونی سەرپشکبونی ڕەها نیە بەڵکو سەرپشکبونی بەشی(الجزئی) بەسە بۆیان هەروەك لەئاڕاستەو ڕێڕەوی (میانڕەو دا) باس کرا.

---

١ ) سورة الزلزلة/ ٧-٨

٣- ئەگەر مرۆڤ خاوەنی توانای هەڵبژاردنی ڕەها نەبوایە ئەوا هاتن و ناردنی (ڕەوانەکردنی ) پێغەمبەران و نێردراوانی خودا بێسود دەبوو ، باوکان و دایکان مامۆستاو پەروەردەکاران بەرپرس نەدەبوون لەچاککردنی لاڕێبواندا ، چونکە وا گریمانە کراوە کەمرۆڤ ناچارو زۆرلێکراوە لەسەر ئەو ڕێگەی دەیگرێت بەڵام سودو بەرپرسیارێتی بەگەواهی دانی واقعی بەرجەستە وەستاون و لەبەرچاودان ، هەروەها بەگەواهی بەرنامە خوایی و یاساکانی مرۆڤایەتی . ئەم بەڵگەیە لەسەر ئەوەیە کەمرۆڤ هەڵبژاردنی ڕەهای بەدەستە بەڵکو بۆ بەدیهێنان و بەرجەستەکردنی سود و بوونی بەرپرسیاریەت ئەوە بەسە کەبڵێین مرۆڤ سەرپشکبونی ( پاژی -بەشی) هەیە و لەدەست دایە. [١]

ب- لەبەڵگە نەقڵیەکان:-

موعتەزیلەکان بۆ بەهێز کردنی قسەکەیان کەدەڵێت: مرۆڤ خاوەنی سەرپشك بوونی ڕەهایە - کۆمەڵێك لەئایەتەکانی قورئانی پیرۆز وەك بەڵگە دەخەنە ڕوو لەوانە:

١- خوا فەرمویەتی:﴿ كُلُّ نَفسٍ بِما كَسَبَتْ رَهينةٌ﴾ [٢]

وتویانە: ئەم دەقە قورئانیە بەئاشکراو بەڕاشکاوی ئەوە نیشان دەدات (دەگەیەنێت) کەمرۆڤ بارمتەی ئەو کردەوانەیە دەیکات و ئەو خاوەنی هەڵبژاردنی ڕەها و ویستی ئازادە ئەگەر کردەوەکەی چاك بوو پاداشتەکەی چاك دەبێت و ئەگەر کردەوەکانی خراپ بوو ئەوا پاداشتەکەی خراپ دەبێت ، مشتومڕ لەسەر بەڵگەکردنی ئەم ئایەتەش هەیە : کەلە جیاوازی ئاشکرا هەیە لەنێوان بەدەست هێنان (پەیداکردن) و (خولقاندن) (بەدیهێنان) دا ، یەکەم لەڕواڵەتەکانی توانای مرۆڤە و ئەو کارانەی پەیدا دەکات و بەدەستیان دێنێت، دووەم لە شوێنەوارەکانی توانای خوای گەورەیە مرۆڤ هۆکارەکان بەکاردێنێت و خواش ئەگەر ویستی خولقاندنی بەرهۆکارەکان دەگرێتە دەست. کەوابوو ئایەتی ناوبراوو ئایەتەکانی هاو وێنەیان ئەوە نیشان نادات ( ناگەیەنێت) کەمرۆڤ خاوەنی سەرپشکی ڕەهایە و خۆی دەتوانێ کردەوەکانی خۆی دروست بکات ، کەوابوو ئایەتەکەی پێشوو بەڵگەی کەسانێکن

---

١ ) بۆ زیاتر ڕوون بونەوە تەماشای دانراومان ( الفلسفة الشرعية) بکە ل ٣١٨ و دوای ئەویش

٢ ) سورة الكهف / ٢٩

کەبڕوایان بەڕێچکە و ڕای ناوەند و میانڕەوی هەیە لەنێوان سەرپشکبوونی ڕەهاو ناچاربونی ڕەهادا.

٢- خودا دەفەرموێت:﴿وقل الحق من ربكم فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر﴾[1]

پشتیوانانی هەڵبژاردنی ڕەها دەڵێن : ئـەم ئایەتـە بەئاشـکرا ئـەوە دەگەیـەنێ کـەمرۆڤ خاوەنی ویستی ڕەهان ، چونکە باوەڕ هەڵدەبـژێرێت کەلوتکـەی چـاکەیە یـان بـێ بـاوەڕی کەلوتکەی خراپەیە، سەرپشك کرانی لەنێوان هەردوو کارەکەدا بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسـەر ئازادی ویستی و هەڵبـژاردنی ڕەهـای . مشـتومڕ لەسـەر بەڵگـە هێنانەنـەوەی ئـەم ئایەتـە دەکرێت لەسەر ئازادی ویست و سەرپشککردن کە ئەم فەرمودەیە بۆ ئەو بابەتـە نـەهاتووە ،چونکە سەرپشك کردن لەنێوان دووکـاری پێویسـت یـان ڕەوا دراودا دەبێـت ، بـەڵکو ئـەم ئایەتە بۆ پەیمانە بەسەر ئـەنجامی ئـەرێنی و بـاش بـۆ کەسـانێك بـاوەڕ هەڵدەبـژێرن ، بـۆ هەڕەشە لەکەسانێك بەسەرئەنجامی خراپ و نـاخۆش و ترسـناك لەبـەر هەڵبـژاردنی بەشـی دووەم ئەویش بێ باوەڕی یە. کەواتە ئایەتە هاتووە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوە کەئیسلام هات تاهەموو یەکسـان بکـات لەبـەردەم خـوای پـەروەردگار دا کـەوابوو شـکۆ و چـاکی بـەهۆی دەوڵەمەندی و پشت و پایەی کۆمەلایەتی و سیاسی (ڕامیاری ) و وێنەی ئەمانە نیە چـونکە ئەمانە چەند بەهایەکی (قيم وقتية) کاتین و لەناو دەچن،بەڵکو شکۆ و گەورەی بەخواناسـی و لەخواترسی و کردەوەی چاکەی بەسودە ئـیتر جگەلەمانـە یـاری و گەمـەو سـەرگەرمی و جوانی و خۆهەڵکێشانە بەسەر یەکتری دا، وەبەپێی ئەم ڕاستی یە هەرکەس کەدەستبەندی بـەهێزەوە و لەپشـتیوانانی ڕاسـتی بێـت و لایـەنگری چـاکەبێت ئـەوا بـاوەڕ بهێنێـت و هەرکەسـیش ویسـتی پشـتیوانی قـەڵبی وپوچـی بێـت بەشـوێن تێرکردنـی خواسـت و ئارەزووەکانیدا وێل بێت و دڵ خۆش بێن بەجیهانی زوبڕاوە ئەوا با بێباوەڕ بێت . سـەرەڕای نەسەلماندنی سەرپشـککردنی ڕەهایە و بەڵگـە عـەقڵی و نـەقڵی یانـەی نـاوبران ، چـەندان تێبینی تر لەسەر ئەم ڕێچکەیە هەی لەوانە :

أ-چەندان ڕووداوی زۆر هەیە لـەژیانی ڕۆژانـەمان دا بـەدی دەکـەین کەئـەنجام دەدرێـن لەژێرکاریگەری بارودۆخی حەتمی بوونی تـاوان لەسـەر تاوانکارەکە وەك کوشـتن لەتۆڵـەی

---

[1] (١)

ناموسدا یان ناوموسی خێزانەکەیدا کەسوکایەتی پێکراوە یان شەرەفی کەدەست درێژی کراوەتە سەر و وەك دزیکردن ئەنجام دەدرێت لەژێرکاریگەری پێویستی هەژاری و نەبوونی دا و بەمەبەستی ڕزگار کردنی ژیان.

ب–ئاراستەو ڕێبازە زانستی یە نوێیەکان زانستی پزیشکی و دەرونزانی و کۆمەڵناسی وێنە یان بیرۆکە و بۆچوون و قسەی (سەرپشکبونی ڕەها ) تێك دەشکێنێت ، جەخت دەکاتەوە کەمرۆڤ بەئارەزووی خۆی ڕێگە ناکات لەکارەکانی خۆیدا بەئارەزوو ویستی ئازادی خۆی ، بەڵکو دۆخەدەرەکی و ناوخۆییەکان لەپاڵنەرە دەرونیەکانی و سروشتی پێکهاتەی جەستەیی پاڵی پێوە دەنێن و دەیجوڵێنن ، با بۆتە تەماشاکەر و ڕوانەری ڕواڵەتی و ڕووی وادەردەکەوێت کەکار و کردەوە لەگەڵ ویستێکی ئازاد دایە. کەواتە تاوان وەك هەردیاردەیەکی کۆمەڵایەتی تر تەنها زادەی ویست نیە بەڵکو چەندان هۆکار و کارکەرە کەسی و کۆمەڵایەتی و سروشتی ڕۆڵیان هەیە لەڕوودان و بوونیدا [1]

## بابەتی دووەم:
## ڕێچکە ناچاربونی ڕەها

بیرۆکەی ناچاربوونی ڕەها دەگەڕێتەوە بۆ پێش ئیسلام چونکە مرۆڤ لە دێرین زەمانەوە هەوڵ دەدات و تێدەکۆشێت بە زیرەکی و وریایی خۆیەوە کەنکوڵی بکات لەئازادی خۆی لەوکارانەی ئەنجامی دەدات لەچاکە یان خراپە پاساو بێنێتەوە بۆ بێباوەڕی خۆی بەرامبەر بەخوا ، تاوان و کەمتەرخەمیەکانی و کردەوە نارەواکانی سەرەڕای ئەوەی کەخاوەنی عەقڵ و زانینە . مێژوو نوسان پێیان وایە بیرۆکەکە دەگەڕێتەوە بۆ گەلە بت پەرستەکۆنەکان[2] ، موسڵمانانی پێشین و سەرەتا لەسەرەتای ئیسلامەوە لەبابەتی (قەزاو قەدەر) نەکۆڵیونەتەوە تەنانەت لەوشتانەش کەتۆزێك بوێنی ناچاری لێهاتبێت لەڕواڵەت دا چونکە دینەکەیان تێدەگەیشتن لەئیانەکەین بەتێگەیشتنێکی ڕاست. لەپاشاندا کەسانێك هاتنە ناو

---

١ ) الأستاذ الدكتور محمد مستفا القليلي /في المسؤلية الجنائية ل ٨

٢ ) الاختيار أو (صه ية الا رادة في الإسلام) ترجمة ابي الوفاء محمود درويش من الفرنسية دون ذكر المؤلف ط ١٩٥٨ ص ٢٢ پاش ئەو

ئیسلامەوە بەڕواڵەت ئیسلامەتیان لەخۆیان دا نیشاندا و پێشەوایەتی بڵاوکردنەوەی هەندێك بیری نائیسلامیان دەکرد لەپێش هەموویانەوە بیرۆکەی ناچاریون(الجبر) وەك پشتیوانانی(جهم ی کوڕی صفوان) [1] ی ڕاسی و شوێن کەوتوانی (جعدی کوڕی درهم) کەپێیان وایە کەویستی مرۆڤ بێ توانەیە لەئاڕاستەکردنی شوێن ڕەوی ڕووداوەکان و ئەوەی لەمرۆڤ ڕوو دەدات لەئەزەلدا لەسەری بڕیاردراوەو نوسراوە ئەو کارانەی بەدەستی خۆی نیەو سەرپشك نەکراوە ، بێگومان کەسانێك ئەم ڕێچکەیان گرتووەو باوەڕی پێی هەبووە زاراوەی (الجبرية) زۆرگەرایان بەسەردا دابڕاوە. ئەوانیش گروپێکن لەگروپە ئیسلامیەکان وەك گروپی (الجهية) و وتویانە:- بێگومان هەرچیەك ڕوودەدات تەنها بەپێی ویستی خوا دەبێت وە ئایندە و داهاتوو ئەگەر لەناو زانیندا بن ئەوا بوون.و پەیدابوونی بەپێی زانینی خوا پێویستە ( واتە ئەبێ هەر ببێ). و گروپی(الجبرية) جیاوازە لەگروپی (الحتمية) چونکە جبرية پێویستی پەیدابوونی شتەکان دەبەستێت بەپەرەنسیپ و سەرچاوەکەی بالاتر لەوان هەرچونێك بیەوێت دەیبان بەڕێوە ، کەواتە ئەو زەرورەتێکی باڵایە (متحالية) ، کەدایە لەوێ ویستێکی خوایی هەیە کەهەموو ڕوو داوەکان دەچنە ژێر ڕیکێفیەوە ، ئەمجاکە دەوترێت مرۆڤ ناچارکراوە لەکارەکانیدا لەسەر ئەم بنەمایەیە نەك حەتمیەتی بارودۆخ و سروشت . بەپێی ئەوەبێت (الجبرية) ە زۆرگەرایی یە ، زۆرگەراییەکی خوایی یە (لاهوتیە). ئەمما ڕێبازی (حتمية)هەربونی ئەمیش ڕێچکەیە کەلە ڕێچکەفەلسەفیەکان ڕای وایە کەدیاردەکانی سروشت هۆکار دروستیان دەکات، ئەمیش کت و مت پرەنسیپی هۆکاری یە ، فاکتەر دەبێتەهۆی پەیدابوونی بەرهۆکار و زەرورەتیش چواردەوری هەموو شتەکانی داوە، بۆ هەموو ڕوداوێك (کارێك) مەرج گەلێك هەیە ئەگەر هەبوون،دروست بووەکە پێك دیت ، ئەم دووە وەك هۆکاری تەواو بەرهۆکارەکەی وان [2]. (حەتمیە)یش ئەو ڕێچکەیە

---

١ ) (١٢٨ ك) سەرکردەی جهیەکانە کەگروپێکە لەگروپەکانی (مُرجئة). لەڕای جهیەکان : باوەڕ گرێدانی دڵە لەگەڵ خودا و پێغەمبەرەکانیدا و هەرشتێك لەلایەن خواوە هاتووە جگە لەمانە لەکردە باشەکان بەشی باوەڕنین ، هەرچیەك بەعەقڵ ڕەوا نەبێ کرنی ، هەرچیەکیش ڕەوابێت لەعەقڵ دا نەکرنی ئەوا لەباوەڕ نیە و هەموو کردەوەی مرۆڤ پاش کەوتووە لەباوەڕ لەبەر ئەوە باوەڕیان بەزۆر و دواخستن هەیە.

٢ ) المحجم الفلسفي / سەرچاوەی ڕابردوو ب/ ل ٣٨٨ – ٣٨٩

کەفەیلەسوفەکان و زانایانی یاسای لەسەرن کەدەڵێت: مرۆڤ زۆرلێکراو ناچارکراوە لەو تاوانانەیدا کەپێی هەڵدەستێت.

هەرتاوانێك کەمرۆڤ ئەنجامی دەدات بەناچاری و زۆرلێکراوی ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ خولقاندنی خواو ویست و قەزاو قەدەری و ئەو کارانەی کەهەندی کەس وا خەیاڵ دەکەن کەبەویستی مرۆڤن ئەوانیش بەویست و خولقاندنی خوان و کەدەدرێنە پاڵ مرۆڤ ئەوا لەرووی خواستنەوەیە (مجان) وەك دانەپاڵی کارەکان بۆ لای رووەك و بێگیانەکان ، دەوترێت گوڵەکە ڕوا یان گەڵای کرد یان دارەکە گەڵای کرد و بەردەکە جوڵا (بزوت) وێنەی ئەمانە، سەرەڕای دان نانیان بەبیرۆکەی زۆرگەراییدا ئەمان دەڵێن مرۆڤ پێسپێردراو داوالێکراوە بەپرسیارە لەبەردەم یاسای سزایی و شارستانی دا لەو کارە یاسایانەی ئەنجامی دەدات، پشتیوانانی زۆر بۆ تۆکمە و بەهێزکردنی ڕێچکەکەیان کۆمەڵێك قورئان دەکەنە بەڵگە لەوانە:

١-خوای گەورە فەرمویەتی (وما تشاؤون الاّ ان يشاء الله...)[1] وتویانە: ئەم ئایەتە بەئاشکرا ئەوە نیشان دەدات کەویستی مرۆڤ ملکەچی ویستی خوایە لەهەموو کارێکدا مرۆڤ پێی هەڵدەستێت جیاوازی نیە کارەکە چاکەبێت یان خراپە وەکردنە بەڵگەی ئەم ئایەتە لەم بوارەدا، مشتومڕ و لەسەر دوان هەڵدەگرێت کە ئەو نەلەنزیك نەلەدوور نابێتە بەڵگە لەسەر بیرۆکەی زۆر ، بەڵکو ئەوەی لێوەردەگیرێت کەناگونجێت هیچ ڕووداوێك لەگەردوندا ڕووبدات لەلایەن مرۆڤەوە یان جگە لەمرۆڤ مەگەر بەویست و ڕازی خوا کەوابوو هەرچیەك مرۆڤ ئەنجامی بدات لەکردەوە خوویستەکان ئەوا لەڕاستی دا ئەو کارە ئەنجامدراوی دوو ویستە، ویستی پەیداکەرو بەدەست هێنەر کەویستی مرۆڤە بۆ بەکارهێنان و بەدەست هێنانی هۆکارەکان ، و ویستێکی خولقێنەر کەئەویش ویستی خوایە بۆ دروست کردن و بەدیهێنان ، کەوابوو ڕوداو تەنها ئەنجامی ویستی مرۆڤ نیە ، لەبەرئەوەی مرۆڤ ناتوانێت هیچ بەدی بهێنێت و دروست بکات لەنەبوونەوە وەتەنها لەویستی خوا نیە بۆ ئەوەی تاپێویست نەبێت دەرچون لەڕێگەو بەرنامەی خوا لەدروست کراوە ئایندا کەدەخوازێت مرۆڤ وازی لێبێنێت خۆی و کاروباری خۆی پاش بەخشینی عەقڵ و زانین و دەرك و ویست و هەڵبژاردن و توانا لەسەر بەکارهێنانی هۆکارەکان. هۆکاری چاکەو خراپە چونکە دادگەری خوا دژایەتی لەگەڵ

---

١) سورة الانسان / ٢٩

ئەوەدا هەیە کەمرۆڤ ناچار بکرێت و زۆری لێبکرێت لەسەر ئەنجام کارێك پاشان لێی بپرسێتەوە دەربارەی سەرئەنجامی ئەوکارە. سەرەڕای ئەوە بەستنی هۆکاریەبەر هۆکارەکانەوە بەشێکی لەیاسای خوا لەگەردوندا،چونکە گەردوون وپێك هاتەکانی جیهانی هۆکارەکانە ، نەك جیهانی موعجیزەکان بەگوێرەی هەموو کردەوەیەك کەمرۆڤ پێی هەڵدەستێت بەویستە ئازادە دەرك کەرەکەی، بەڵام لەدەرەوەی ئەم چوارچێوە ویستی خوا بڕیار دەدات لەکارانێکدا لەژوور ویست و توانای مرۆڤەوەن ، زۆرکەسمان بینی کەمردن هاتەسەریان پاش تێکشکاندنی فرۆکەیەك لەئاسماندا یان نقوم بوونی کەشتی یەك لەگێژاوی دەریایەك دا یان دەرچوونی شەمەندەفەرێك لەسکەکەی یان داڕووخانی ماڵێك بەهۆی بومەلەرزە یەکەوە یان چەند بۆمبێکی وێرانکەرەوە ، سەرەڕای ئەوە هەندێك کەس لەو ڕووداوانە ڕزگاریان دەبێت بەویستی خوا بەبێ ئەوەی ویستی مرۆڤ خۆی تێهەڵقورتێنێت. چەندان پزیشکمان بینی دانیان نا بەبێ تواناییان دا لەچارەسەرکردنی نەخۆشی دا کەچی سەرەڕای ئەوە لەو نەخۆشی یە ڕزگاری بوو گەڕایەوە باری تەندروستی جارانی و چەندان ساڵ پاش ئەوە ژیا ، زۆر پرۆژە هەرەسیان هێنا و زۆرکەس ڕای خۆیان گۆڕی لەپرۆژەکانیان دا پاش ئەوەی بڕیاری جێبەجێ کردنی پرۆژەکانیاندا . سەرباری ئەوە هەزاران ڕووداو و کارەسات ڕۆژانە ڕوو دەدەن بێ ئەوەی ویستی هیچ ڕۆڵێکی سەربەخۆی هەبێت هەموو ئەمە بێگومان بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر ئەوەی کەویستی خوا سەربەخۆ لەهەندێك کاردا ڕۆڵی هەیە ، بێ ئەوەی ویستی مرۆڤ هیچ کاریگەریەکی هەبێت بەڵام ئەوەی وەك جگەلێك کردنێك و دەرکردنێك کەوابوو وەك یاسا و ڕێسایەك هەموو کردەوەیەك لەکردەوەکانی مرۆڤ ئەنجامدراو دوو ویستە ویستی خواو ویستی مرۆڤ.بێگومان ویستی مرۆڤ ناتوانێت بڕیارێك بخاتە بازنەی بوون و جێبەجی کردنەوە ئەگەر ویستی خوا یارمەتیدەری نەبێت، بەڵام ئەم یارمەتیدانە مانای زۆرلێکردن و ناچارکردنی مرۆڤ نیە لەسەر کار ئەنجامدان پاش لێپرسینەوەی لەئنجامەکانی .

٢- پشتیوانانی زۆر گەرایی کۆمەڵێك ئایەتی قورئانیان تری کردۆتە بەڵگە لەوانە فەرموودەی خوا ﴿.... فیضل الله ومن یشاء ویهدي من یشاء وهو العزیز الحکیم﴾ [1] واتە

---

١) سورة إبراهیم / ٤

:جا ئەوسا خوای گەورە لەسەر گومڕای كردنی هەركەسێك بێت گومڕای دەكات ، لەسەر هیدایەتی هەركەسێك بێت هیدایەتی دەدات فەرموودەی خوا :﴿...ومن يضلل اللهُ فلن تجد له سبيلاً﴾[1] واتە هەركەس خوا گومڕای بكات ئەوا تۆ هەرگیز هیچ ڕێگەیەكت نیە بۆ هیدایەتدانی. فەرمودەی خوای گەورە :﴿....ومن يهدالله فهو المهتد ومن يُضللْ فلن تجد له وَلياً مُرشيداً﴾[2] واتە :خوا هەركەس هیدایەت بدات ئەوا بەتنها ئەو هیدایەت

دەرە كەسی كەنیە، هەركەسیش گومڕا بكات ئەوا تۆ هەرگیز هیچ سەرپەرشتیارو ڕێنمونیكەرێكی نیە.

جگەلەچەندان ئایەتی قورئانی تر كەبە ڕواڵەت دا ئەوە دەگەیەنن كەهەرچیەك لەڕێنمونی مرۆۋ و گومڕابوونی شتێكە لەسەر مرۆۋ نوسراوە هیچ توانا و هێزێكی لەوەدا نیە. ئەم تێگەیشتنە نەخۆشە (تێگەیشتنی بیرۆكەی زۆرگەرایی) و ئەنجامگیری لەو ئایەتانە و ێنەی ئەوان شتێكی چاوەڕوان كراوە لەهەموو مرۆڤێكی سادە كەقوڵبونەوە هاوپەیمان نەبێت، وەلە هەموو كەسێكەوە هەندێ لەئاییەتە قورئانیەكان دەزانێت و نەزانە بەرامبەر هەندێكی تریان و ئەو ئاگەواری هەموو لایەنەكانی ئایەتەكان نیە ، چونكە مەبەست لەو ئایەتانەی ناوبران و وێنەیان ئەوەیە كەخوای گەورە ئەگەر ویستی مرۆۋ گومڕا بكات هیچ كەس ناتوانێت ڕێنمونی بكات بەڵام ئەو ئەوەی ناوێت تاگومڕای (ڕێلێونبوو) نەبێت بەزۆر و سەپێنراو بەسەر مرۆڤدا چونكە لەوكاتەدا شایستەو شایانی لۆمە و سزا نیە. وەئەگەر ویستی ڕێنمونی كەسێك بكات كەس ناتوانێت گومڕای بكات چونكە ویستی خوا لەسەر ویستی مرۆڤەوەیە. بەڵام ئەمەی ناوێت چونكە ناچار كراو لەسەر ڕێنمونی و ڕێگەی ڕاست شایەنی سوپاس و ڕێز و پاداشت نی یە. لەپاڵ ئەوەشدا بێگومان قورئانی پیرۆز یەكەیەكی تۆكمەیە هەندێكی ڕاڤەی هەندێكی تریەتی ، چەندان ئایەتی قورئانی تر هەن بەڕاشكاوی زۆرگەرایی ڕەت دەكەنەوە بەڕەت كردنەوەیەكی تەواو ، مانایەكی بنبڕ(قطعي).دەگەیەنێت كەویستی خوا ناچێتە ناو كاروباری بەندەكانیەوە مەگەر پاش پەیوەندی كردنی ویستی خوا پێیانەوە و ئازادی ویستی نابەستێتەوە لەوەدا كەهەرەشتێك لەچاكە یان خراپە هەڵبژێرێت

---

١ ) سورة النساء / ٨٨

٢ ) سورة الكهف / ١٧

و لەو ئایەتانە و فەرموودەی ﴿ ونفسٍ وما سواها ، فألهمها فُجُرها وتقواها ،قد أفلح من زكاها، وقد خاب من دسّاها ﴾[1] . واتە: سوێند بەدەرون و خوایەك كەبەوڕێكیە دروستی كردووە و ڕێگەی چاك و خراپی نیشانداوە بەڕاستی سەرفرازە كەسێ پاكی دەكاتەوە ، ماڵ وێرانە كەسێك دەیكات بەژێر تاوانەوە پاشان خوای گەورە سەرزەنشتی پێغەمبەرانی كردوە لەسەر بەكارهێنانی ڕێگەی زۆر و زۆرلێكردن بۆ ناچاركردنی خەڵك لەسەر باوەڕهێنان لەچەند ئایەتێكدا لەوانە:﴿ ولوشاء ربُّك لا مَنَ مَن في الأرض كُلُّهم جميعاً أفأنت تُكره الناس حتى يكونوا مؤمنين ﴾[2].ئەگەر خوای تۆ ویستی بوایە هەرچی ئادەمیزادێ والەسەر زەویدا هەیە هەموو ئیمانیان دەهێنا ئەی محمد تۆزۆر لەخەڵك دەكەی هەتا ئەوان ئیمان بێنن بەزۆر لەگەڵ ئەوەدا كەئەو زۆركاریە هیچ سودی نیە بۆیان؟! وەخوای گەورە لەچەندان ئایەت دا ئاڕاستەی مرۆڤ دەكات بەرەوچاكەو هۆشیاری دەداتێ لەلادان لەوانە دەفەرموێت ﴿انا هديناه السبيل إما شاكراً وإمّا كفوراً﴾[3] واتە ئێمە ڕێگەمان پیشان داوە جامرۆڤ یان سوپاس گوزارە لەسەری دەڕوات یان بێباوەڕ دەبێت دەفەرموێت ﴿ وهديناه النجدين)[4] واتە ڕێگەی ڕاست و چەوتمان بۆ دیاری كردوون ،واتە ڕێگەی چاكەو خراپە.

چەند ئایەتێكی تر بەرچاو دەكەوێت كەباسی ئەو كەسانە دەكات كەباوەڕیان بەبیرۆكەی زۆرهەیە و بەبێ باوەڕ ناویان دەبات و دەیان خاتە بازنەی هاوتا پەیداكەرانەوە لەو ئایەتانەش (وقال الذين أشركو الوشاء الله ماعبدنا من دونه من شيء نحن ولا أباؤنا ولا حرّمنا من دونه من شيء كذلك فعل الذين من قبلهم فهل على الرسول الاّ البلاغ المبين ﴾[5] واتة هاوتا پەیداكەرەكان وتیان ئەگەر خوا بیویستایە هیچ شتێكمان نەدەپەرست جگەلە ئەو نەئێمە و نەباو باپیرانمان و هیچمان یاساغ نەدەكرد ، هەمان قسەو كردەوەیان هەبوو پێش ئەمانیش ، ئایا لەسەر پێغەمبەران هیچ شتێك هەیە جگە ڕاگەیاندنی ئاشكراو بێ تەمو مژ .

---

١ ) سورة الشمس / ٧-١٠

٢ ) سورة يونس/ ٩٩

٣ ) سورة الانسان / ٣

٤ ) سورة البلد/ ١٠

٥ ) سورة النحل / ٣٥

دەبینین چۆن ئەم ئایەتە نکۆڵی دەکات لەدەست گرتنی بت پەرستەکان بەبیرۆکەی زۆرەوە ، چۆن داواکەیان دەداتە دواوە و دەڵێن ڕێنمونی کردنیان و گومڕابونیان ملکەچی ویستی خوایی و و چۆن خوا یاری و گاڵتەو مەسخەرە دەکات بەعەقڵی ئەوان، دەفەرموێت پێیان کە ئەوان یەکەم کەس نین کەکەوتونەتە ئەم هەڵەناشرینەوە ،بەڵکو بێباوەڕانی پێش ئەمانیش هەمان بۆچون و کردەویان هەبووە.

## زۆرگەرایی و قەزاو قەدەر

پشتیوانانی زۆر دەستیان گرتووە بەدوو بیرۆکەی قەزا و قەدەرەوە و لێکان داونەتەوە و ڕاڤەیان کردوون بەڕاڤەکردنێکی هەڵە لەسەر ئەو بناغەیەی کەم دوو وشەیە چەمکی زۆر دەگەیەنن (دەدەن بەدەستەوە) ئەوەی مرۆڤ ڕووبەڕووی دەبێتەوە بەدرێژای ژیانی لەچاکە یان خراپە لەسەری نوسراوە و هەڵاتن و قوتاربوونی نیە لێی وەئەم بیرۆکە سادە و ڕواڵەتیە ڕاڤەکردنی قەزاوقەدەردا هێشتا دەستاو دەستی پێدەکرێت لەنێوان خەڵکە سادەکاندا سەرەڕای پێشکەوتنی شارستانی و هزری مرۆڤەکان. لەوقیع دا وشەی (القضاء)واتە بەدیهێنانی ڕووداو گەلێك کە لەزانستی خودادا ڕابردووە (خوای گەورە زانیویەتی) پەروەردگاری زاناو کاربەجێ ویستویەتی لەبەرچەندان حیکمەت و سودی ئادەمیزادەکان وە وشەی (قدر) لەکردار (فعل)ی قدرەوە هاتووە واتە: خەملاندی و ڕێکی خست و یاسای بۆ دانا هەموو شتێکی هاوسەنگ کردووە ڕێژەی هەموو بەشێك لەبەشە پێکهێنەرەکانی چیەتە ئاوێتەکانی دیاری کردووە بۆ نمونە ئاو پێك هاتووە لە ( $H_2O$) پەیوەندی لەنێوان قەبارەی ئەستێرەکان و دووری نێوانیاندا بێگومان زانستی نوێ سەلماندویەتی کەئەنداوەی ماوەی دووری نێوان ئەستێرەکان دیاری کراون وە ئەم پەیوەندی یەیە کەیارمەتی بەردەوام بوونی یاساکانی گەردوون دەدات ڕێگرە لەبەردەم پێکداکێشانی ئەستێرەکاندا و تەنە ئاسمانیەکانی تردا ئەگەر بهاتایە ماوەی نێوان ئەستێرەکان کەمتربوایە لەئێستا ئەوا بێگومان زیندەوەرەکان لەسەر ئەستێرەی زەوی لەناودەچوون بەهۆی هێزی گەرمی تیشکی خۆرەوە ، ئەگەر ماوەکە زۆرتر بوایە ئەوا زۆربەی زیندەوەرەکان لەسەر زەوی نەیان دەتوانی بژین. خوای گەورە هەموو شتێکی بەباشی پوختەیی دروست کردووە ، سیستەم و یاسا لەهەموو بوارەکانیدا زاڵهەر ئەو هەموو شتێکی هاوشەنگ کردووە و

ئەندازەی تایبەتی داوە بەهەموو شتێك لەسیستەمی گەردونیدا ولەپەیوەندی هەموو شتێك لەدروست کراوەکان بەیەکترەوە وەخوای گەورە فەرمویەتی ﴿ إنّا كلّ شيء خلقناه بقدر﴾ [1] واتە ئێمە هەموو شتێکمان بەئەندازە دروست کردووە واتە پاش ئەندازە بۆ دانانی و هاوسەنگ کردنی، کەواتە ئەو یاساو سیستەم گەلێکی داناوە تاژیان مانی ، بونمانی لەسەر بەرێوە بچێت هەروەها ژیانی دروست کراوەکانی تری گەردوون بەپێی ئەوەی وتمان (قدر) مانای ئەوە نیە کەشتێکی نوسراو فەرزکراو هەیە لەسەر کەسێك کەدەبێت هەر مل کەچی بێت بیەوێت و نەیەوێت (پێی خۆش بێت یان پێی ناخۆش بێت) وشەی (قەزا )یش واتە کار و بەمانای دروست کردن و ئەندازەدانان دێت هەروەك بەچەند واتایەکی تر هاتووە وەك لەم ئایەتەدا ﴿.... فأقضِ ماأنتُ قاضٍ..﴾ [2] واتە هەرچیەك دەکەی بکە لەئایەتێکی تردا هاتووە ﴿وقضى ربّكَ ألا تعبدوا إلا إياه...﴾ [3] واتە پەروەردگاری تۆ بڕیاری داوە کەکەس نەپەرستن جگە لەونەبێت . وشەی (قَضى):واتە فەرمانی کردووە ،هەندێجار بەمانای دەستبەتاڵ بوون لەکارێك و جێبەجێ کردنی دێت دەوترێت :قَضَيتُ خاجتي واتە دەستم بەتاڵ بوو لێی، وەبەمانای (دوای هاتن) (الانقضاء) و بەجێهێنان دێت دەوترێت (قَضَيتُ ديني) واتە هەستام بەبەدیهێنانی ، هەندێك جاریش بەواتی تەواوکردن (الاتمام) دێت، وەك لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿ فإذا قَضيتُ الصلاة ،فأنتشِروا في الأرض﴾ [4] واتە: هەرکاتێك نوێژ ئەنجامدرا پاش ئەوە بەسەر زەویدا بڵاوببنەوە. وێنەی ئەم ئایەتانەی ڕابورد چەندان ئایەتی ترهەیە کەئەوە نیشان دەدات کەوشەی (القضاء) مانای ئەوە ناگەیەنێت (ئەو مانایانە نادات بەدەستەوە) وەك هەندێ لەوکەسانەی دەڵێن کەنەخاوەنی هێزی قوڵ بوونەوە نەخاوەنی تێگەیشتن و زانینی ڕاستن [5]

---

١ ) سورة القمر

٢ ) سورة طه/ ٧٢

٣ ) سورة الأسراء / ٣٣

٤ ) سورة الجمعة / ١٠

٥ ) لەفەرهەنگی لسان العرب بەندی قاف پیتی یاء ج ٢٠ ل ٤٧ قضى :القضاء :بڕیار . زوهری فەرمویەتی وشەی (القضاء) لەزماندا چەند واتایەکی هەیە هەموو دەگەڕێنەوە بۆ واتای (بڕانەوەی شت و تەواو بوونی) هەرشتێك بە لوکەی بکرێت وتەولو ئەنجام بدرێت یان جێبەجێ بهێنرێت یان بەواتای

←

**نرخاندنی ڕێچکەی زۆر:-**

بێگومان ئەم ڕێچکەیە لەگەڵێك ڕووەوە ڕەخنەی لێگیراوە لەوانە ئەمانەی خوارەوەن:—

١— تێیدا دانراوە بەپێ سپاردنی مرۆڤ و داوالێکردنی بەشێك کەلەتوانیایدا نیە ، چونکە ماناو ناوەڕۆکەکەی ئەوەیە مرۆڤ لەسەری نوسراوە کەشتێك ئەنجام بدات ، لەهەمان کاتدا داوای لێدەرکرێت کەپێچەوانەی دژی ئەو کارەبکات بۆ نمونە : لەسەر مرۆڤ نوسراوە کەفلان کەس بکوژێت پاشان لێی قەدەغەکراوە کە ئەم کوشتنە ئەنجام بدات لەهەمان کاتدا .

٢—ئەگەر ئەم ڕێچکەیە ڕاست بێت ئەوا ڕێسا شەرعی و یاسایی و ئاکاریەکان هیچ نرخێکیان نیە ، چونکە ئەمە مانای ئەوەیە کەدابشکردنی پاداشت وسزا بەڕێگەیەکی کوێرانەیە و لەسەر ستەم ناهەقیکردن وەستاوە . ئەگەر دوو وشەی (القضاء ، قَدَرْ) بەتوزیمی سەپاندن و زۆرلێکردن ڕاڤەبکرێت ئەوا پاداشت و سزا و پەیمان(گفت) و (هەڕەشە)، داوالێکردن و داخوازی و قەدەغەکردن پوچ و بێ مانا دەبن و لەلایەن خواوە لۆمەی تاوانبار ناکرێت و سوپاسی چاکەکاریش ناکرێت و چاکە کارلەپێشتر نیە لەستایشی سوپاس کردندا لەتاوانکار.

٣— ڕێچەکی زۆرگەرایی بەئەنجامدەری کۆمەڵێك کاردەداتە قەڵەم بێ ئەوەی هیچ بڕیارو سەرپشککراوی دژایەتی و توانایەتی هەبێت لەوەرگرتن و دانەدواوە لەبەرئەوە بەرپرسیاری سزایی و پاداشتی لەبناغەوە هەڵدەتەکێن وەلەگەڵ ئەوەشدا ستایش و پاداشت و لۆمە و سزا هیچ مانایەکی نابێت، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ئەم شتانە لەشەریعەتی ئیسلامدا و یاسادابوونی هەیە بەڵکوو بونی شەرع و یاسا بەم شتانەوەیە و هەڵوەشاندنەوەیان دەبێتەهۆی هەڵتەکاندنی شەرع و یاسا لەبناغەیانەوە.

---

بەپێویستی گێڕا یان جێبەجێی کرد یان بڕیاری داو ولاتۆی لەسەر کرد ، هەموو ئەم واتایانە لەفەرموودەدا هاتوون لەوانە قەزایەك قەدەری لەگەڵ دابێت ، مەبەست بەوشەی (قَدَرْ) ئەندازەدانان و مەبەستیش لەوشەی (القضاء) دروست کردنەو (فقضاهن سبع السنوات ) واتە دروستی کردون ، کەواتە (القضاء — قَدَرْ) پەیوەستی یەکترن ،یەکێکیان لەوی تریان جیانابیتەوە ، چونکە یەکێکیان وەك بناغە وایە کەئەویش (قَدَرْ) ئەوی تریان کە(القضاء)یە وەك دیوار وایە هەرکەسێك بیەوێت جیایان بکاتەوە ئەوا ویستویەتی بیناو دیوارەکە بڕوخێنێ و هەڵتەکێنێ.

٤- رێچکەی زۆرگەرایی جیاوازیەکانی نێوان بکەری چاکە و بکەری خراپ نەهێلّن چونکە هەریەکە لەم دووانە بکەرو ئەنجامدەری راستەقینەی ئەو کردەوەیە نیە کەپێی هەلّدەستێت ، هەروەها لەنێون کەسێکدا کەبە ئەنقەست کارێك دەکات یان بەزانین و ویست هەلّبـژاردن و لەنێوان کەسێکدا بەهەلّە یان لەبیرچوون یان بەناچاری کارێك ئەنجام دەدت.

٥-ئەگەر ئەم رێچکەیە راست بێت ئەوا دەبێت تاوان بدرێتە پالّ خـوا بۆنمونـە ئـەوترێت لەبارەی تـاوانی زینـاوە ، خوازیناکـەر و لـەبارەی تـاوانی کوشـتنەوە خوابکوژە بێگومـان، سەلماوە کەخوا وانیە بەکۆدەنگی عاقلّان و فەیلەسوفەکان هەروەها مەلزومەکەش.

٦-ئـەم رێگەیـە هـیچ نیـە-ئەگـەر روخانـدن نـەبێت -هەلگێرانـەوە و ئـاوەژوو کردنـی بەرنامەخوایی و یاساکانی و مرۆڤ بـەهاکانی نـەبێت چـونکە نکولّی کردنـە لەیاسـی خـوایی کەسزای خراپکار دەدات لەسـەر خراپـەکردن و پاداشـتی چـاکە دەداتـەوە لەبەرچـاکەکەی ،بەپێی یاسا مرۆڤ کردەکان.

٧- رێچکەی زۆرکار راسـتی ئـەو هەسـتەمان هەلّدەوەشێنێتەوەکەهەسـت بەویسـتێکی تایبـەت کەینبـەخۆمان و ناچـارنین کـەزۆرلێکراو و ناچـار نیـە بـەهۆی فاکتـەرێکی زەروری ناوەکی یـان دەرەکـی یـەوە بـەرەو رێگەیـەکی دیـاری کـراو ئاراسـتە بگـرین، بـەهۆی ئـەم ویستەوە هەلّدەستین بەو کارانەی کەئەنجامیان دەدەین، و ئەوکارەنانەیش کـەخۆمان یـان لێبـەدوور دەگـرین و لەژێرفشـاری زۆر دانـین ، ئێمەهەسـت دەکـەین بەمـە چـونکە ئێمـە پەشیمانی دەمانگرێت بـەلّکو حەسرەت دەمانگرێـت لـەکاتی شکسـتخواردن لەپرۆژەکـدا و زیان کردن لەبازرگانیەکدا لەبەرئـەوەی ئێمەتـەواو دلّنیـاین لـەوەی کـە دەمـانتوانی بگەینـە مەبەسـتەکەمان ئەگـەر کەمتەرخـەمیمان نەکردایـە لەهـەولّ دا بـۆ گەشـتن بەسـەرکەوتن لەوکارانەماندا.

کورتـەی قسـەی ئێمـە لـەناخی خۆمانـدا ئـەوەمان لاسـەلماوە و باوەرمـان پێـی هەیـە کـەخاوەن ویسـتی ئـازادین و دەرون مـان شـایەتیمان لەسـەر دەدات بـەوە، دان دەنـێین بەبەرپرسیاریەتیماندا، دەبینین هەموو میللـەتان لەجیهانـدا دانیـان نـاوە بەبەرپرسـیاریەتی مرۆڤـدا لەسـەر بنـەمای ویسـت و زانـین و دانـانی یاسـاکان بـۆ رێکخسـتنی پـەیوەنی یـە خۆویسـتەکان و پێـك هێنـانی دادگاکـان بـۆ لێپرسـینەوەی تاوانبـاران لەسـەر کـردەوە تاوانکاریەکانیان.

# جێباسی سێیەم:
# ڕێچکەی میانڕەو و ناوەند

بێگومـان هەریـەك لـەم دوو ڕێچـکەیە (ئاراسـتە)ی ڕابـردوو ئەندازەیـەك بـەرگری و پێلێهەڵبڕین هوشەکاری دەگرێتەخۆ ،لەبەرئەمە هەندێ لەفەیلەسوفە موسـوڵمانەکان شـێواز و ڕێبازی میانڕەو و ناوەندیان هەڵبـژاردووە وەئـەم ڕێچـکەیە ئەشـعەریەکانیش کردویانەتـە ڕێڕەو لەفەیلەسوفە موسڵمانەکان، لە هەوڵـەکانی ئـەم ڕێچـکەیە یەکخسـتنەلەنێوان ئـازادی ڕەها و زۆرگەریدا بەهۆی ئەم نۆخەمیانـەوە کـە أبـو حسـن کـوڕی إسماعیـل ئەشـعەری [1] بانگەوازی بۆ کردووە و کاری ئەم زانایە ئەوەبوَ کەناوەڕاست گیری دەکرد و دەکەوتەنێوان ڕاجیاوازەکان ، هەڵسا بەبنیات نانی ڕێچکەیەکی میانڕەوانە کەلە ڕۆژهەڵات و وڵەتەکانی تری جیهانی ئیسلامی بەڕێبازی (أهل السنة) دەناسرێت هەروەك نـاوی (ڕێـڕەوی ئەشـاعیرەی ) بەسەردا براوە. بێگومان ئەم ڕێچکەیە تواتنیویەتی ئەو شتانەی شایستەیە و شـیاوی خـوان بداتە پاڵی بێ ئەوەی مافی مرۆڤ بەرتەسك بکاتەوە ، ئەو کارانە بداتە پـاڵی کـەخوای گـەورە تێیدا بەدی دەهێنێـت وەبێگومـان پێشـەوا ئەشـعەری ئـەو شـتەی هێنـا کـەپێی دەوترێـت (بیردۆزەی بەدەست هێنان و پەیداکردن) ئەمیش مانای وایە ئـەو جیهانـەی کەئێمـەی تێـدا دەژین جیهانی هۆکارەکانە لەوێدا هۆکار و بەهۆکار هەیە (ئەنجامـەکان)، ڕۆڵـی مـرۆڤ تـەنها بەدەستەوەگرتنی هۆکارەکانـە، خـواش خـۆی خولقانـدنی ئەنجامـەکان دەگرێتـە دەسـت، کەوابوو مرۆڤ پەیداکەرە (الکاسب) بەهۆی هێزی پەیداکەر و بەست هێنەوە (القدرة الكاسبة) و خوای گەورەش بەدیهێنـەرە بـەهێزی خولقێنـەرە پێشـەوا لای وایـە کەیاسـای خـوا وایـە کەپێکەوە بەسران لەنێوان کـاری خـولقێنرا و دروسـت کـراو هێـزە خولقێنەرەکەدا هەیـە ،

[1] أشعري أبو الحسن(٢٦٠ – ٣٢٣ن) إسماعيل کوڕی اسحات لەنـەوەی هـاوەڵی شـکۆداری پێغەمبـەری خوایە کەناسرلوە بە أبو موسی ی أشحری ئەو ڕای وایە کەمرۆڤ ویست و هێزی تایبـەتی هەیـە هـەروەك موعتەزیلەکان دەڵێن بەڵام ئەم ویست و هێزە کاریگەرنین لەدروست کردنی کاروکرداردا بەڵکو خۆیشـی مل کەچی ویستی خواو دروست کراوی ئەوە –ینظر موسوعة الفلسفة وفلاسفة ب /ل١٤٩

کاتێك کەبەندە (الحبد) ویستی کارەکەی هەبێت و هۆکاری کارەکە بەکاربهێنێت وە ئەم کارە (کردەیە) بەپەیداکردن ناو دەبرێت ، کەوابوو کارەکە خولقاندن و دروست کردنە لەلایەن خواوە و پەیداکردن و بەدەست هێنانە لەلایەن بەندەوە.

رای ئەشعەریەکان نزیك دەبێتەوە لەرای فەیلەسوفە رۆژئاواییەکان کەباوەریان بەتیۆری رێکەوتن (نظرية الأكفاقية)یان تیۆری دۆخەکان (نظرية الظروف) و بۆنەکان هەیە، کەئەوە دەگەیەنێت لەراستیدا هەموو هۆکارێك دەگەرێتەوە بۆ خوا و هی خوایە،بەلام بەوشێوەیە دەکەوێتە بەرچاو کەدەبینرێت ئەگەر بارودۆخانێکی تایبەتی یان نامرۆڤانە(واتە جگە لەمرۆڤەوە) هەتتا مرۆڤ رادێت بەخەیاڵی دا کە ئەو کۆمەڵە بارودۆخە بەدیهێنەری ئەو کارەن وە لەلایەنگران و پشتیوانانی ئەم تیۆرە(بیردۆزەیە) (مالبرانشی) فەیلەسوفە [1] بەلام زۆرێك لە لێکۆڵەران قسەی پێشەوا ئەشعەریان کەدەڵێت (الكسب) بەمەتەڵ زانیوە (داوەتە قەڵەم) و بەگرێیەکیان داناوە کەهەرگیز چارەسەر کردنەوەی نیە. پێشەوا (ابن تیمیة) [2] (رەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت:- ئەشعەری قسەیەکی عەقڵ پەسەند ناڵێت ، بەڵکو لەراستیدا قسەکەی قسەی (جهم) ی کوری معبد الراسی (الجبرية) زۆر گەرایە کەدەڵێت: بێگومان بەندە هیچ توانا و هێز و کردەوە و پەیداکردن .........هتد نیە.وەلەدیدگای خاکینەی (المتواضع)ئێمەوە ، رای پێشەوا تەندروست و ساغە و روون و ئاشکرایە و تەم و مژی بەسەرەوە نیە ، مەتەڵیش نیە ، بەڵکورێباز و ئاراستەیەکی دروست و راستەو واقیع و لۆجیك و عەقڵی ساغ پشتگیری لێدەکات، ابن وشد فیلوسوف قرطبة [3] ئەم رێرەوە میانرەوەمان بۆ روون دەکاتەوە و بەشێوەیەك کەهیچ مشتومر و تاوتوکردن هەڵناگرێت کەدەڵێت و ئەمە واتاکەیەتی:- بێگومان خوای گەورە هێزێکی پێداوین کەبەهۆیەوە یەکێك لەدوو دژەی پێ ئەنجام دەدەین ، ئەویش هێزێکی نادیارەو پێی دەگوترێت (ویست) ئەم ویستە دروست کراوی خوای گەورەیە لەکاتێکدا وەو وەنجامانەی وەم هێزە بەدی دێنێت بەمانای وشە بەئەنجامگەلێکی مرۆڤ دەدرێتە قەڵەم.

---

١ ) رؤوف عبيد – التسيير والتخير بين الفلسفة العامة والفلسفة القانون ل٢٤٣

٢ ) ابن تيمية – الثبوات / ل ٩٧

٣ ) ( ٥٢٥ ك – ٥٩٥ك)

واتە لەلایەن خودی مرۆڤەوەیە لەگەڵ ئەوەشدا ئەم هێزە نادیاریە هەموو ئازادیەکی خۆی نەدراوەتێ ، ئەمەش لەبەرئەوەیە دەکەوێتە ژێر هۆکارە دەرەکیەکانەوە کەخوای گەورە لەبەر دەستماندا دایناوە کەواتە ئەم هۆکارانە یارمەتیدەری تەواوکردنی کارەکانمان یان ناهێڵن هیچی بەجێ بێنن ، ئەمانن کەهەڵبژاردنمان دیاری دەکەن بۆیە کاتێك لەچارەنسەرە جۆرەبەجۆرەکانمان ( جیاوازەکان ).

رَبِّ زِدْنِي عِلْماً وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِين

# لۆژیکی یاسایی
# له وێناکردندا

نووسینی

**دکتۆر مصطفی زەڵمی**

وەرگێڕانی

**کەمال شێخ محەمەد**

# کۆبەرهەمی دکتۆر مستەفا زەڵمی لە شەریعەت و یاسادا


**پرۆژەی وەرگێڕانی**
**کۆبەرهەمی دکتۆر مستەفا زەڵمی لە شەریعەت و یاسادا**

سەرپەرشتیاری پرۆژە
ڕێدار رەئوف ئەحمەد

---



## المنطق القانوني في التصورات

## لۆژیکی یاسایی لە وێناکردندا


نووسینی : دکتۆر مصطفی زەڵمی
وەرگێڕانی : *******
پێداچوونەوەی : توفیق کەریم
نەخشەسازی : جمعە صدیق کاکە
نۆرەی چاپ : چاپی یەکەم ٢٠١٧

نرخی هەر بیست و شەش بەرگ
**٢٥٠٠٠٠ دینار**





**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٧٤٤ ) ساڵی ٢٠١٦ی پێدراوە**

﴿ يُؤْتِي الْحِكْمَةَ مَن يَشَاءُ وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُوا الْأَلْبَابِ ﴾

سورة البقرة/٢٩٦

**(عليك بالحكمة فإن الخير في الحكمة)**

الحديث الشريف

**(من لا معرفة له بالمنطق لا ثقة بعلمه)**

الغزالي

**(المنطق ميزان العلوم)**

ابن سينا

## ناوەرۆك

# دەست پێك (پێشەكی)

سوپاس شایستەی خوای خاوەن شكۆوكاربەجیٚ یەكەفەرمویەتی(هەركەسێك كاربەجێو، قسەلەجێیی پێدرابێت، ئەوابەڕاستی خێروفەرێكی زۆری پێبەخشراوە) [1]، درودو سلاّولەسەر پێغەمبەری خوا بێت كەپێی ڕاگەیاندین، قسەی جوان وبەجیٚ ون بوی(ضالة) باوەڕ دارەكەلەهەركویٚ دۆزییەوەئەواشایانەبە هەلگرتنەوەی. وەلەسەرخزمەباوەڕدارو هاوەڵەكانی كەلەباشترین مرۆڤەكانن بەهۆی تێگەیشتنیان بۆلۆژیكی قورئان. پاشان:

بەڕاستی خوای گەورە بەشكۆ و گەورەیی خۆی یارمەتیدام بۆفێربونی زانستی لۆژیك لەساڵی ١٩٣٨ز وە ، پاشان خوێندنی یاسای بۆرێك خستم لەساڵی ١٩٦٠ز دا، پاشان هەتازانستم لەلۆژیك و یاسادا زیادی بكردایەئەوازانیاریم بەتۆكمەیی وبەهێزی پەیوەندی نێوان ئەودوانەزیادی دەكرد، ئەویان بەهۆی ڕێكخستنی بیروگەرانەوەوئەمیان بەهۆی ڕێكخستنی كارەكانەوە. وەبیروكردەوەدووبرالەو(شەنگاڵەن) هەریەكێك لەوان ئەوەی تریان تەواودەكات. وەهەست كردن بەم پەیوەندیەبەهێزەلەنێوان یاساولۆژیكدا فاكتەروهۆكاروپاڵنەرەبۆپێشكەش كردنی ئەم ئەرك وماندوبوونەبە هەلگرانی یاسا، سەرەڕای بوونی بەربەستوكۆسپە(لەمپەرە) خودی و دەرەكیەكان، داوای یارمەتی وسەركەوتن لەخوای گەورەدەكەم، بەڕاستی ئەوبەسەرهەموو شتێكدابەتواناوزاڵە.

---

[1]. سورەالبقرە/٢٦٩

سروشتی بابەتەکەدەخوازێت کەتوژینەوەکەدابەش بکرێت بەسەرچواربەشدا:

بەشی یەکەم:پێناسەی لۆژیك(ژیربێژی)

بەشی دووەم:پەیوەندی نێوان لۆژیکی زمانی ولۆژیکی یاسایی

بەشی سێ یەم:پرەنسیپەکانی وێناکردنەلۆژیکی یەکان وزاراوەیاسایی یەکان

بەشی چوارەم:مەبەستەکانی(ئامانجەکانی) وێناکردنەلۆژیکی یەکان وپێناسە یاسایی یەکان.

## بەشی یەکەم

پێناسەی لۆژیك(المنطق)

توژینەوەلەپێناسەکەدا دابەش دەکرێت بەسەرسێ باسدا:

یەکەم:بۆپێناسەکردنی لەزمان و زاراوەدا

دووەم:بۆسەرهەڵدان وگەشەسەندنی

سێ یەم:بۆگرنگی وبابەتەکەی

## بەندی یەکەم:
## پێناسەی لۆژیك

### لۆژیک لەزماندا:

بەماناقسەکردنە

دەوترێت: (نطق نطقا) واتـە: قسـەی کردبەقسـەکردن، و(أنطقـه غـيره) کەسـێك ئـەمی هێنایەقسەو (ناطقه) :هێنەرەقسەیەتی و(استـنطقـه) :واتە:قسـەی لەگەڵداکرد، زمانپـاراو، (ناطق) یش بەشێوەیەکی ڕەها زیندەوەر دەوترێت نەبێدەنگی هەیەنەگۆیا. کـەوابو(نـاطق) :واتـە زنیـدەوەرە، (بێـدەنگیش) جگـە لەزینـدەوەر، قسـەی هەموشـتێك، (منتیقـي[1] ئەوشتەیە:ئەم وشەیە(المنطق) بێگومان بەم واتایە هاتووەلەقورئانی پیرۆزدا(وورث سـليمان داوود وقال ياأيهاالناس علمنامنطق الطير وأوتينامن كل شئ إن هذا لهوالفضل المبين) [2]

### (منطق) لەزاراوەدا:

ئـەم زاراوەیـە وەرگێڕانـەبۆ وشـەی یونـانی(logike) لۆژیـك، کەوشـەی(logic ) ئینگلیزی و()logigueفەرەنسی کەبەمانای بیرکردنەوەیان بەڵگەهێنانەوە لەسەرێژەکان وپەیوەنـدی هەنـدێکیان بەهەنـدێکی تریانەوەلـەڕوی عەقڵـەوە، موسـڵمانەکان وشـەی( logike ) ی یونانیـــان بەوشـــەی(منطـــق) وەرگێـــڕاوە، بۆگەیانـــدنی واتـــای

[1]. لسان العرب لابن قطور(جمال الدين محمد بن مكرم النصاری( ٦٣٠-) طبقة مصورة عن طبقة بولاق ج مادة نطق الصحاح فی اللغة والعلوم تجديد صماح العلاقة الجوهری المصطفی فی العلمية والفنية للجامعات الدينية تقديم العلامة الشيخ عبدالله العلايلی اعداد وتصنيف نديم مرغيشلی واسامة مرغشيلی دار الحضارة العربية بير. ٢١٥٧٨

[2]. سورةالنمل/١٦

بیرکردنەوەوزانســـــتیبەڵگەهێنانەوە.[1] بێگومــــــان زانایــــــانی لۆژیـــــک لـــــەکۆن ونوێداچەندپێناســــەیەکیان کـــــردووە، کەئــــەمانیش جیــــاوازن بـــــەهۆی ڕاجیـــــایی ئەوانەوەلەگونجاندنیدا، فەیلەسوف ومنطق(لۆژیك زانەکان) هەندێجارپێناسـەیان کـردەوە بـەوەی کەئامێرێکـەیان پیشەسـازیەکی یاسـایی یەکەرەچـاوکردنی ڕێسـاکانی زەیـن لـە هەڵەبیرکردنـەوەدەپارێزێت[2]. ئەولەخۆیدامەبەسـت نیـە، لـەگروپی زانسـتەئامێریەکانە نـەك ئامانجی یەکان ، سودی لێوەردەگیرێت لەکاتی جێ بەجێکردنی ڕێساکانیدابەسەر بڕیارەکان ویەڵگەکاریەزانستیەکان دا. هەندێجارپێناسەیان کردووەبـەوەی کەپیشەسـازی و زانسـتێکی تیۆریەپێکـەوە.[3] لەپێناسەفەیلەسـوف و لۆژیـك زانەموسـڵمانەکان پێناسـەکەی فـارابی یەکەدەڵێت:زانســـــتی بیرکردنــــەوەی دروستە(ڕاســـــتە) دەکۆڵێتەوەلەویاســـــاورێگانەی کەتـەنهافێرمان ناکـات چـۆن بیربکەینـەوە، بـەڵکوپێمان دەڵێـت کەپێویستەچـۆن دەبێـت بیربکەینەوەولەپێشــــەکیەکانەوەوردەوردە(پلەبەپلە) بگەیەنەئەنجامـــــەدڵنیایی یـــــەکان وبۆئەمەپێوەرگـەلێکی جیاکردنـەوەمان هـەبێت لـەنێوان ڕاسـت وهەڵـەدا، بۆدانـەدواوەی ئەویەهەڵەچـــــونانەداکەلەوانەیەمرۆڤی تێبکــــەوێت، بێگومـــــان پیشــــــەیەکەکۆمەڵێك یاسادەبەخشێت کەدەبنـەهۆی ئـەوەی مـروڤ بەرەوگەیشـتن بەڕاسـتی وپێکـانی مەبەسـت ببەن، وەبەرەودۆزینەوەی دروست لەوشـتانەداکەلەوانەیە(دەگونجێت) مرۆڤـی تێدابکەوێتـە هەڵەوە[4]. پێشـەوا(غزالي) بشپێناسـەی کردووەبەوەی:یاسـایەکی ئەوتۆیەکەسنوروپێناسـەو پێـوانی دروســت و ڕاســت لەناڕاســت جیادەکاتــەوە، هــەردەڵێی تــەرازوویان پێـودانگی هەموزانستەکانە.[5] ئـەوەی تـێ بینـی دەکرێت لەسـەرئەم پێناسـەیەئەوەیە:کە ووتنـەوەو

---

[1]. المنطق الصوری منذ ارسطو وتطور المعاصر للدكتورسايي النثار طبقة دار نثر الثقافة السكنرية.

[2]. البرهان للعلاقة اسماعيل الكلبونی ل 1

[3]. تەماشای: المنطق ومنهاج البحث العلمی فی العلوم الرياضة والطبيعية للدكتر علی عبد المعطعي محمد دەکرێت دار النشر – الجامعات العربية.

[4]. تەماشای (إحصاء العلوم للفارابی) بکە ، نثر عثمان محمد امين ل١٧

[5]. توماالاکوینی (1225–١٢٧٤) قوتابی البرت الكبير( 1274–١٢٨٠) نووشەی(العصرالوسيط) ی دانا، نوسراوی(الرسطية والاهوت المسيحی) ی نوسی، کەسایەتی گرنگ بووە چونکە هەوڵی دافەلسەفەیەکی

←

دوبارەکردنەوەی پێناسەکەی(إبن سینا) بەهەروەك لەسەرپێناسەکەی ابن سیناوفارابی تێ بینــــی دەکرێـــــت کەهــــــەردوو پێناسەکەئەوەنیشــــان دەدەن کــــــەلۆژیك تایبەتەبەراستیەکانەوەکەچـــی ئەووانیەلەبەرئــــەوەی دەکۆلێتەوەلەهەمووئەوشـــتانەی کەدەچنەژێرچەمکی زانستەوەبەماناگشتی یەکەی(هۆش وبـیری ڕەهـا) هـەروەك لەجێگـەی خۆیـدا باسـی لـێ دەکرێـت، لەپێناسـەکانی فەیلەسوفەکریستیانیەکانپێناسـەکەی قەشـە (تومالاکوینی) [1]کەدەڵێت:لۆژیك ئەوهونەرە(سیستەمە) بەسەرکردایەتیمان دەکات بـێ هـیچ هەڵەیەك لەچالاکیە بەڵگەکاریەکانی (عەقڵ) دا.

وەپێناســـــەکەی(پورت رویـــــاڵ ) دەڵێت:لۆژیـــــك ئەوهونەرەیەکەبیرۆکـــــەدەبات بەرێوەبەچـــاکترین شێوەلەناســـینی شـــتەکاندا. ئـــەوەی تـــێ بینـــی دەکرێـــت لـــەم پێناسانەیداکەناوبراون ئەوەیەتەنهاگرنگیان بەلایەنی تیۆری ڕۆڵی لۆژیك داوەولایەنی کرداری وپراکتیکیـــان خستۆتەپشـــت گـــوێ، لەکاتێکاکـــەلۆژیك یاســـای بەدەســـتهێنانی نەزانراوەکانەلەزانراوەکانەوەلەهەردووبواری تیۆری وکرداری پێکەوە.

پێناسـەی هەڵبژاردە:هەرکـەس بـەقوڵی بـیری فەیلەسـوف ولۆژیـك زانـەکانی تـاوتوێ کردبێـت، بەدواداچـونی بۆبابەتەنوێیـەکانی ژیـانی کردبێـت بـە ووردەکـاری وتێرامانەوەلـە هەموو شوێن وکاتێکدا، بۆی دەردەکـەوێت کـەلۆجیك یاسـای بەدەسـت خستنی(بەدەسـت هێنانی) نەزانراوەکانەلەزانراوەکان بەپێ ی ئاوەزی ساغ.

ڕونکردنەوەی پێناسەکە

ئـــەم پێناسەســـادەیەی ئەوتۆکەهـــەڵم گـــۆزی بۆزانســـتی لۆژیـــك ئەوەنیشـــان دەدات (دەگەیەنێت) کەلۆژیك کۆمـەڵێك ڕێسـایە، هەیانەسروشـتی یـە(فطریـة) وهەشیانەبەدەسـت هێنراوە( کسبیە) کەپـەیرەوکردنیان عـەقڵ لـە هەڵـەدەپارێزێت لـەکاتی پرۆسـەی(عملیـة) بەدەسـت هێنـان وپەیـداکردنی نـەزانراوەکان لـەزانراوەکان لـە هــەردوو بـواری تیـۆری وپراکتیکی(عملی) دا، مەبەست بە هەڵەلێرەداوێناکردنی شتە بـە دیوەناڕاستینەکەیدا (غیر

---

ئەودیوسروشتی لەسەربناغەی ئەزمونی دابخەرزێنێت—تەماشای (الموسعة الفلسفیة المحنصرة) بکەو وەرگێڕانی فوادکامیل، جلال العشری، وعبدالرشیدالصادق. ل ٢٣٧

[1]. سورة ص/٢٠

حقیقـة) وە(عـەقڵ وزەیـن ودڵ) ودەمـاغ یـان بەشـە[1] سـەرەکیەکەی کـە(مۆخ) ە، ئەمانـە وشەگەلێکی هاوواتان بێ گومان مرۆڤ هەرزۆرلەزووەوە(مێشك) وگرنیەکەیی لە ژیاندا زانیوە ، بابلیەکان وتویانە:ئەوسەرچاوەی ژیـان وسـۆزە، پزیشکەپسـپۆڕەکان لەسـەردەمی نوێـدا لایان وایەکـە (مێشـك) پێك هاتوەلـەمۆخ ومۆخەبچـوك ولانکـە(المهاد) وپێشـەوەی دەمـاغ وپیـازە(البصـلة)[2] (مـوخ) ئەوبەشەیەلەمێشـك کـەوەك تـاج وایەلەسەرداوبەسەرشـوێنەوە، چـونکەزاڵ و بەڕێوەبەروتەکبیرکـەرە، لەهـەمور شـوێنێکی لەشـەوەزانیاری پێـدەگات تافەرمانبدابەوەی مێشك دەیخوازێت.[3]

## باسی دووەم:
## سەرهەڵدانی لۆژیك وگەشەسەندن و چونیەتیەکەی

لەگـەڵ گەشـتنی عـەقڵی مـرۆڤ بەپلـەی پێگەیشـتن وتـەواوی لۆژیـك سـەری هەڵـدا، چونکەکارکردن بەخواستی عەقڵی سـاغ کـارکرد نەبـەلۆژیك، هـەروەك کاربـەجێیی بریتیـە: لـەهاوکاری نێـوان عـەقڵ و[4] نـەقڵدا لەهـەڵس وکەوتـەکرداری و وتاریـەکانی مرۆڤـدا، چونکەگوتراوە: بێ عەقڵ و هۆش هیچ بەرهەمێك نابەخشێت لەبەرئەوەی جێ نیشانە(مناط) ی داوا لێکـردن لەسـەرعەقڵ بنیـات نـراوە، وەعـەقڵ تـەنهاناتوانێت ڕابـەرێتی مـرۆڤ بکـات بەڕابەرایەتیـەکی ڕاسـت ودوورلەهەڵـە لـەدانان ورێکخسـتنی پێشـەکیەکانی سـەرکەوتن لەبەدەست هێنانی پێداویستی یەکانی ژیان زۆرکەس هەبوو عەقڵ وای لێکردن کەژیان پێش

---

[1]. ئەمەکاتێکەبەکاربهێنرێت لەبواری تیۆری وبیرکردنەوەداهەندێك پێی دەوترێت (البصرة) چاوساغی ، بەڵام دڵ(القلب) بریتی یە لە دەسگایەی کە سەرچاوەی سوڕانی خوێنە لە لەشدا.

[2]. الدماغ البشری للدکترطارق ابراهیم حمدی المرسرعة الکبیرة وقك ٧٤ل١٠

[3]. تەماشای‌الدماغ البشری، سەرچاوەی ڕابوربویکە ل١١

[4]. النقل چاوگەبەواتای(منقول) دێت واتەئەوەی لەجیلێکەوەبۆجیلێکی تردەگوازێتەوە، وەك دەقەشەرعیەکان، یاسایی یەکان، مێژووداب ونەریت و وێنەی ئەمانە

بخەن لەجیهانی تەکنۆلۆژیاو، ژمێریاری و ژێرپکێف خستنی بۆشایی ئاسماندا، بەلاَم عەقلّ نەیتوانی لەپەسنی خراپ ولەشێوازی عاقلاَنەڕوتیان بکاتەوە لەڕێی دابینکردنی بەرژەوەندیە تایبەتەکانیان لەسەرشانی مەرگەسات وتراژیدیاوپاش کەوتنی گەلەلاوازوبن دەستەکان. بێگومان قورئانی پیرۆزلەگەلێك لەئایەتەکانیدائاماژەی کردوەبۆڕۆلّی لۆژیك لەڕێنمونی کردنی مرۆڤدابۆسەرڕێگەی ڕاست. وەلەوئایەتانە ئەمانەی خوارەوەن:

لۆژیك بەکار هێنان لەلایەن گەورەمان ئیبراهیم باوکی پێغەمبەرانیش پیغەمبەرایەتی بۆ ئارِستەکردنی گەلەکەی لەم ئایەتەوەدەردەکەوێت: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ لِأَبِيهِ آزَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا آلِهَةً إِنِّي أَرَاكَ وَقَوْمَكَ فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ (٧٤) وَكَذَلِكَ نُرِي إِبْرَاهِيمَ مَلَكُوتَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْض [1]وَلِيَكُونَ مِنَ الْمُوقِنِينَ (٧٥) فَلَمَّا جَنَّ [2]عَلَيْهِ اللَّيْلُ رَأَى كَوْكَبًا[3] قَالَ هَذَا رَبِّي[4] فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ لَا أُحِبُّ الْآفِلِينَ[5] (٧٦) فَلَمَّا رَأَى الْقَمَرَ بَازِغًا[6] قَالَ هَذَا رَبِّي فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ لَئِنْ لَمْ يَهْدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ الْقَوْمِ الضَّالِّينَ (٧٧) فَلَمَّا رَأَى الشَّمْسَ بَازِغَةً[7] قَالَ هَذَا رَبِّي هَذَا أَكْبَرُ فَلَمَّا أَفَلَتْ قَالَ يَا قَوْمِ إِنِّي بَرِيءٌ مِمَّا تُشْرِكُونَ (٧٨) إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ٧٩﴾[8] واتە:تۆبیری ئەوکاتەبکەوەئیبراهیم بەباوکی خۆی وت (کەئازەرە) : ئایابۆئەوبتانەئەکەی بەچەندخوایە بۆخۆت ودەیان پەرستی جگەلەخوا؟بەڕاستی من تۆوتاقمی تۆلەگومڕایی ئاشکرادادە بینم، هەربەوجۆرەی بۆئیبراهیمان دەرخست گومڕایی گەلەکەی وخراپەی بت پەرستی ئێمەنیشانی ئیبراهیمی دەدەین گەورەیی خولودەستەلاَتی خواو دروست کردنی ئاسمانەکان وزەویی وئەوشتانەی لەوانداهەن لەکاری‌سەرسوڕێنەرویەك خەرهەتابن لەسەربوونی خوای تاکوتەنهابەبەلگەی

[1] . بەلگەهێنانەوە بەئاسەوار لەسەر بوونی خاوەن ئاسەوار کەلەلۆجیکدا بەبەلگەی (إنی) ناودەبرێت
[2] . تاریکداهات
[3] . ئەستێرەیەکی درەوشاوە
[4] . بەپێی وتەی هۆزەکەی
[5] . بەهەلّهاتویی کەڕواکیەکەی سەر زەوی پڕدەکات
[6] . بەدەرکەوتوی
[7] . هەلدیت و بەروناکیەکەی سەر زەوی پر دەکات
[8] . سورةالأنعام/٧٤–٧٩

دڵنیاکەر، وەئەوەئیبراهیم بیبیٚ لەوکەسانەیکەبیروباوەڕیان چەسپاوەگەیشتون بەپلەی بێگومان خواناسین. دوایی کاتیٚ تاریکی شەودای بەسەرئیبراهیما، ئیبراهیم ئەستێرەیەکی بینی لەوئەستێرانە کەگەلەکەی دەیانپەرست ورووناکی دایەوەوتی: ئەمەیە پەروەردەکەری مــن، دوایــی کــاتیٚ ئەســتێرەکەئاوابوو ئیــبراهیم ئــەقڵی گەلەکــەی خــۆی ئاگادارکردەوەوتی:خۆشم ناویٚ ئەوشتانەی ئاوابن ونەبینرێن هەرشتیٚ وابیٚ شایستەی خوایەتی نیە، کاتێك مانگی بینی بەهەڵهاتویی وتی:ئەمەپەروەردگاری منە. کاتێك ئاوابووتی:ئەگەرخوارێنمونیم نەکات دەچمەناوگرویی سەرلێشێواوانەوە. پاشان کاتێك خۆری بینی بەهەڵهاتویی وتی: ئەمە پەروەردگاری منە. ئەمەلەهەموویان گەورەترە. کاتێك ئەویش ئاوابووتی: ئەیگەلەکەم من دوورم وبەریم لەوانەی دەیانکەنەهاوەڵی خوا ، بەڕاستی من ڕوم کردەئەوزاتەی کە ئاسمانەکان وزەوی دروست کردووەومن لەگرویی هاوتاپەیداکەران نیم) . خوای گەورە منەتی ناوەتەسەرهەندێك لەپێغەمبەران بەوەی ڕێنمونی کردوون بۆهەڵس وکەوتی لۆژیکی وجوڵانەوە بەپێی خواستی عەقڵی ساغ وکاربەجێیی پێبەخشیون، بۆیە لەبارەی داود پێغەمبەرەوەفەرمویەتی: (وشددناملکه وواتیناه الحکمه وفصل الخگاب) ١ واتە:دەسەلاتمان تۆکمەوبەهێزکردووەوحیکمەتمان پێداوەودەتوانێت هەموو بابەتێك بەکلایی بکاتەوەبەوبڕیاروبەرنامەیەی داومانەتەدەستی) . لەم ئایەتەداخوایگەورەباسی حیکمەتی خستۆتەشەریعەت و بەرنامەکەیەوەچونکەمەبەست لەدووشەی(فصل الخگاب) : ئەوبەرنامەیەیەکەخواناردویەتەخوارەوەبۆداودپێغەمبەرتا ڕایگەیەنێت بەخەڵك، ومنەتی ناوەبەسەرگەورەیئێمەدا: (لوقمان) بەوەکەفێری حیکمەتی کردووەو فەرمانی پێکردووەکەسوپاسی بکات لەسەرئەم نیعمەتەگەورەیەکەدەفەرمێت: (بەڕاستی حیکمەتمان دایە (لوقمان) کەسوپاسی خوابکە، هەرکەس سوپاسی خوابکات ئەوابۆخۆی سوپاس دەکات وقازانجەکەی دەگەڕێتەوەبۆخۆی، وەهەرکەسێکیش پیٚ دەخاتە نیعمەتەکانی خواوە، بێگومان خوای گەورەدەوڵەمەندەوشایانی سوپاسکردنە ، ٢خوایگەورەقسەلەگەڵ خێزانی مرۆڤایەتیدادەکات بەوەی کەمحمدی هەڵبژێردراوی بۆڕەوانەکردوون تافێری

---

[1]. سورة ص/٢٠

[2]. سورة لقمان/١٢

قورئـــان٣ وحیکمـــەتیان ٤بکـــات فەرمویـــەتی: (هـــەروەك لەناوئێوەداپێغەمبـــەرمان ناردوهەرلـــەخۆتان (ئایەتـــەکانی) ئێمەبەســـەرئێوەدادەخوێنێتەوەوپاکتان دەکاتـــەوەوفێری قورئـان وحیکمـەتان دەکـات وئەوشـتانەتان فێردەکـات کەلەمـەوپێش نـەتان دەزانـی) ١ فـەرمانی کـردوه بەهـەموو بانگخوازێـك کەڕێگـەی ڕاسـت بگرێـت لـە ئەرکەکەیـدا شـێوازی لۆژیکیانه و حیکمەتداترانه بەکاربهێنێت، ئەوەتا فەرمویەتی :

(أدعُ الى سبيل ربك بالحكمة والموعظةالحسنةوجادلهم بالتى هى أحسن إن ربـك هـواعلم لمن ضل عن سبيله وهواعلم بالمهتدين) [٢] واته: ئەی موحەمەد خەڵك بـانگ بکـە بـۆ ڕێگـای پـەروەردگارت ، بەشـێوازی حیکمـەت ئـامێز و ئامۆژگـاری جـوان شـێوە، بـێ گومـان پەروەردگاری تۆ تەنها ئەو زاناترینە بەحاڵی کەسانێك لـەڕی ئـەو لایـان داوە و هـەر ئـەویش زاناترینە بەدۆخی کەسێك کەڕێگەی ڕاستیان گرتوە)

## وێنەکانی لۆژیک(المنطق)

فەیلەسوف وزانایانی لۆژیك پێیان وایە کە (لۆژیك) لقێکە لـە فەلسـەفە(الحکمـة) لـەبیر و ڕێگاکـــانی بەلگەهێنانـــەوەی ســـاغ ودروســـت دەکۆڵێتـــەوە، وەیەکـــەم کـــەس لـــەم زانستەداپەرتوکی نوسی وپەزانستێکی سەربەخۆولەسەرپێ وەستاوی دایەقەڵەم ئەرستۆی [٣] فەیلەســـوف بـــوو ، وە کۆمەڵـــە لێکۆڵینـــەوە لۆژیکیەکـــەی بـــە(أورغان) ناودەبرێـــت ، کەواتە:ئامێری زانستەکانە. وەبەپێی کارەکانی عەقڵ دەبێت بە سێ بەشەوە:

---

[١]. سورةالبقرة/١٥١

[٢]. سورةالبقرة/١٥١

[٣]. أرسطو( ٣٨٤. ٣٢٢ ) کوڕی پزیشکی بسطاعیزیوله باکوری یونان بۆماوەی( ٢٠ سالٌ) ئەندامی ئەکادیمیای افلاطون بو( ٤٢٧. ٣٤٧. پ. ز ) کاتێك افلاطون کۆچی دوایی کرد(. پ. ز٣٤٧ ) اثینای بەجێ هێشت تاقوتابخانەیەکی نوێ دابمەزرێنێت بەناو(الليرقيون) وەئەوبیرانەی لەدانراوەکانی ئەرستۆدایەبریتی یەلە١. المقولات. ٢. الصورة والهيولى. ٣. الوجوبالنعل والوجوبالقوة. ٤. العلل الأربع. ٥. المطق. ٦. السياسة.

١ـگوتەکان(کاتیگۆریەکان) باسی وێناکردنەکان دەکات و ئەرەستو پێی وایە هەرستێك لەم گەردونەدا هەیە دەچێتە ژێر یەکێك لە (دە) گوتانەوە، لەبەر ئەوەی مرۆڤ دەیزانێت ئەگەر خۆی بەخودی خۆیەوە ئەوا جەوهەرە[1]، ئەگینا ئەوا پێی دەوترێت عەرەز[2].

٢ـدەستەواژە، لەو گوتانە دەکۆڵێتەوە کە لەوێناکردنەکان دروست بون

٣ـ شیکردنەوەکان ئەویش لەبەڵگەهێنان دەکۆڵێتەوە.

لۆژیکی ئەرستۆیی کاریگەریەکی گەورەی هەبوولەسەربیریارانی سەدەکانی ناوەڕاست، چونکەیارمەتیدانی لەسەر دۆزینەوەی ڕێگاکانی بەڵگەکاری ئەنجامەدروستەکان لەدەستپێك گەلێکەوەکەلە پەرتوکەدابەزیوەکانی لایان هەبووەیان لەکەلتوری زانستی کۆندا. کاتێك ڕاپەڕینی ئەوروپا سەری هەڵدازانستەسروشتی یەکانیش هەڵسانەوەکەپشتیان بەبینینی دیاردەکان و بەڵگەکاری یاسازانستیەکان لەبینینەبەشێیەکان دەبەست، نەك لەوتەهەمەکیەکانلەناوکتێبەکانداهەن، کارەکەپێویستیبەلۆژیکێکی نوێ هەیەئەوەیش لۆژیکی(إستقرائیة) نەك بۆ ئەوەی جێگەی لۆژیکی هەڵگۆزینی ئەرستۆیی بگرێتەوەبەڵکوتاتەواوی بکات. چونکە زانست پێویستی بەهەردووکیانە، هەروەك دەزانین پێشەنگی ڕێبازی(استقرائی) (فرانسیس بیکون) بووپاشان(جون ستیوارت مل) تەواوی کردلەم سەردەمەیئێمەشدا لۆژیکی(برمجائی) بلاوەکەڕاستی بڕیارلەسەرئەنجامە زانستییەکان بنیات دەنێت نەك لەسەریێ خەوش بوونی بەڵگەکاری فۆرمی(صوری) ، وەلۆژیکێکی بیرکاریانەکەزانا(لیبنتز) داهێناو(برتراندراسل) تەواوی کرد، ئەوبیرکاری دەبەستێت بەلۆژیکەوەپێی وایەبیرکاری درێژبووەوەی لۆژیکە .[3]

---

[1]. ئەو شتەیە کەوا خۆی بە خودی خۆیەوە وەستاوە وەفەیلەسوفەکان دەیکەن بەچەند بەشیکەوە لەوانە : وێنە ، هەیۆلا، جەستە دەرون ، عەقل

[2]. هەرشتێکە کەبەسەر شتیکی تر وەستابێت فەیلەسوف و لۆجیك زانەکان دابەشی دەکەن بە نۆ بەشەوە : چەند، چۆن ، کەی ، لەکوێ، دانەپاڵ، کار، کالیککردن، خاوەنێتی، نۆخ

[3]. الموسوعةالعربیةدارالشعبومؤسسةفرانکلیت للطباعةالنشر.

## گەشەسەندنی لۆژیکی عەرەبی ئیسلامی

بێگومان ئەم گەشەسەندنەبەچەندقۆناغداتێپەڕی کەلەسەدەی هەشتەمەوەتا سەدەی نۆزدەیەمی زاینی درێژدەبێتەوە، دەگونجێت لەم پێنج قۆناغە داکورت بکرێتەوە.

١–سەردەمی گواستنەوە(سەدەی هەشتەم) :کەلەپوری یونانی گواسترایەوەبۆ جیهانی عەرەبی ئیسلامی لەسەردەستی کریستیانەکان، بەشێوەیەکی تایبەت نەستوریەکان[1] (النساطرة) . لەسەردەمی(جنديسابور) چەندپۆلێك لەوەرگێڕان لەخێزانی(بختيشوع) لەم قەتابخانەیەدەرچوون، لەماڵی حیکمەت(مەڵبەندی وەرگێڕان) کە(أبوزكرياأبن ماسويه) (٧٩٠ـ٧٥٨) دایمەزراند، کەیەکێکە لەقوتابیانی ئەویەیمانگایە، قوتابخانەی حنين( ٨٠٩–٨٧٧) ، وەابن اسحاق( ٨٤٥–٩١٠) پێش کەوتن لەم فێرگەیەدا ، بەشی زۆری پەڕتوکە یۆنانیەکان وەرگێڕدرانە سەر زمانی عەرەبی ، لە پێش هەموویانەوە پەڕتوکەکانی (أرسطوطاليس) مامۆستای یەکەمی فەیلەسوفەکان.

٢–سەردەمی أبن سينا[2] و فارابي[3].

لەم سەردەمەداموسڵمانان پەیوەندیان کردبەفەلسەفەی یونانیەوەکەلۆژیك بەبەشێك لەودەدرێتەقەڵەم کاتێك سوپاکەیان گەیشتەئاسیای بچوك وبەرەوقوستەنتینیە دەڕۆیشت لێکۆڵەران[4] ڕایان وایەدەربارەی زانستی لۆژیك کەفارابی یەکەم کەس نەبوو کە فەلسەفەی هێنایەناوئیسلامەوە، بەڵکوپێشەنگ وپێشەوای ڕاستەقینەلەم کارەدا(كندى ) فەیلەسوف

---

[1]. هەندێك لایان وایەزانایانی موسڵمانیش لەم وەرگێڕانەدابەشداریان هەبوەلەوانەعبدالله کوڕی مقفع نوسەری أبوجعفری مضورقکەهەڵساوەبەوەرگێڕانی دەروازە(المدخل) کەناسراوەبە(أيساغوجى) ویعقوبی کوڕی اسحاق كندى جگەلەمانیش کەتەماشای:علم المنطق، للاستاذاحمدعبدهخيرالدين:لێ بکە.

[2]. ابن سينا‌ابوعلي الحسين بن عبدالله بن سينا(پزیشك–فیلسوف لەفنشە نزیك بخاری لەدایك بووەدانراوەکانی لە(٢٠٠ ) زیاترن لەوانە:الشفاء والنجاةکەکورتکراوەی(شفاء) او اشارات) .

[3]. فارابی:ابوانصرمحمدی فارابی:بۆدانەپاڵ فاراب کەشوێنێکەلەوڵاتی تورك کتێبەلۆجیکیەکانی ئەرستۆی لێکداوەتەوە. بەم هۆیەناونراوەبەمامۆستای دووەم لەدانراوەکانی(إحصاءالعلوم) زۆرهۆگریوەبەقورئان وسونەتەوەهەروەهابەئەفلاتون وئەرستۆی فەیلەسوفەوە.

[4]. ينظر: منطق العرب من وجهة نظر المنطق الحديث، الدكتور عادل فاخوري، الطبعة الثانية، دار الطبعة، بيروت، ص٢٥.

بوو( ٨٠٥_٨٧٣) ، سەرەڕای ئەوەبێگومان زمانی عەرەبی فەلسەفی ڕاست نەبویەوە ولێکۆڵینەوەلۆژیکیەکان سەریان هەڵنەدا لەگەڵ جموجۆڵەزانستیەکانی فارابیدانەبێت، چونکەمامۆستای دووەم(فارابی) زیاترلەپەرتوکێکی (تەرخانکرد) بۆنوسینی لۆژیک لەسەرشێوازی مامۆستاکەی (أبی بشرمتی) (٨٧٠_٩٤٠ ) ، بێگومان ئەم قۆناغە گەیشتەلوتکەی خۆی لەدانراوەکانی (إبن سینا) داکەئەمانیش کۆمەڵێك دانراوی گەورەبوون وتیۆرەلۆژیکیەجیاوازەکانیان لەخۆگرتبو، بەڕاستی دەستێکی باڵای هەبوو لەبەرەوپێش بردنی لۆژیکدا.

٣–سەردەمی یەکخستن لەگەڵ أبن رشد(١١٢٦–١١٩٨ کۆتایی پێ دێت) : ئەم سەردەمە پێی دەوترێت: سەردەمی یەکخستن لەبەرئەوەی زانایانی موسڵمان لەفەیلەسوفەکان ولۆژیك زانەکان هەوڵیان داوە، کەڕێساکانی لۆژیك وفەلسەفە لەلایەك و ڕێساکانی شەریعەتی ئیسلام لەلایەکی ترەوەیەکبخەن، بێگومان لەم سەردەمەدا کەڵەنوسەرانێك لەخزمەتکردنی لۆژیکدابەشداریان کردووە، لەوانە:(إبن حزم) ، (غزالی) [1] و(إبن باجە) و(إبن رشد) [2]. بەڵام هاوبەش بونی ئەمانەلەبەرەوپێش بردنی لۆژیکداکەمتربووە لەدەستکەوتەکانی تریان لەبوارەهزریەکانی تریاندا. هەروەك ابن حزم هەوڵی داوە(نحو) لەلۆژیك نزیك بخاتەوەو هەندێك لە بەڵگەشەرعی یەکان بەپێی نمونەوپێوەری(أورغانون) ڕێك بخات و پێشەوا غەزالی هەوڵی داوەلۆژیك وشەریعەتی ئیسلامی یەکبخات وناوی لێناوەپێوەری زانست (معیارالعلم) ، مەحەکی‌نوارین، هەروەك هەوڵی داوەبنەماکانی‌فقهی ئیسلامی لەسەربنەماکانی لۆژیك بنیاد بنێت لەکتێبە کەیدا(المستصفي) ، وە

---

[1]. ابوحامدمحمد(١٠٥٩-١١١١) شەرعزان، فەیلەسوف چاکسازی کۆمەڵایەتی وئاینی خاوەنی پەیامێکی گیانی بولەتوس لەدایك بوەبەرگری لەئیسلام کردوەبەگەرمی.

[2]. ابو وهلید محمدی کوڕی أحمد(١١٢٦-١١٩٨ ز) فەیلەسوف وپزیشك لەقرطبةلەدایك بوەلەزانستەشەرعی وعەقلیەکان کۆڵیوەتەوەبوەتەقازی أشبیلیەپێی وتراوەقازی قرطبة، هەروەهانازناوی شارحی دراوەتێ لەبەر ئەوەی پەرتوکەکانی ئەرستۆی ڕڤەکردوە لەوانە(طبعیات، السماء، العالم، الکون، الفساد، النفس) لەگرنگترین ڕاڤەکانی ڕاڤەی‌کتێبی(ما بعد الطبیعة) ی ئەرەستۆیە هەروەها هەولی‌داوە نێوانی ئاین و فەلسەفە ڕێك بخاتو بیسەلمێنێت کەشەریعەتی ئیسلام و مرۆڤ هەڵدەی لەسەر تێڕوانینی عەقڵی و ئەرکەکانی سەرچاوەی پێسو لا ١٦٧ .

پرۆژەلۆژیکیەکەی (ابـن رشـد) بەدوبارەکردنـەوەی پرۆژەکـەی فـارابی دەدرێتـە قەڵـەم ئەگەرچی نوسراوەکانی لەم بوارەدا لەئاست و ئاکاری ناوبانگەفەلسـەفیەکەیدانەبوو، بـەڵام بەبێ ڕکابەردادەنرێت لەناوڕاڤەکارانی ئەرستۆدالەماوەی سەدەکانی ناوەڕاستدا.

٤—سـەردەمی زێڕین(ئـاڵتونی) (لـەنیوەی دووەمـی سـەدەی دوازدە—کۆتـایی سـەدەی سـیازدەهەم) :لـەم قۆناغـەدا لـۆژیکی عـەرەبی ئیسـلامی بـونێکی سـەربەخۆی بۆدروست بوولەسەرشێوازێکی تایبەت بەخۆی، ووردە ووردەکاریگەری ئەرسـتۆکەوتە کـزی لەبـەردەم هەژمونی فەیلەسوفەکان وبیریارانی جیهانی ئیسلامیدابەجۆرێك ڕێساکانی لۆژیك وڕێسـاکانی زانستەئیسلامیەکان بە تەواوی تێکەڵ کران وەك: بنەماکانی فقە(اصو ل الفقـە) وبنـەماکانی ئاین(أصول الدین) وزانستی(ڕێساکانی زمانی عەرەبی) (النحو) جگە لەمانە، وێـڕای دژایـەتی هەندێك لەخاوەن عەقڵەچەقبەستووەکان لەوانەی لۆژیك و فەلسەفەیان بەهۆکاری بێباوەڕی وبێ دینی دەزانیئەمـەش گـەورەترین هەڵەیـە کەسـێك ئـەنجامی داوەکەنەیهێشـتووەعەقڵ ولۆژیـك بـەکاربهێنرێت لـەپێش خسـتنی ژیانـدا، کەبوویـە هۆکـاری پـاش کـەوتنی جیهـانی عــەرەبی ئیســلامی لــەکاروانی شارســتانیەتی تەکنــەلۆژیاودا هێنراوەنوێکانــدا لەهــەموو بوارەپیشەسازیەکاندا لەم سەردەمەدا.

٥—سـەردەمی ڕاڤـەکاران(الشـراح) :ئـەم سەردەمەلەسـەدەی چـواردەهەمەوە دەسـتی پێکـرد، لۆژیـك کـەم کـەم هاتـەخوارەوە، نـەك لەبەرکـەم کردنـی دانراوەکـان(المؤلفـات) بەڵکولەبەر نەبونی ڕەسەنایەتی(الاصالـة) چـونکەهەوڵی زانایـانی لۆژیـك تـەنهابریتی بوولـە: کـورت کـرد نـەوەی دانراوەپێشوەکاندابەشـێوەیەك زیـانی دەگەیاندەلێتێگەشـتن و سـودلێ وەرگرتنیـان، هەروەهاهەوڵـەکانیان چڕدەکردەوەلەسـەرلێکدانەوەی کتێبـەکورتکراوەکان ونوسینی پەراوێزلەسەریان وهەڵسان بەڕێچکەی درێژکردنەوەی بێزارکەری کتێبەکان بێ هیچ پێش خستنێك لەبواری بابەتیەوە. هەروەك بڵێیت بەشی لۆژیـك لەچەقبەسـتن وبـەرەوپێش نەچوندابەشی زانستەئیسلامیەکانی تریشە، بەشێوەیەکی تایبـەتی فیقهـی ئیسـلامی کەلـە گۆڕانکـاری وپـێش کـەوتن دوورکەوتـەوە، لەوکاتـەوە(اجتهـاد) وەسـتاله نیـوەی سـەدەی چوارەمی کۆچیدا وەبەرپرسیاریەتی ئەم چـەق بەسـتن وقـەتیس مانەلـەجیهانی ئیسـلامیدا دەکەوێتەسەرئەو مامۆسـتایانەی سەرپـەرشـتی وتنـەوەی زانستەئیسـلامیەکانیان کـردووە، چـونکەئەوان جیاوازیـان نەدەکردلـەنێوان دەقـەکانی ئـەم زانسـتانەداودەقەکانی قورئـانی

پـیرۆزدا لـەڕوی پـیرۆزی ودەسـت بۆنـەبردنیان ولایـان وابـوو ئـەوەی وتراوەونوسـراوە لەسەدەڕابوردوەکانداهەمویڕاست ونەمرە، هەروەك چۆن بەرپرسیاریەتی بێ بـەش بـوونی فێرخوازی یاسالەڕۆچون و وردەکاری لەفێرکردن وفێربوندا لەحالێکائەوان لە لۆژیـك دوورن- دەکەوێتەسەر شانیمامۆستایانی یاسالەجیهانی عەرەبی وئیسلامیدا.

## گونجاندنی لۆژیک

دانـەرەکان لەزانسـتی لۆژیکـدا وەك ئەرسـتۆبیرۆکەیەکی رونیـان لـەبارەی سروشـتی لۆژیکەوە نەداوە بەدەستەوەکە ئایا کۆمەڵەڕێسایەکە بڕیاردەدا دەربـارەی ئـەوەی کەتـەنها لەزەین دایە یان دەچەسپێ بەسەرئەوشتانەداکەلەدەرەوەی زەیندایە لە دەستکەوتە نوێیـە مرۆڤایەتیەکان، یان هەمووچالاکیەك کـە مـرۆڤ پێـی هەڵدەسـتێت لەهـەردوو بـواری تیـۆری وپراکتیکی دا مل کەچی ڕێساکانیەتی. ڕاکان لەکۆن ونوێدا جیاوازن دەربـارەی دیـاریکردنی سروشتی لۆژیك وەك لەم نمونەی خوارەوەداهاتووە:

أ-زانایانی دەروونناسی[1]. پێیان وایەکـەلۆژیك لقێکـە لەلقـەکانی دەروونناسـی ، وکـردەوە عەقڵیەکان وکردارەخۆویستەکان لەهەستداڕوودەدەن پاشان دەچـنەژێرتێبینی دەروونناسـی یەوە ، وەزانستی دەروونناسی لەبیرکردنەوەی دروست دەکۆڵێتەوەوسـەرەڕای لێکۆڵینـەوەی جۆرەکانی تـری بیرکردنەوە(بیرکردنـەوەی هەڵەوبیرکردنـەوەی سـەرەتایی وبیرکردنـەوەی نـاوازە) . هـەروەك چـۆن لۆژیـك لەڕێسـاکانی هزردەکۆڵێتـەوە، بـەپێی ئـەوەلۆژیك لقێکـە لەلقەکانی دەروونناسی مادامێك هەموو زانینێك لەباروودۆخێکی دەروونیدادەچێت بەڕێوە، مادام بیرکردنەوەپرۆسەیەکی دەروونیەوەك ڕوداوەکانی تروداردەدەرونیەکان[2].

ب-پشتیوانانی ڕێچکەی زمانی لۆژیـك دەگێڕنەوەبۆباسـەکانی زمـان. چـونکەپەیوەندی نێوان هزرو زمـان بەهێزەلەکاتێکدا دووەم دەربڕینەلەیەکـەم، سـەرباری ئـەوەی کـە لۆژیـك هەروەك پێویستی بە ووردەکاری وقوڵی هەیەلەبەکارهێنانی ئامێرەکانی دەربڕینی هزردا

---

[1]. وەك(ولیم جیس) دەرونناس، ئەوەی تێ بینی دەکرێت کە(دیکارت) یەکەم فەیلەسوف بوهەوڵیدا لۆجیك بیگرێتەوەبۆزانستی دەرونناسی تەماشای:المنطق الصوری، سەرچاوەی پێشو ل ٤٢ بکە.

[2]. تەماشای:المنطق ومناجج البحث العلمیی فی العلوم الریاضیة والطبیعیة للدکترعبدالمطیعی ل٤٢

ت-زۆرێك لەزانایانی كۆمەڵناسی پێیان وایەكەكۆمەڵ بەدیهێنێەروخولقێنەری ئەوهێڵە سەرەتاییانەیەكەهزری لۆژیكی داواكاری لەسەركردووە، پرۆسەلۆژیكیەكان وەك پۆلێن كردن وپێناسەورەگەزوجۆروونیەیان بێگومان لەكۆمەڵگەداسەری هەڵداكاتێك كەكۆمەڵگە دابەش بوو بۆهۆزوتیرەوچینەكان وجگەلەمانە، لەرێگەی ئەم دابەشكردنەوەئەوپرۆسە لۆژیكیانەسەریان هەڵدا، لەبەرئەمەزانستی لۆژیك دەگەرێتەوەبۆگروپی زانستیكۆمەڵناسی[1].

ث-رێبازی ئەودیوسروشت(المیتافیزیقی) [2]لای وایەكەلۆژیك بەشێكەلەدیو سروشت چونكەیاسابنەرەتیەكانی هزرمیتافیزیقین لەجەوهەردا لەبەرئەوەی هەموویان پرەنسیب گەلێكی ناكەرەستەیین(نامادی) لەبونیاندابێش هەموو بیركردنەوەیەك كەوتون و راستەقینەكەی زانین(المعرفة) پشتیان پێ دەبەستێت، سەرباری ئەوەئەگەرئێمەتەماشای پێناسە لۆژیكی یەكان بكەین ئەوادەبینین لەبناغەوەمیتافیزیقین، چونكەپێناسەپێویستی بەگەشتن بەچیەتی وراستەقینەیی شتەكان و، كاكڵەكانیان هەیە، وەئەم هزرانەش شت گەلێكی میتافیزیقین .

وەچەندان رێبازوئاراستەی ترمان هەیەبۆ گونجاندنی زانستی لۆژیك كە بواری خستنەرویانمان نیە[3] . هیچ هۆكاروپاڵنەرێك بەدی ناكەم بۆمشتومركردن لەسەر ئەم رێبازانە، كاتێك زانیمان كەلۆژیك یاسایەكەكرداری دۆزینەوەی نەزانراوەكان لە زانراوەكان دەبات بەرێوەلەهەردوو بواری تیۆری وپراكتیكیدا لە هەرشوێنێكدا كەدەچێتە چوارچێوەی بیركردنەوەی مرۆڤەوەودەكەوێتەناوچێوەی بازنەی بەرەوپێش خستنی ژیانی كرداریەوە. ئەوەی راستی بێت لە(واقیعدا) كەلۆژیك زانستێكی سەربەخۆیەوتایبەتمەندی خۆیی هەیەلەلێكۆلینەوەورێساوبابەت و رێرەوەكانیدا، سەربەخۆیە(جیایە) لەهەموو زانستێك

---

[1]. تەماشای:المنطق الصوری بكە، سەرچاوەی پێشوویاش ئەووە(مناهج البحث العلمی فی العلوم الریاضیةوالطبیعة. سەرچاوەی رابوردول٤٩

[2]. وەك رێبازی بیركاریانەكەجەخت دەكاتەوەلەسەریەیوەندی بەهێزوتۆكمە لەنێوان زانستی لۆجیك وبیركایدا، لەئەنجامی ئەوەدا لۆجیكی بیركاری سری هەڵدا، تەماشای:المنطق ومناهج البحث العلمی، سەرچاوەی پێشوبكەل٤٣ . وپاش ئەو

[3]. كالاتجاه الریاضي الذي یؤكد الصلة الوثیقة بین علم المنطق وبین الریاضیات، ونتیجة لذلك ظهر ما یسمی المنطق الریاضي. ینظر: المنطق ومناهج البحث العلمي، المرجع السابق، ص ٤٣ وما بعدها.

لەوزانستانەی کەناوبران وجگەلەوانیش، بەلاَم پەیوەندیەکی تۆکمەوبەهێزی هەیە لەگەلّ هەموو لقێك لەلقەکانی زانستەتیۆری وکرداریەکان، لەولایەنەوەکەئەم تەرازوی زانستە کانە، پێوەری جیاکردنەوەی ڕاستەلەهەڵەلەبەرئەمەدەتوانرێت بکرێت بەم بەشانەوە:

أ–لۆژیکی تیۆری:بریتی یە لەکۆمەڵێك ڕێسای تیۆری گشتی کەبڕیاردەدات بەسەر هزرەکانی مرۆڤدا لەڕووی هەڵەوڕاستیەوە.

ب_لۆژیکی کرداری(پراکتیکی) :بریتی یەلەکۆمەڵێك ڕێسای کرداری گشتی لەبواری تەکنەلۆژیادابەکاردەهنرێت بۆدروست کردنی پێداویستەنوێیەکانی ژیان وبەرەوپێش بردنیان لەسەرتەواوترین وجوانترین شێوەی ویستراو.

ث–لۆژیکی (سروشتی) :بریتی یە لەئامادەبونێکی خودی بۆبەرهەمهێنان و دەرئەنجامگیریەکی ڕاست. ئەم بەشەلەگەلّ لەدایك بونی مرۆڤدا لەدایك دەبێت، زیاددەکات وپەرەدەسێنێت هەرکات زۆربەکارهێنراوئەزمونکراوسودی لیّ وەرگیرا، لەلایەن هەرکەسەوە بەپێی پسپۆڕیەکەی خۆی.

ج–لۆژیکی بەدەست هێنراو :بریتی یەلەزانستێکی تۆمارکراولە سەردەمی فەیلەسوفەکانی یۆنانەوە، کەکۆمەڵێك ڕێسای گشتی لەخۆدەگرێت کەڕەچاوکردنیان زەینی بیرکەرەوان لەهەڵەدەپارێزێت لەبیرکردنەوەکان داو، کاری کارکەران لەنەزۆکی وبیّ بەرهەمی لا دەدات. سودی کۆکردنەوەلەنێوان لۆژیکی تیژی وبەدەست هێنراودائەوەیەکە ئەنجامەکانی کۆکردنەوەی ئەم دووانەقوڵی زیاترەوپوختەرەوتەمەنی درێژتروبەرهەمەکانی زۆرترە . بیّ گومان لۆژیکی بەدەست هێنراوپاش وەرگێرانی بۆزمانی عەرەبی سودی گەورەی بەزانایانی بنەماکانی فیقهی ئیسلامی گەیاندووەلەبەرەوپێش بردنی ڕێسائوسڵیەکاندا (بنەماییەکان) ، وەبەزانایانی ئاین لەتێکەڵاو(ئاوێتە) کردنی نەقلّ لەگەلّ عەقلّ دا بۆبانگخوازی بۆرێگەی ڕاست بەحیکمەت ولێزانی وئامۆژگاری جوان ومشت ومڕکردن بەجوانترین وباشترین شێواز.

# باسی سێیەم:
# گرنگی زانستی لۆژیك وبابەتەكەی

## گرنگی زانستی لۆژیك

لەمەوپێشڕوونمان كردەوەكەلۆژیك یاسای بەدەست هێنانی نەزانراوەكانە لـەزانراوەكان، هەڵسوكەوت بـەلۆژیك هەڵسـوكەوت كردنـە بـەپێی خواسـتی عـەقڵی سـاغ، لـەم ڕاسـتینە كرداریەواقیعیەوەكەپەیوەستەبەچـــیەتی لۆژیكـــەوەبۆمان ڕوون دەبێتـــەوە كـــەلۆژیك پەیوەندییەكی بەهێزی هەیەبەهەموو زانستەكانی ژیانەوەبەتیۆری وپراكتیكیەوە (كرداری) ، وەهەرلەسـەر ئـەم بناغەیەپێشـەواغزالی وەسـفی دەكـات بـەوەی (هەركەسـێك شـارەزایی وزانیاری لۆژیكی نەبێ هیچ متمانەیەك بەزانستی ناكرێت) وە(ابن سینا) پێناسـەی دەكـات بـەوەی كەتـەرازوی زانسـتەكانە. لـەم خاڵانـەی خوارەوەچـەندنمونەیەك نیشـان دەدرێـت لەبارەی گرنگی لۆژیكەوە:

یەكەم: سوودەكەی سەبارەت بە زانستە ئیسلامییەكانەوە

١–لۆژیك ڕۆڵێكی گەورەی هەبووەلەبەرەوپێش بردنی ڕێساكانی زانستی بیرو باوەڕەكان وكەلامدا(زانستی بنـەماكانی ئـاین) ئـەویش زانسـتێكەئەكۆڵێتەوەلە بەڵگـەكانی سـەلماندنی هەموو ئەوشتانەی كەپەیوەندارن بەبیروباوەڕەكانی مرۆڤەوەلەباوەڕبوون بەخواوئەو لقانەی لێی دەبێتەوەلەبیروباوەڕەكانی ترو شتەپەنهانەكان المغیبات. شتێكی ئاشكرایە هەركەسێك باوەڕی بەڕاستی بەڵگەیەك نەبێت ئـەواناگونجێت بـەگوێرەی ئەوكەسـەبەوبەڵگەیە داواكـەی بســـەلمێنی، چـــونكەهەركەس بـــاوەڕی بـــەقورئان وپێغەمبـــەرێتی پێغەمبەرنـــەبێت، لێ زانانەوبەجێیانە مشتومڕی لەگەڵدابكرێت بەئایەتەكانی قورئان وسوننەتەكانی پێغەمبەرەوە، وەلەبـــەر ئەمـــەزانایانی ئیســـلام ڕێســـاكانی زانســـتی لۆژیكیـــان هێنایەناوزانســـتی كەلامەوە(بنـەماكانی ئـاین) ، بەڵگەشـەرعی وعەقڵییـەلۆژیكی یـەكانیان تێكـەڵ كردپـاش

وەرگێرانی لۆژیك بۆ زمانی عەرەبی، بەلگەی دلنیاکەریان هێنایەوەلەسەربوونی دروستکەرێك بۆئەم گەردونە بەبەلگەی(آنی) (بەلگەهێنانەوەبەشوێنەوارلەسەربوونی شوێنەوار دروستکەر) . بەم شێوەیەعەقل ونـەقلیان بەکارهێناوەوخـەلکیان بانـك کردووەبۆرێگـەی پـەروەردگاری خۆیان بەکاریەجێی وئامۆژگاری جوان بەپڕاوپڕی ئەم فەرمودەیەی خوا(ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَ جَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ) [1] بەمەسـەرکەوتنێکی گـەورەیان بەدەست هێنالەبلاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام ولەباوەڕدارکردنی دانیشتوانی شـارو ولاتەکانـدا لەهەموو شوێنەئاوەدانەکانی سەرگۆی زەوی.

٢-زانایانی بنەماکانی فیقهی ئیسلامی هەستان بە پەرەپێدانی ڕێسابنەمایی یەکان (أصولیه) لەرێگەی زانستی لۆژیکەوەپاش ئاشنابوونیان پێی، چەندان ڕێسـای تازەیـا ن هێنایـەگۆڕێ کەیارمـەتی موجتەهیـدودادوەردەدات بۆهـەلگۆزینی بڕیارەکـان لەدەقـەکان ، بەمەتوانیان سامانێکی گەورەپێش کەشـی نەتـەوەی‌ئیسـلامی بکـەن لەڕێسائوسـولیەکان، کەئەگەروەبەربهێنرایەن ئـەوافیقهی ئیسـلامی نەدەگەییەئـەم دۆخـەی ئەمڕۆلەقـەتیس مـان وچەقبەستن کە هەرلەسەرەتای نیوەی سەدەی چوارەمی کۆچیەوەدوچاری بوو.

٣-لۆژیك سودێکی گەورەی گەیاندووەتەزانایانی فیقهی ئیسلامی لەپێدانی عەقلیە تێکی لـۆژیکی و زەینێکـی پێگەشـتوومەلەکەیەکی فیقهـی ئیجتهـادی دا ،کەیارمـەتی دان بۆشـکرنەوەوهۆکارهێنانەوەدەرئەنجام گـیری لەبەلگەشـرعیەکانەوەلەهەموبوارێك لەبوارەکانی ژیانی کرداری دا، کەبەم کارەیـان سـامانێکی فیقهـی گـەورەیان بۆبـەجێهێلاین ئەگـەرپاك بکرایەتەوەوپالفتەبکرایـەن ووەبەرهـەم بهێنرایـەن ئـەوا یاسـاکانی دەولـەتانی جیهانیان دەولەمەند دەکرد.

٤-لۆژیـك یارمـەتی پێشـەوایانی ئاینزافیقهیەئیسـلامیەکانی دا لەسەربەرەوپێشـبردنی ڕێسائاینزاییەکانیان کەوەك بیردۆزەیاسایەکان وایەلەیاسای مرۆڤ کردەدا(القـانون الوضـعی) بەجۆرێك توانیویانەبنەماکانی ئاینزاکانیان دابنێن لەژێرڕۆشنایی لۆژیکدا لەسەرڕێسا فیقهـی گشـتیەکان کەپشـتیان پێبەسـتون بۆدەرهێنـانی(التخـريج) وخـالی کردنـەو ە(التفريـع) و(بەڕاسترزانین) (الترجیح) .

---

[1] . سورة النحل/١٢٥

دووهم: گرنگی لۆژیک لەبیرکاریدا:

زانستی لۆژیك یارمەتی بەرەوپێش چونی ڕێساکانی بیرکاری داوە لەماتماتیك وکۆکردنەوەوئەندازەچونکەبیرکاری بەهەموجۆرەکانیەوەبیریتیە یەلەباسێگەلێك کەکۆمەلێك پێشەکی گریمانەدەکات(تفترض) پاشان بەلگەدەهێنێتەوەلە سەرسەلماندنی ئەنجامەکانیان وەئەم پرۆسە(عملیة) بیرکاریانەلەبرپرەپشتی زانستی لۆ ژیکن کەبریتی یە لەیاسای بەدەست هێنان ودەستخستنی نەزانراوەلەزانراو، لەبەرئەمە زاناپسپۆڕەکان لەم بوارەدا هەستاون بەداهێنانی زانستێك کەپێی دەوترێت لۆژیکی بیرکاری . لەدوایدا نەك لەکوتاییدا کەشکۆلەپێش کەوتنەزانستیەتازەکاندا لەجیهانی دۆزینەوەزانستیەکانداودەگەڕێتەوەبۆلۆژیکی زانستی(المنطق العلمی) بمانەوێت یان نەمانەوێت. شتێکی ئاشکرایەکەهەمونەوەیەکی نوێ لەخێزانی مرۆڤایەتیداپەنادەباتەبەرئەوکەلە پورومیراتەی لەپێشینانەوەبۆی ماوەتەوەبۆدەستخستنی نەزانراوەکان ودۆزینەوەی داهاتووەکان(المستحدثات) ، تابەهۆی ئەمانەوەسامانێکی نوێتربخەنەسەرخەرمانی زانیارییەبەجێ ماوەکان، تانەوەی داهاتوسودی لێ وەربگرن وبەوشێوەیە. . . لێرەدابۆمان ڕون دەبێتەوە کەپێش کەوتنەشارستانیەمرۆڤایەتیەکان دەرئەنجامی هەوڵ وتێکۆشانی نەوەیەك لەدوای یەکەکانەهەرئەوەی بەپێ ی پلەوتواناوتایبەتمەندیەتی خۆی وئاستی زانستی وئەندازەی بەشداریکردنی لەم پێش کەوتنەشارستانیەدا، لەبەرئەمەبەدەستهێنانی نەزانراووێناکردەییەکان وباوەڕکردەییەکان(سەلماوەکان) لەزانراوە(زانیاریە) وێناکردەیی و باوەڕکردەییەکان و بویەبابەتی زانستی لۆژیك.

سێیەم: گرنگی لۆژیك لەیاسادا

لۆژیك ڕۆڵێکی گەورەی هەیەلەبواری یاسادا،وپەیوەندیەکی بەهێزی پێوەی هەیە لەگەڵێك ڕووەوەلەوانەئەمانەی خوارەوەن:_

١–لێکۆڵەری دادوەری(المحقق العدلی) ئەنجامگیریەکانی لەهەوڵدان بۆدەست نیشانکردنی تاوان ودیار یکردنی کەسی تاوانباردا، زۆرجارلەڕێگەی بەلگە(ئیستای(إنی) لۆژیکیەوەیە ، کەئەویش بریتی یەلەبەلگەهێنانەوەبەئاسەوارلەسەربونی خاوەن ئاسەوارچونکەبەلگەکارپشت دەبەستێت بەزانیاری بینراویان خوێنراوەیان بیستراوبۆگەیشتن

بەئەنجامێکی دادگەرانە بێ ئەوەی تاوانبارلەسزای دادگەرانەقوتاری ببێت وسزای بێ تاوان ودورلەتاوان نەدرێت، بەڵام بەڵگەی(لمي) بریتی یەلەبەڵگەهێنانەوەبەخاوەن شوێنەوا لەسەر شوێنەوار وەك بەڵگە هێنانەوەبەبونی خۆرەوڤایرۆسەزیانبەخشەکان لەخوێنی شیتەڵکراودا لەسەربونی نەخۆشی ودەسنیشانکردنی .

٢-ڕێکارەدادوەریەکان لەبەرزکردنەوەی داواتادەرچونی بڕیارهەموی ملکەچەبۆڕێساکانی زانستی لۆژیك، چونکەکاری دادوەرلەم ڕێکارانەدا گەشتنەبەزانست بەنەزانراوە وێناکردەییەکان(تصديقية) لەڕێگەزانراووێناکردەییەکان وباوەڕکردەییەکانەوەکەلای ئەوهەن، وەئەم پرۆسەتیۆریەیەکەبەبابەتی زانستی لۆژیك ناودەبرێت.

٣-گرنگترین کارەکانی دادوەرگونجاندنی ڕوداوی یاساییە هەڵسوکەوتی یاساییە بۆگەیشتن بەدەقێك کەپێویستەپەیڕەوی لێ بکرێت، ڕاستی ئەم گونجاندنەشەلەسەرئەندازەی شارە زایی دادوەر وەستاوەلەهەمەکیەلۆژیکیەکان لە(ڕەگەزوجۆروپۆل وتایبەتمەندي) لەکارەخو دیەکان وبارودۆخەکانی دەوروبەری ڕوداوەکەیان هەڵس وکەوت لەتایبەتیەکانی وجۆرە کانی تاوان، لەوانەتاوانی کوشتن ئەویش تاوانێکەچەندان جۆرکوشتن لەخۆدەگرێت لەکو شتنی بەئەنقەست وهەڵەوکوشتن بەڕاستی وبەناهەق، بارودۆخەکانی کارەتاوانکاریەکە، چونکەبەڕاستی هەریەکێك لەمانەڕۆڵێکی گرنگی هەیەلەگونجاندنی، ڕوداوەکەداودیاریکر دنی ئەودەقەداکەپێویستەجێ بەجێ بکرێت.

٤-لۆژیك ڕۆڵێکی گەورەی هەیەلەسەرکەوتن وشکست خواردنی پارێزەردا، لەبەرئەوەی ئەوپارێزەرەی کەبەرگری لەمافی بەبریکار گرەکەی دەکات ئەگەرپابەندنەبووبەبەدیهێنانی ئامانجەکە، بێگومان پابەنددەبێت بەهەوڵدان بۆبەرژەوەندی بریکارگیرەکەی وەشکستهێنان وسەرکەوتنی لەبەجێهێنانی ئەم ئەرکەدابەسراوەبەشارەزایی پارێزەرلە(منع) ڕێگری و(معارضة) بەرهەڵست کردن(نقض) هەڵوەشاندنەوەداکەئەمانەلەگرنگترین بابەتەکانی(زانستی مشتومڕن) علم المناظرة کەبەشێکەلەزانستی لۆژیك.

٥-لۆژیك گرنگیەکی گەورەی هەیەلەدانانی یاساوگۆڕینی وهەڵوەشانەوەیدا لەژێر ڕوناکی ڕێکخستنی پێداویستی وداخوازیەکانی ژیاندا، چونکەبەرژەوەندی گشتی بایسەمەبەستی(علەغائیە) یاسایەوپرۆژەی یاسابایسەبکەرە(العلة الفاعلة) بۆی. پەیوەست بون لەنێوان دو هۆکارەکەدابەدی دەکرێت لەڕوی بەدیهێنان وپاڵ پێوەنانەوە، وەلەسەرئەم

بنـەمالۆژیکی یەلەسەریاسـادانەرەکەپەلەبکات(خێراهەوڵ بـدات) بۆدانـانی یاسـایەکی نـوێ ئەگـەر بەرژەوەندیـەکی گشـتی نـوێ هەبووئـەوەی دەخواسـت یـان یاسـایەك بگۆڕێـت کەچارەسەری بەرژەوەندیەکی گشتی دەکات کەگۆڕانی بەسەرداهاتووەیان یاسایەك هەڵبوە شێنێتەوەکەبەرژەوەندیەکی گشتی ڕێك دەخات کەبەسەرچووەورۆڵیکۆتایی هاتوە.

٦-گرنگی لۆژیك بۆلێکدانـەوەی یاسا:پێویسـتەئەوەی بەلێکدانـەوەی یاساهەڵدەسـتێت یان وەرگێڕانی زاراوەیەکی یاسایی ئەنجام دەدا شارەزایی باشـی هـەبێت لەپرەنسـیبەکانی وێنـــا کردنەکانـــدا لەڕەگـــەز(الجنس) وجـــۆرو(النـــوع) پـــۆل(الصـــنف) (الفصـــل) جیاکەرەوەتایبەتمەنـدی (الخاصـة) و(وارسـی گشـتی) العـرض العـام ،وبەمەبەسـتەکانیان لەپێناسەی تەواوو(الحد التام) و پێناسەی ناتەواو(الحدالناقص) و وێنەی تەواو(الرسم التـام) وناتەواو(الرســــــــم) (النــــــــاقص) تاواتامەبــــــــە ستەکان(ویســـــــــتراوەکان) لەدەقەکاندابخاتەڕوبۆیاسادانەر(المشـرع) ، وەهەموزاراوەیـەکی یاسـا یـی ڕون بکاتـەوە بـە پێناسەیەك لەو چوار پێناسە لۆژیکیانەی ناوبران[١].

٧-گرنگی لۆژیك بۆلێکۆڵەران (توێژەران) ، هەموو توێژینەوەیەکی زانستی پێویستی بـە دو توخمی فۆرمی (العنصری الشکلی) و توخمی بابەتی هەیە (العنصر الموضعی) ، کە وابو توخمی فۆرمی نەخشەی لێکۆڵینەوە کەیە ، ڕەگەزی بابەتی بناياتی لێکۆڵینەوەیـە لەسـەر ئەم نەخشە . وە ئەندازەی لۆژیك دەسـتە بـەری بـەدیهێنانی سەلامەتی و گونجـا و بـون و شیانی ئەم نەخشەیە بۆ بنیاتنانی ئەم بینایە کە دەمانەوێت لەسەری بنیات بنرێـت ، لەبـەر ئەمـە دەبیـنین زۆربـەی نامـەکانی خوێنـدنی بـالاّ و زۆربـەی لێکۆڵینـەوە زانسـتیەکان یـان بابەتەکانیان بەناو یەکدا چون یان ناچنە ژێر ناونیشانی لێکۆڵینەوەوە یـان بـەدەرن لێـی ، سەرچاوەی ئەوەش نەزانینی دابەشکردنە فۆرمیە لۆژیکیەکانە کە لەسەر چـەند پێـوەرێکی دیاریکراو بنیات نراون لەوانە دابەش کردنەکە لـە نێـوان ئـەرێنی و نەرێنیـدا یـە هـەروەك لـە دابەشکردنی عەقڵیدا بـەدی دەکرێـت ، لەوانـە ڕێگـەی ئامـار(الاسـتقراء) و هەڵـژماردن یـان لێکۆڵینـەوەی مەیـدانی بـۆ تاکـەکانی بابـەتی لێکۆڵینەوەکـە وە بـەر ئـەنجام (الاسـتقراء)

---

[١]. کەبەدرێژی باس دەکرێت لەبابەتی مەبەستەکانی وێناکردندا.

هەندێجار تەواوە و( هەندێجاریش ناتەوا و) [1]. سەرەڕای ئەم گرنگیەی لۆژیك بۆ یاسا لە مێژووی یاسا هەرگیز نەبووە_ئەوەندەی من بزانم_کە پەرتوکێکی تایبەت نوسرابێت دەربارەی چۆنیەتی جێ بەجێکردن و چەسپاندنی ڕێساکانی لۆژیك بەسەر دەقە یاساییەکاندا وە ئومێدەوارم پاش من کەسێك هەبێت نا تەواویەکانی ئەم ئەرکە (المتواضع) هتەواو بکات.

## بابەتی زانستی (لۆژیک)

بابەتی هەموو زانستێك ئەو بوارەیە کەباسی وارسی یە خودیەکانی (الاعراض الذاتية) ئەو زانستەی تێدا دەکرێت ، واتە : لێکۆڵینە لە بڕیارە تایبەتەکانی بەو زانستەوە ، کەوابو زانستە تیۆری و پراکتیکیەکان هەندێکیان لە هەندێکیان جیادەبنەوە بە بابەتەکانیان، چونکە بابەتی هەموو زانست و هونەرو پیشە و یاسایەك لەیەکترجیان ، بابەتی فیقهی ئیسلامی کردەوەکانی مرۆڤ و ڕوداوەکانن لە ڕوی ڕونکارێ بڕیارەکانیانەوە لە ڕەوابون و نارەوابون و ناپەسەند بون و پێویست بونو و سوننەت بون ڕێپێدان ودروست وبەتاڵبون وعزیمەت و روخصەت وێنەی ئەوانە ، بابەتی هەموو لقێك لەلقەکانی یاسا بریتی یە لەو شتەی کە ئەم یاسایە بڕیارەکانی چارەسەر دەکات لە هەڵسو کەوتە یاسایی و ڕوداوە یاسایی یەکان . بابەتی بنەماکانی فیقهی ئیسلامی بەڵگە شەرعیە کورتەکانن لە ڕوی هەڵگۆزینی بڕیارە شەرعیە کرداریە کان لێیان . بابەتی پیشەی ئاسنگەر ئاسنە وە ئامێرەکانی دروست کردنی پێویستی یە ئاسنیەکانە لێی ، وەبابەتی پیشەی دارتاشی دارو ئامێرەکانی گۆڕینی ئەو دارە بۆ پێداویستی یە داریەکان . بابەتی زانستی پزیشکی بریتی یە لە جەستەی مرۆڤ بەو شێوەیە . . . . وە بابەتی لۆژیکی کرداری دەچێتە ناو جیهانی تەنەکان و جیهانی تەکنە لۆژیاوە ، و بابەتی لۆژیکی تیۆری لە جیهانی پەی پێبراوەکانی مرۆڤدا دەبێت ، لەبەر ئەوەی بابەتی لێکۆڵینەوە کەمان ئەو لۆژیکە یاسایی یەیە (المنطق القانوني) کە پەیوەندی بە جیهانی دووەمەوە هەیە تەنها باسی بابەتەکەی دەکەین .

---

[1]. بەدرێژی ئەم باسەدێت لە(مقاصدالتصورات) دا.

**بابەتی زانستی لۆژیکی تیۆری :**

زانراوە وێناکراوو باوەڕ کردەنیەکانی مرۆڤە لە ڕوی گەیاندنی مرۆڤ بە نە زانراوە وێناکراوو باوەڕ کردنیەکان[1]. هەریەکەش لە وێناکردن و باوەڕپێکردن لە بەشەکانی نەوێناکراوو باوەڕ کردنیە لە ڕوی گەیاندنی مرۆڤ بە نەزانراوە وێنا کراوو باوەڕکردنیەکان .
کەواتە : زانست چیە ، وێناکردن چیە و باوەڕکردن چیە ؟

پێناسەی زانست و پلەکانی : زانایانی لۆژیك زانستیان پێناسە کردووە بەوەی وێنەی شتە لای عەقڵ و ئاوەز [2]، مەبەست لەش (الشیء) ئەوەیە کە بگونجێت و بزانرێت و هەواڵی لێوە بدرێت و گوزارشتی لێ بکرێت ، ئیتر ئەو شتە هەبێت یان نە بێت.

**پلەکانی زانست:**

زانست بەدوو واتا بەکار دەهێنرێت : تایبەت و گشتی ، بەمانا تایبەتەکەی بریتی یە لە بیرو باوەڕو بونێکی بێگومانی چەسپاوو پڕاو پڕی واقیع ، ئەو بەم مانایە هاوتای(الیقین) دڵنیایی یە ئەمما ماناگشتی یەکەی بریتی یە لە پەیبردنی ڕەهای بۆمرۆڤ کە ئەم پلەی خوارەوە دەگرێتەوە لە ڕوی هێزی تەوزیمیە یەوە(الالزامی) : دڵنیایی (الیقین) نەزانینی لێکدراو(الجهل المرکب) لاسایی کردنەوە (التقلید) ، و (الظن) (گومان) والشك (دوودڵی) الوهم (وازانین) خەیاڵ کردن (التخیل)

١–الیقین : دڵنیایی : بریتی یە لە بیرو باوەڕی بێگومان و چەسپاوو پڕاو پڕ لەگەڵ واقیعدا . وەك باوەڕبون بەوە کە خودا بەدیهێنەری ئەم گەردونەیە کە هێشتا عەقڵی زانایانی گەردونناسی سەرسامە کە لە کوێوە دەس پێدەکات و لە کوێدا کۆتایی دێت ؟ ئەم پلەیە بە

---

[1]. البرهان للکلنبوی ل ١٢ والقواعد المنطیقه فی شرح رسالة الشمسیة ل ١٣ وتهذیب المنطق للتفتازانی بشرح النجیحی ل ٩

[2]. البرهان للکلبنوی (الشیخ اسماعیل بن مصطفی ) ناسراو بە شیخ زاده الکلبنوی (ت ١٢٠٥ ك) ئەمە کاتێك ئەگەر زانست لە واتەی چۆنیەتی بێت ، یان زەین وێنەکە وەردەگرێت ئەگەر لە واتەی سۆزکار تێکراوبێت یان زەین پەیوەندی بە وێنەکەوەهەبێت . ئەو کاتە لە واچەی ئۆباڵدا (الإضافة) وە ئەگەر ئە سڵی وێنەکە لە دەرەوەی زەین بوو پیّ ی دەوترێت زانستێکی بەدەست کەوتو(حصولی) وەئەگەر وێنەکە لە زەیندا بوو ئەوە پیّ ی دەوترێت زانستی ئامادەیی (حضوری) .

هێزترین پلەکانی زانستە ، زانست بەم واتایە داواکراوە لە بیروباوەڕی مرۆڤدا . بەلاّم لە بابەتی لقی و بڕیارە دادوەریەکاندا ئەوا داواکراو لە دادوەر تەنها گومانی زاڵە، خۆ ئەگەر دادوەر تەکلیفی لێکرا کەنابێت حوکم بکات بەو شتە نەبێت کەلای ئەو جێگیرەو بێگومانە و ە ئەوا ئەوکاتە مافی زۆر کە س زایە دە بێت.

٢-نەزانینی لێکدراو : بریتی یە لە ئاگادار نەبونی مرۆڤ لە شتێك ، لەگەڵ نەبونی زانست بەوەی کە نازانێت ئەو شتە نازانێت . کەواتە نەزانینی لێکدراو (المركب) لە دو نەزانین پێك دێت ، ئەم پلەیە لە جێگری و سەلماندنیدا پاش دڵنیایی (اليقين) دێت وەك ئەوبیرو باوەڕە خراپانەی کە هەندێك خەڵکی بێ باوەڕ(الملحد) هەیانە .

٣- التقليد (چاولێکەری -لاسایکردنەوە) : بریتی یە لە بیروباوەڕی بێ گومان بەلاّم نەسەلماوە ، لەبەر ئەوەی بریتی یە لە وەرگرتنی ڕایەك یان بڕیارێك لە کەسێکەوە بێ زانینی بە لگەکەی . ئەمە هەڵدەگرێت لەناو بچێت بەگوماندروست کردنی گومان دروست کەرێك یان چاولێکەرەکە (المقلد) بەلگەی دەست بکەوێت کە چاولێکەریەکەی نە هێڵێت ، یان خستنە پێشی بەلگەیەك بەسەر بەلگەیەکی تردا (الترجيح) یان ڕایەك بەسەر ڕایەکی تردا . لە ئەنجامدا شوێن کەوتووە کە لە شوێن کەوتنێکەوە دەگەڕێتەوە بۆلای شوێن کەوتنێکی تر ، یان لەوانەیە ڕێگە ببات بە بەلگەی ڕایەکەی پێشو لەسەر چاوەکەیدا کە بەمە لە چوارچێوەی چاولێکەری و شوێن کەوتن دەردەچێت . بەکورتی : شوێن کەوتن (التقليد) لەزاراوەی فیقهیدا بریتی یە لە شوێن کەوتنی موجتەهید لە بڕیارێکدا بێ زانینی بەلگەکەی . وەلەزاراوەی لۆژیکیدا ئەو بیروباوەڕ بونە گومانبڕە ناسەلماوەیە ئیتر پراوپڕی واقیع بێت یان نا . شوێن کەوتن سەرەڕای ئەوەی کە پێویستە بەنیسبەت ئەوەی کەتوانای دەرهێنانی بڕیاری شەرعی نیە لە دەقەکان ، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت : (فسئلوا أهل الذكر ان كنتم لا تعلمون )[1] لەگەڵ ئەوەشدا خراپی و ئەنجامی نەرێنی هەیەو ئاسەوارە خراپەکانی دەگەڕێتەوە سەر کۆمەڵگا ، بەشێوەیەکی تایبەت ئەوکۆمەلگەیەی کە ئاینزا گەلێك و چەندان هۆزو ڕای جۆر بە جۆری تێدایە ، سەرباری ئەوە زۆر بەی کات دەبێتە هۆی ئالۆزی و پشێوی لە بڕیارە دادوەریەکان و فتوا شەرعیەکاندا لەبەر ئەمە پێویستە هەوڵی زانینی بە

---

[1]. سورة النحل/٤٣

لگەی هەموو بڕیارێك بدرێت لە سەرچاوە بنەڕەتیەکەیەوە لەلایەن هەموو کەسێك کە ئەو توانایەی هەبێت . یان دەسەڵاتی بڕیار دەر هەڵسێت بە بەیاساکردنی دەقە فیقهیەکان پاش هەڵبـژاردنی ڕای بـەهێز لـە ڕا فیقهیەکانـدا و خـەڵکی پابەنـد بکـات بـە دەقەکانـەوە کـە بەیاسـاکراون لـە ڕا بەهێزەکان ، بـۆ نـە هێشـتن و قەلاچـۆکردنی دوو بەرەکیـە ئـاینزایی و دەمارگیریەکان کە وەك نەخۆشی شێرپەنجە وایە لە ترسناکیدا لەسەر تاك وکۆمەڵگە .

٤—**گومان** : بریتی یە لەلایەنی (الراجح) پەسەندتر لە پەی پێبراوەکانی مـرۆڤ هۆکـاری ئەو پەسەند کردنە هەر چیەك بێـت . وە ئـەوەی شـایانی باسـە کـە زۆربـەی هۆکارەکـانی سەلماندنی دادوەری لە بەڵگە گومانیـەکان ، کـەوابو پێویسـتە لەسـەر دادوەر کـە کـردەوە بکات بە گومانی زاڵ و بەپێ ی خواستی ئەو بڕیار بدات بۆ پارێزگاری کردن لە مافی خەڵکی پێ شێل کردن ، دادوەر وەك وتمان داوای لێناکرێت کە کار نەکات و بڕیار نەدات بـە بەڵگـە دڵنیا کەرەکان نەبێت ، چونکە ئەگەر بەو شێوەیە نەبێت مـافی خـەڵکانێکی زۆر پـێ شـێل دەکرێـت . لەبـەر ئـەوەی زۆری هۆکارەکـانی سـەلماندنیان گـەواهی دانـی شـایەتەکانە کەئەوانیش بە لگەگەلێکی گومانین . هەروەها داوا ناکرێت لە موجتەهیدێك کە هەوڵی خۆی دەخاتە کار بۆ هەڵگۆزینی بڕیاری شـەرعی یـان یاسـایی بـۆ بابەتـە پەیوەنـدی دارەکـە بـە بڕیارەکەوە لەبەرئەوە بۆ گەشتنە دڵنیایی بەڵکو پێویستە لەسەری بە پێ ی خواسـتی ئـەو گومانە هەڵس وکەوت بکـات کـە پێـی گەشـتووە چـونکە (ئیجتیهـاد) پرۆسـەیەکی عـەقڵی گومانیە هەڵەو ڕاست هەڵدەگرێت ، لەبەر ئەمە ناگەیەتە پلەی دڵنیایی مەگەر بە دەگمەن .

٥— الشك (دوودڵی) : دوودڵ بونە لە نێوان هەردو بارودۆخی شتە پـەی پێبراوەکـەدا لـە بون و نەبون یان ڕاستی و درۆیان دروست بون یان بە تاڵی یان چاکە و خراپـە یـان وێنـەی ئەمانە لەو بارو دۆخە گوماناویانە . بۆ نمونە : ئەگەر هەر کام لە داوا کارو داوا لەسەر تۆمـار کراو بەڵگە یـان هێنـا لەسـەر داوا کـەیان و هـەردوو داواکـە یەکسـان بـون بـە پلـەی هێـزی سەلماندن و لاوازی دا ، هەردو داواکە وەرناگیرێت بە پێ ی ڕێسا ئوسوڵی و لۆژیکیەکان کـە دەڵێت : دوبەڵگەی دژ بەیەك ئەگەر نەدەگونجا یە کێکیان بـە پەسـەند تـر بزانرێـت لـەوەی تریان ، یان نە دەکرا یە کێکیان هەڵبوە شێنرێتەوە ، هەردووك وەرناگیرێن ، دروسـت نیـە دادوەر هیچ کامێکیان بەکار بهێنێت ، چونکە ئەم دۆخـە ڕاڕایـی دروسـت دەکـات لـە نێـوان ڕاستی و درۆدا یان دروست و نا دروستدا . یان ڕودان و ڕونەدان و وێنەی ئەوە . ئەم دو دڵیە

یە کەپێ ی دەوترێت (شك) دروست نیە بەكار بهێنرێت وەلە رێسا یاسایی یەكانە كە دەڵێت : بێگومان دودڵی لەبەر ژەوەندی گومانلێكراو تاوانبار كراو لێك دەدرێتەوە ، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت كە ئەو دەبێتە بەلگە ، بەلكو دوودڵی هۆكارێكە بۆ گەڕانەوەی دادوەر بۆ بڕیار دان بە بێتاوانی لە بناغەدا كە خۆی جۆرێكە لە جۆرەكانی (الاستصحاب) (بەردەوامی دۆخی پێشو) لەبەر ئەوەی مرۆڤ بە بێتاوانی دێتە دنیاوە و ئازادە لە پابەندی یە مەدەنی و تاوانكاریەكان، بۆیە لەسەر دادوەر پێویستە لە كاتی نەبونی بەلگەی ڕازیكەردا بڕیار بدات بە بێ تاوانی تاوانبار كراوە كەو (گومانلێكراوەكە) ، وەلەسەر ئەم بناغە یە رێسای (گومانلێكراو بێ تاوانەتا تاوانبار كردنی دەسەلمێت) بنیات نراوە .

٦- الوهم : (وازانین) بریتی یە لە لایەنی پەسەند كراو (المرجوح ) لە پە بێبردنی (ڕێپێبردنی) هەردو دۆخی شتە ڕێپێبراوەكە ، بۆ نمونە : ئەگەر داواكەرەكە بەلگەی هێنا لەسەر سەلماندنی داوا كەی و ئەم بە لگەیە نە دەگەیشتە پلەی دلنیایی و بێگومانی ، بە لكو گومانی زاڵی لای دادوەر دروست دەكرد كە داواكەی خاوەن بەلگە كە ڕاستە ، بێگومان دادوەر لەم دۆخەدا ، هەڵدەگرێت پەی بە لایەنەكەی تر بەرێت كە ئەویش ناڕاستی و ناواقیعی بونی بەلگەكەیە ، كەوابو ئەم پەی پێبردنە پەسەندكراون(لەبەرترە) پێ ی دەوترێت (وازانین یان واڵێ تێگەیشتن) وە هۆكارەكانی سەلماندن لە بیستراو یان نوسراوو خوێنراوە وەك وەلامگۆی (إفادة) شایەتەكان و پاڵ پشتە میری و ئاسایی یەكان وێنەی ئەمانە هەواڵن (خبر) هەموهەواڵێكیش ڕاستی و درۆ هەڵدەگرێت و ڕاستی و ساختەكاری بە مەرجێ ئەو بەلگانە نەگەیەنە پلەی دەم بەدەمی (التواتر) یان چەسپاندن و سەلماندنی دلنیایی بەهۆی بە هێز كردنیان بە هۆكارە بەرجەستەیی یان زانستیەكانەوە ، بەلام ئەمانە گومان بە هێز دەكەن بەرامبەر ڕاستی بونیان ، پێویستە لەسەر دادوەر بە پێ ی خواستی ئەمانە بڕیار بدات و بۆی نیە بە پێ ی لایەنی پەسەند نەكراو ( المرجوح) ی ئەم گومانە زاڵە بڕیار بدات كە ئەویش وە همەكەیە كەوابو وەهم لە هەموو بیرو باوەڕو مامەلە دارایی و نا داراییەكاندا ڕەتدەكرێتەوە و هەروەها لە هەموو پەیوەندیە مرۆڤایە تیەكاندا .

٧- التخیل : خەیاڵكردن : برتیی یە لە پەیبردنی پێچەوانە بەرامبەر پە یبردنی مكوڕ لە سەركراوەكە ، هەركەس مكوڕبو لەسەر ڕاستی شتێك یان واقیعی بونی لە ڕێگەی دلنیایی یەوە یان نەزانینی لێكدراوە وەیان چاولێكەری و گومانەوە ، بێگومان هەندێكجار لایەنی

پێچە وانەی ئەم مکوڕ ( مجزوم بە ) لەسەر کراوە ڕێ پێ دەبات سەرە ڕای ئەوەی ئەو پەی پێبردنە زۆر لاوازە ، وەئەمەش لە زاراوە لۆژیکیەکاندا بە خەیاڵ ناو دەبرێت ، ئەم پلەیەش خوارترین و نزم ترین پلەکانی زانینی مرۆڤە . شایانی (باسە خستنە ڕوی کورتی پلەکانی زانست بە پێ ی زنجیرەیی سروشتی خۆی بوو لە بەهێز ترینەوە بۆ لاواز ترین ، وە هەریەکەش لە دڵنیایی و نەزانی ئاوێتە و چاولێکەری و گومان کەر دواتەنی لە بەشی باوەڕ کردنە کانن (باوەڕپێکراوەکانن) التصدیقات ، وە هەریەکە لە گومان و وەهم و خەیاڵ لەبەشی وێناکردنەکانن (التصوارت) .

وێنا کردن و باوەڕکردنەکان :

وێناکردنەکان و باوەڕکردنەکان وەك باسمانکرد بابەتی زانستی لۆژیکن لەبەر ئەوە پێویستە زۆر شارەزایمان هەبێت تێیاندا . .

زانینی شتەکان وێنا کردنە ئەگەر پەی پێبردن نەبو بە خستنە پاڵی هەواڵی ڕێگەی مل کەچ بون[1] و سەلماندنەوە ، بە پێ ی ئەم قسەیە پەی بردنی مرۆڤ بە کارەکان وێنا کردنە لەم چوار دۆخەی خوارەوە دا .

١_ پەی پێبردنی تاکەکان بێ ئەوەی هەندێکیان ببە سترێت بە هەندێکی تریانەوە وەك پێ زانینی تاوان و ڕێبردن بە گومانلێکراو ، شایەت ، داوا ، بەڵگەی بێ تاوانی ، دادوەری ، سزا ، بێ بە ستنی ئەم تاکانە بەیەکتریەوە .

٢_ پەی پێبردنی دانە پاڵە ناتەواوەکە : وەك پەی پێبردنی لێکدراوەکە وەك : تاوانی ساختەکاری ، کوشتنی بە ئەنقەستی دەست درێژ کاریانە ، بێتاوانی گومانلێکراو ، تاوانبار کردنی گومانلێکراو وەڵامگۆی شایەت ، وێنەی ئەمانە لەو ڕستەناتەوا وانە کەپێك هاتون یان

[1]. البرهان للکلبنوی (الشیخ اسماعیل بن مصطفی ) ناسراو بە شیخ زادە الکلبنوی (ت ١٢٠٥ ك) ئەمە کاتێك ئەگەر زانست لە واتەی چۆنیەتی بێت ، یان زەین وێنەکە وەردەگرێت ئەگەر لە واتەی سۆزکار تێکراوبێت یان زەین پەیوەندی بە وێنەکەوەهەبێت . ئەو کاتە لە واچەی ئۆباڵدا (الإضافة) وە ئەگەر ئە سڵی وێنەکە لە دەرەوەی زەین بور پێ ی دەوترێت زانستێکی بەدەست کەوتو(حصولی) وەئەگەر وێنەکە لە زەیندا بوو ئەوە پێ ی دەوترێت زانستی ئامادەیی (حضوری) .

ناوو ئاوەڵناو وەك تاوانی دەست درێژکارانە یان لەناوو پیتێك وەك : لەماڵەکەدا یان لە کردارێك و پیتێك وەك (ئەگەر هات) وە هەروەها. . . .

٣_ پەی پێبردنی وەپاڵدانی تەواو لە نێوان تاکەکاندا ئەگەر هەواڵی نەبێت و مانایەکی نەبێت پێش هەواڵ لێدانی وەك ڕستە داوایی یە (الطلبية) تەواوەکان کەواتە ڕستەی داوایی ئەوەیە کەواتایەك دروست دەکات پێش ڕستەکە بونی نەبووە ، وەك ئیجاب و قبوڵ (الإيجاب والقبول ) لە گرێبەستە دارایی و نادارایییەکاندا وەك قسەی فرۆشیار ئۆتۆمبیلەکەمم پێ فرۆشتی بەوەندە ، قسەی سەر پەرشتیاری کچ کچەکەمم لێ مارە کردی (کردم بەژنت ) لەسەر ئەوەندە مارەیی ، قسەی دەزگیرانەکە بە شودانی کچەکەتم وەرگرت لەسەر ئەوەندە مارەیی هەروەها ڕێژگەی داخوازی و قەدەغەکان لە دەقە شەرعی و یاساییەکاندا و شێوەکانی پرسیار و بانگکردن و شێوازی (صیغة ) ئاوات خواستن و ئومێد کردن هەموڕستەی داواین (طلبی) و تەواون واتا دەگەیەنن هەر ئەوەیە لە وێنا کردنەکانن لە زانستی لۆژیکدا نەك باوەڕ کردنەکان .

٤_پەی پێبردن (زانینی ) دانە پاڵی تەواوی هەواڵی لە نێوان وشەکاندا پەی پێبردنێك کە بە شێوەی مل کەچی نەبووە [1](قبول کردن ) بەڵکو بەشێوەی وەهم و یان گومان یان خەیاڵکردن بووە ، کەوابو هەمو گوماناویەك یان وەهم پێ براوێك یان خەیاڵکراوێك لە زانستی لۆجیکدا بە شێکە لە وێناکردنەکان .

ب_ [illegible] :

پەی پێبردنێکە ئەم چوار مەرجەی خوارەوەی تێدابێت :

١_ دەبێت زانینێك بێت لەبارەی دانە پاڵی وشەکانەوە بۆ لای یەکتر.

٢_دەبێت دانە پاڵەکە تەواو بێت ، بە جۆرێك قسەکە (ڕستەکە) مانای تەواو بگەیەنێت و ناتەواو نەبێت .

٣_ دەبێت دانە پاڵە تەواوەکە هەواڵی بێت واتە : ناوەڕۆکێك دەرببڕێت کە پێش ئەم قسەیە ڕویدا بێت .

---

[1] .

٤_ دەبێت دانە پاڵەکە لەگەڵ مل کەچیدا بێت بۆی .

**[illegible]**

هەریەکە لە وێناکردن و باوەڕ پێکردن دابەش دەبێت بۆ بەڵگە نەویست(بدیهی) و تیۆری.

١_ البدیهی (بەڵگەنەویست) : هەموشتێکە کە سەلماندنەکەی پێویستی بە بەڵگەنیە وەك پەی پێبراوە بەرجەستەکان (کەرەستەیی یەکان) لە وێنا کردنەکان لەڕێگەی یەکێك لە پێنج هەستەوەرە دیارەکانەوە ، وەك ئەزمونکراوەکان و دەماو دەمەکان لە باوەڕ پێکراوەکان ، کەوابو بەڵگە نەویستەکان جیاوازی نیە لەوێناکردن بێت یان باوەڕپێکراو .

٢_ تیۆری بریتی یە لە هەر شتێك کە سەلماندنەکەی پێویستی بە هۆکارێك لە هۆکارەکانی سەلماندن هەیە ئیتر ئەو شتە لە وێناکردنەکان بێت وەك پەیبردن بە ڕاستیەتی مێشك و پێك هێنەرەکانی یان لە باوەڕ پێکردنەکان بێت وەك بڕیار دان بە تاوانبار کردنی گومانلێکراو یان بەبێ تاوانی لەو گومانەی ڕو بەڕوی کراوەتەوە .

ڕامانیش : تێ بینی کردنی کۆکراوەکانی عەقڵە واتە(زانیاریە کۆکراوە کانە لای عەقڵ) بۆ ڕەنێو هێنانی زانراوێك کە دەمانگەیە نێتە نە زانراوێکی وێناکراو، پێ ی دەوترێت ناسێنەر(معرف) و قسەی لێکدەر(قول الشارح) . ئەو زانراوەی دەمانگەیە نێتە نەزانراوی باوەڕ پێکردە ، پێی دەوترێت بەڵگە و نیشانەی بەهێز ، و بورهان لە دڵنیایی یە کاندا (الیقینیات) نیشانەی لاواز لە گومانیەکاندا(الظنیات) ، هەندێجار هەڵە ڕودەدات لە بەدەستهێنانی نەزانراو لە زانراو چ وێناکردنی بێت یان باوەڕپێکراوی ، لەبەر ئەمە پێویستمان بە یاسایەك هەیە کە زەین بپارێزێت لە هەڵە . وەئەم یاسایە زانستی لۆژیکە هەرکاتێك ڕێساکانی جێبەجێ کرا

**بەپێی ئەوەی وتمان بابەتی زانستی لۆژیك** : زانیاریە وێنا کردەیی و باوەڕ کردەنیەکانە کە دەمانگەیەننە نەزانراوە وێنا کردەیی و باوەڕ کردەییەکان (التصورية والتصديقية) .

**سودی لۆژیك** : پاراستنی زەینە لەبە هەڵە بیرکردنەوەکان [1] .

(پوختەی) بەش :

**لۆژیك** : یاسای بەدەست هێنانی نەزانراو(المجهول) لە زانراوی(المعلوم) ماقوڵ بەپێی خواستی عەقڵی ساغ .

**سەر هەڵدانی لۆژیك** : ئەم زانستەسەری هەڵدا لەگەڵ گەشتنی عەقڵی مرۆڤ بەپلەی پێگەیشتن و تەواو بون . یەکەم کەس کەلۆژیکی بەکار هێنا بۆناسینی خوا ئیبراهیمی خەلیل بوو، وە یەکەم کەس لە فەیلەسوفەکان لە لۆژیکدا پەرتوکی نوسی ئەرستۆبو . لۆژیکی عەرەبی ئیسلامی پەرەی سەند بە تێپەڕبون بەقۆناغی گواستنەوەی کە لەپورو کە لتوری یۆنانی بۆ سەر زمانی عەرەبی لە سەدەی هەشتەمی زاینیداو سەردەمی (فارابی) و (ابن سیناو) سەردەمی یەکخستنی نێوان ڕێساو فەلسەفە و ڕێساکانی شەریعەتی ئیسلامی ، هەروەها سەردەمی زێڕینی لۆژیك لە سەدەی (دوازدەهەمدا) وە بەرەو پێشچونی ڕێساکانی بنەماکانی ئاین و بنەماکانی فیقه بە هۆی کاریگەری لۆژیکەوە .

ڕا جیایی دەربارەی چۆنیەتی لۆژیک

زانایانی دەروونناسی پێیان وایە لۆژیك لقێکە لە زانستی دەروونناسی ، زانایانی کۆمەڵناسی دەڵێن لقێکە لە زانستی کۆمەڵناسی ، زانایانی زمانناسی ڕایان وایە کە بەشێکە لە زانستی زمان زانایانی ئەو دیو سروشت (المیتافیزیقیا) دەڵێن لۆژیك بە شێکە لە میتافیزیقیا و جگە لەوە . ئەوەی ڕاستی بێ کە لۆژیك زانستێکی سەر بە خۆیە یا ڕێساو بابەت و ئامانجەکانی خۆیی هەیە .

**گرنگی لۆژیك لە زانستە ئیسلامیەکاندا**

**گرنگی لۆژیك لە بیرکاریدا**

**گرنگی لۆژیك لە یاسادانان و گۆڕین و هەڵوەشاندنەوەی یاسادا**

**گرنگی لۆژیك لە دادوەری و گونجاندنی ڕودلوی یاسایدا**

**گرنگی لۆژیك لە لێکۆڵینەوەی زانستی و ڕێگەکانی توژینەوەدا**

---

[1]. البرهان : ١٤ ، و تنویر البرهان : ل ١٨

## گرنگی لۆژیك له لێكدانەوەی یاساكاندا

**بابەتی زانستی لۆژیك** : زانراوه وێنا كردەیی و باوەڕكردەیی یەكانه كه دەمان گەیه نێته نەزانراوه وێنا كردەیی و باوەڕ كردەیی یەكان .

پلەكانی زانست له ژێر ڕوناكی لۆژیكدا.

هەروەك لەمەوپێش دو باسمان کرد لەبەشی یەکەم لە باسی لۆژیکی یۆنانیدا کە بابەتی زانستی لۆژیك زانراوە وێنا کردەیی و باوەڕ کردەییەکانە ، لە ڕوی بەکار هێنانیان لە بەدەست هێنانی نە زانراوە وێنا کردەیی و باوەڕ کردەییەکان ، بەرەوپێش چونی ژیان لە هەموو بوارەکاندا لە هەموکات و شوێنێکدا بریتی یە لەم پرۆسە لۆژیکیە ، مرۆڤی بە شدار لەو بەرەو پێش چونەدا پێ ی بزانێت یان نا ، شتێکی بە لگە نە ویستە کە زانیاریەکان بیرگە لێك و کۆمەڵە چەمکێکن لە مێشکدا کۆ کراونەتەوە(ئە مبار کراون) یان بەشێکی تایبەت لەو کە هەڵدەستێت بەم کارە ، گوێزانەوەی ئەم زانیاریانە لە مامۆستاوە بۆ فێرخواز یان لە نەوەی ڕابوردووە بۆ ئەوەی پاشین و داهاتو تەنها لە ڕێگەی وشەکانەوە دەبێت ، لەبەر ئەوەی ئەمانە قاڵب و چوار چێوەی دەفری هزرەکانن . هەر وەك ڕازی بونی هەربولا ڕەگەزێکی سەرەکی یە لە گرێبە ستەکاندا ئەوێش شاراوەیە ، بۆ ئاگادار بون لێی و پێ زانینی پێویست بە دەر برینێك هەیە لە جیهانی شاراوەوە(ویستی شاراوە) بیهێنێتە جیهانی دیارەوە (ویستی دیار) هەمان شتە بە گوێرەی ئەو زانیاریانەی کەلە مێشکی مرۆڤدا کۆبونەتەوە ، چونکە ئەو زانیاریانە ناگوێز رێتەوە بۆ خەڵکی مەگەر بەهۆی هۆکارێکی هەست پێکراوەوە بە یەکێك لە پێنج هەستە دیارەکە ، شتێکی ئاشکرایە کە دەربڕین بە هۆی وشەوە سەرتۆپی دەربڕینەکانە . بە پێ ی ئەم ڕاستیە نەریتی زانایانی لۆژیك لە کۆن و نوێدا وا بووە ، لە سەرەتای نوسراوە لۆژیکیەکانەوە باسی وشەکانیان(الالفاظ) کردووە لەسەر ئەو بنەمایەی کە ئەوان پێشەکی گەلێکن بۆ چونە ناو پرەنسیپ و ئامانجە لۆژیکیەکان لەو شتانەدا کە پەیوەندیی بە هێزی بە تیۆرو هزرە لۆژیکیە کانەوە هەیە ، منیش وەك شوێن پێ هەلگرتنی ئەوان بە پێویستی دەزانم کە لە لۆژیکی زمان (منطق اللغة) لە وشەکاندا بکۆڵمەوە بەو ئەندازەیەی کە پەیوەندی بە لۆژیکی یاسایی یەوە هەیە . وشە(بێژە) لە زماندا بریتی یە لەو شتەی کە لە دەم دێتە دەرەوە بە قسەش دەوترێت وشە(اللفظ) . کۆکەی (ألفاظ) ە ، (لفظ) ، بەوە دەڵێن کە شتێك لە دەمدا فرێبدرێتە دەرەوە . ، دەوترێت ، لفظتُ الشيء من فمي واتە : شتە کەم لە دەممدا فرێدا [١]. لۆژیکی یاسایی

[١]. لسان العرب ، فصل اللام ، حرف الظاء : ب ٩ ل ٣٤١ .

دەڵێت (بڕیار دەدات) کە ناسین و زانینی تایبەتمەندیەکانی وشە گرنگیەکی گەورەی هەیە لە ناسین و ڕاڤە کردنی واتای دەقەکاندا و پێویستە لەبە یاساکردن و دەسکاری کردن و ڕاڤە و چەسپاندن و لێکۆڵینەوە یان ، لەبەر ئەمە لەم بە شەدا لە هەندێك لە تایبە تمەندیەکانی وشە دەکۆڵینەوە لە ژێر ڕوناکی لۆژیکی زمان و لۆژیکی یاسادا .

## بە شەکانی وشە لە ڕوی سروشتیانەوە وشەکان لە ڕوی سروشتیانە وە دابەش دەبن

بەسەر سێ بەشدا ، ئەوانیش : الحروف (پیتەکان) و (والأفعال) کردارەکان و( الاسماء) ناوەکانن . بەڵگەی ئەم دابەش بونە ئەوەیە ، وشە یان سەربەخۆیە لە گەیاندنی ماناکەیدا یان نە ، دووەم : پیتەو پێشی دەوترێت ئامێر لە زاراوەی لۆژیکدا . یەکەم یان ماناکەی بەراورد دەکرێت لەگەڵ یەکێك لە سێ کاتە کەدا ( ڕابور دو ئێستا و داهاتو) یان ماناکەی لە یەکێك لەم سێ کاتەدا نیە ، کەوابو یەکەم کردارە( الفعل) لە زاراوەی لۆژیکدا بە وشە ناو دەبرێت و دووەم ناوە ، لە بەر گرنگی پەیوەندی لە نێوان ئەم بەشانەو لۆژیکی یاساییدا بۆ لێکۆڵینەوەی هەر بەشێك باسێکی تایبەتی تەرخان دەکرێت .

# باسی یەکەم:
# پەیوەندی نێوان لۆژیکی زمانی و لۆژیکی یاسایی لە پیتە کاندا

وشەی حرف لە زماندا : واتە : لای شت ، گۆشەو سوچی هەر شتێك . لە وەوە هاتووە کە دەڵێت : حرف الجبل واتە : لوتکەی تیژی سەرەوەی شاخ لە زاراوە دا : هەموشتێك کە لەبارەیدا بێت بوترێت ئیتر واتای هەبێت یان نا . لەبەر ئەمە پیتەکان (الحروف) دابەش دەبن بە دوو بە شەوە : پیتەکانی بنیات نان ، پیتەکانی واتاکان[1]. کەواتە : پیتەکانی بنیات نان : ئەو پیتانەن لە بناغەدا بۆ واتا دانەنراون ، بەڵکو سودەکانیان کورت هەڵدێنێت لە دروست کردن و بنیاتی وشەکان لێیان وەك : (ث ، ج، د، ذ، ر، ز ، ش، ) وێنەی ئەوەیە هەندێکجار پیتەکانی واتا بەکار دەهێنرێت وەك هێما گەلێك (کۆمەڵە سومبولێك ) بۆ نیشاندانی شتە هێما دارەکە ، یان لە بۆ کورت کردنەوە وەك لە بیرکاریدا وایە، یان بۆ پاراستنی نهێنیەکان وەك لە (جفرة) (نهێنیە) سەربازیەکاندا یان پاراستنی شۆرەتی کەسایەتی بۆ کەسی پەیوە ندیدار هەروەك لە بڕیارە دادوەری و پێداچونەوە کاندایە ، چونکە هەریەك لە داواکارو داوا لە سەر تۆمار کراو و تاوانبار و تاوانبەرا مبەرکراو بە پیتێك لە پیتەکان بانك دەکرێت کەزۆربەی جار بەیەکەم پیتی ناوەکە دەبێت، یان لەبەر چەند پێو دانگێکی تر وەك : دەر برینی ناز ناوو مارکە بازرگانیەکان بە هۆی پیتەکانەوە ، ئەو پیتانەی لێکۆڵینەوە یان لە سەر دەکەم لەم باسەدا بریتین لە پیتە واتایی یەکان لەبەر زۆری ئەم پیتانە گرنگترینیان لە ڕوی لۆژیکی یاسایی یەوە باس دەکەین . بێگومان زانینی واتای ئەم پیتانە گرنگیەکی گەورەی هەیە لە بورای لۆژیکیەوە بۆ هەر کەسێك بیەوێت کە مامەڵە

[1]. تەماشای : جمع الجوامع وشرح مع حاشية البناني ب ( ٣٣٦_٣٦٥ ) والتوضيح شرح التنقيح لصدر الشريعة ب ٣٨٤١_٤١٧ .

بكات لەگەڵ دەقەكاندا لە ڕوی دانان و ، دەسكاری و چەسپاندن و ڕاڤە و خوێندنەوە ، چونكە دەقەكان و واتا كانیان جیاوازە بە پێ ی واتای ئەو پیتانە كە لە ڕوی واتاوە دەبێت بە چەند جۆرێكەوە : لەوانە : پیتەكانی جر ، العطف (پەیوەندی ) و الشرط (مەرج ) و (الجزم ) و (النصب ) و (النداء) بانگكردن (التنبیه) (بێدار كردنەوە) و (الزیادة) و (التفسیر) ڕاڤە و(التخصیص) تابیەت كردن و (الإستفهام) پرسیار . . . . وێنەی ئەوە . ئێمە بەتەنها هەڵدەستین بە لێكۆڵینەوەی چەند نمونەیەك لەم جۆرانە و سەرەتا لە پیتەكانی (جەڕەوە) دەست پێدەكەین لەبەر گرنگیان لە جیاوازی بڕیای دەقەكاندا بە پێی جیاوازی واتاكانیان .

## یەكەم : پیتە ڕاكێشەرەكان (حروف الجر)

ئەم ناوەیان لێنراوە چونكە ئەم پیتانە واتای كردارەكان ڕا دەكێشن بۆ پاش خۆیان ، لەبەر ئەوەی كاریگەرییان لەسەر ناوەكەی دوای خۆیانەوەهەیە ، واتە ، وشەكە كە پیتی ڕاكێشەری (حرف الجر) چووەتە سەر ، مەجرور بە ژێر (الكسرة) دیارە بە وشەكەوە یان نادیارو بڕیار دراوە ، یان بە پیتی (یا) مەجرورە وەك لە ناوی دوبارە كراو (المثنی ) و كۆكراوەی ساغی نێرینە (جمع المذكر اسالم) و شەشە ناوەكە (الأسماء الستة) وە لەم پیتانە ئەمانەی خوارەوەن :

أ_ (علی) : بۆ چەند مانایەكی ڕاستینە یان خوازراو بەكار دەهێنرێت گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن :

١_ **الإستعلاء**: (بەرز بونەوە ) واتە : بۆ نیشاندانی ئەوە كەپاش ئەم پیتە مل كەچی پێش خۆیەتی هەروەك لەبڕگەی یەكەمی / بەندی یەكەمی یاسای مەدەنی عێراقی[1] مەدەنی میسری[2] و یاسای باری كە سێتی[3] هاتووە (دەقە یاساكار یەكان بەسەر هەموو ئەو بابە تانە داجێ بەجێ دەبێت كەوشەكانی ئەو دەقانە دەیانگرێتە وە یان ناوەرۆكیان ) ئەوەی تێ بینی دەكرێت لەسەر ئەم یاسایانە ئەوەیە دەسەڵاتی هەڵگۆزینی بڕیاری ناو دەقەكان

---

[1]. ژمارەی ٤٠ بۆ ساڵی ١٩٥١

[2]. ژمارە ١٣١ بۆساڵی ١٩٤٨

[3]. ژمارە ١٨٨ بۆ ساڵی ١٩٥٩

دەداتە دادوەر لە دووکەناڵە وە ، ئەوانیش ، مەبەستی دەق و چەمکی ڕێکی دەقەکەیە . لە کاتێکدا کە دادوەر بۆی هەیە ئەم ئەم بڕیارانە لە شەش کەناڵە وە ( ڕێگە وە) هەڵبگوزێت ئەوانیش : ( مانای ڕاشکاوە ، (المنطوق الصریح) (دلالة لإقتضاء) مانای پێویست ، (دلالة الشارة) مانای ئاماژە ، مانای ئاماژەی لاواز (دلالة لإیماء) چەمکی ڕێك (المفهوم الموافق) چەمکی پێچەوانە (المفهوم المخالف) ، هەروەك ئەم بەشانە باسیان لێوە دەکرێت لە بەشی لێکۆڵینەوەی مانای دەقەکاندا . وە هەمان تێ بینی ڕووبەڕوی یاسای مەدەنی یەمەنی [1] و ئەردەنی [2] دەبێتەوە ، هەروەها ڕویەڕوی یاساکانی تری وڵاتە عەرەبیەکان دەبێتەوە لەبەر هەمان هۆکار . لەبەر ئەمە پێشنیار دەکەین کە ئەو بەندە ناو براوە لە هەموو یاسایەکدا بگۆڕ درێت بەمەی کەدێت : (ئەم دەقانە جێ بەجێ دەبن بەسەر هەموو ئەو بابەت و باسانەدا کە ڕاستە ماناو چەمکی دەقەکان دەیان گرێتەوە) تامانای ڕاشکاو ناڕاشکاو بگرێتەوە بە هەر سێ بەشەکەیەوە و کە چەمکی ڕێك و چەمکی پێچەوانەن

ب_ بۆ هەڵگرتنی (لە ئەستۆ گرتنی ) سەر ئەنجامەکانی زیان و گەرەنتی : هەروەك چۆن کە (ل) بۆ سود گەیاندن دەبێت بەو شێوەیە (بەهەمان شێوە) پیتی ) (علی) بۆ زیان دەبێت . بێ گومان هەریەك لەمان بەم واتایە هاتووە لە قورئاندا وەك خوای گەورە دەفەرمێت : (. . المکسبت وعلیها ما اکتسبت) [3] واتە : هەموو کەسێك سودی کردەوەی چاکی خۆی دەست دەکەوێت ، وەزیانی کردەوەی خراپی خۆی دێتە ڕێ ی لە مادەی ) الخراج بالضمان فکل من کان ضامنا لشئ وعله تبعة هلاکه یستحق غلة فی ضمان لە) (١٧) لە یاسای مەدەنی یەمەنی دایە دەقی یاسای ژ ١٧ (الخراج بالضمان فکل من کان ضامنا مناً لشئ علیه تبعة هلاکه یستحق غلة فی ضمان لهُ ( ئەو شتەی سوودی لێ وەر دەگری دەبیتە زامنیشی) ، کەوابو هەر کەس بویە زامنی شتێك و بەرپرسی تیا چونی ئەو شتەی لە سەرەو شایستەی سوود لێ وەر گرتنە لەو شتە لە ماوەی زەمانەت کردنی ئەو شتەدا ) . ئەوەی تێ بینی دەکرێت پێویستە کە ئەوەی لەم ماددە دا هاتووە ببە ستریتەوە بەوەی کە

---

[1]. ژمارە ١٩ ساڵی ١٩٩٢ بەندی یەکەم

[2]. ژمارە ٤٣ بۆساڵی ١٩٤٦ بەندی یەکەم ، ماددەی دووەم پڕاو پڕی یاسایی شارستانی یەمەنی یە .

[3]. سورة البقرة الایة ٢٨٦.

نابێت بە لابونەکە (الحیازة) نادروست بێت وەك لە بندەستا نەبونی دز بۆ ماڵی دزراو ، یان داگیر کەر بۆ ماڵی داگیر کراو ، چونکە بێگومان ئەو کەسەی ماڵەکەی پێ یە گرەنتیکارە(ضامن) بە ڕەهایی ، کاتێك ماڵەکە یان شتەکە لە ناو چو ئەوا ئەو لێ ی بەر پرسە بابە کەم تەرخەمیش نەبێت .

سەرەڕای ئەوەش شایەنی سودلێ وەرگرتنی ئەوشتەی نیە لە ماوەی زامن کردنی ئەو شتە دا.

ج_ بۆ ناچاری و سەپاندن و پابەند کردن : هەروەك لە ماددەی ٤١ لە باری کەسێتی عێراقی ئێستادا هەیە (کل من الزوجن طلب التفرق عند قیام خلاف بینها سواء أکان دالك قبل الخول أوبعده)

١_ بۆ هەریەکە لە ژن و مێرد هەیە داوای جیابونەوە بکەن لەکاتی بونی ئاژاوەو ناکۆکی لە نێوانیاندا ئیتر پێش چونە لای ئافرەتەکە بێت یان نا.

٢- لەسەر دادگا پێویستە ڕێکارەکانی لێکۆڵینە وە بگرێتە بەر دەربارەی هۆکارەکانی ئەم ناکۆکیە ، ئەگەر بۆی دەرکەوت کە هەیە ، بریار دەدات کە داوەرێك لە کەس و کاری ژنەو دادوەرێك لە کەس و کاری پیاوەکە دیاری دەکات . . . هتد

٣- پێویستە لەسەر دو دادوەرەکە (ناوبژیوانەکە) هەوڵی چاك کردنی نێوان ژن و پیاوەکە بدات . . . . هتد . هەروەك لە ماددەی(علی المحکة عند تقدیر العویض أن تأخذ نظر الاعتبار التغیر الحاصل فی الأسعار بما یحقیق تعویض المتضرر تعویضا کاملا) (٤٣٤ ) لە پرۆژەی یاسایمەدەنی تازە (نوێ ) ی عێراقی (پێویستە دادگا لە کاتی دیاریکردنی بژار دندا (التعویض) تەماشای گۆڕانکاری نرخەکان بکات بەشێوەیەك کە زیان قەرەبو بکاتەوە بۆ زیانلێکەوتو بە تەواوی ) .

د_ بۆ لە بریتی و لە جیاتی : هەروەك لە ماددەی ٧٩٦ یاسای شارستانی ئەردەنی دا هاتوە (اذا لم یعین فی الحقدأ جر علی العمل استحق المقاول أجرا المثل مع قمة ماقدمه من المواد التی تطلبها الحمل) (ئەگەر لە گرێبەستدا کرێیەك دیاری نەکرا بە لێندەر دەبێت کرێ ی وێنەی ئەو کارەی بدرێتێ لەگەڵ نرخی ئەو کەرەستانەی کە کارەکە پێویستی پێیەتی) واتە : کرێ ی وێنەکەی ئەو کارەی دەدرێتێ کە پێ ی هەڵدە ستێت .

هـ- بۆ چاك كردن به واتای بەلاَم : هەروەك له ماددەی ( ٢٦٤ ) /١ مەدەنی ئـەردەنی (یضاف الفعل إلی الفاعا لا لآمر مالم یكن مجبرا عالی أن الآجبار المعتبر فی التصرفات الفعلیـة هو الاكراه الملجئ وحده) ( كار دەدرێته پالّ بكەر نەك داوا كەر (الآخر) بەمەر جێك بكەرەكە (ئەنجامدەرەكە) زۆری لێنەكرا بێت ، بەلاَم ئەو زۆر لێكردنه لەبەر چاوگیرا( المعتـبر) وه لـه رەفتاره كرداریەكان تەنها زۆر لێكردنی مللجیء ە) دەسته واژەی (علی ان) واته : بەلاَم زۆر لێكردن .

و_ بۆ مەرج : هەروەك له ماددەی ٨٩٢ /١ ئەردەنی :) لكل مـن المـودع والمـودع لدیـه فسخ العقد متی شاء علی أن لایكـون الفسـخ فـی وقـت غـیر مناسـب) ) (بـۆ هـەر یەكـه لـه سپێرەر (المودع ە) و لا سپێرد راو (المودع لـدیـه) گرێبـه سـتەكه هـەلّبوه شـێنێتەوه هـەر كاتێك ویستی به مەرجێك هەلّوەشاند نەوەكه له كاتێكی ناگونجاو دا نه بێت ) .

ز- بۆ پاساو دانەوه(خۆ دەر خستن) : وەك له ماددەی ١/١٩٠ عێراقیدا هەیه :(إذا أتلف مال غیره علی زعم انه ملە ضنم ما أتلفه) (ئەگەر مالّ و سامانی كەسانی تری له ناو برد بـه بیانوی ئەوەی كه مالّی خۆیەتی زامنه لەو مالّەی له ناوی بردووه ) .

ح_ به واتای ( مع ) لەگەلّ وەك لەم ئایەته داهاتووه : (وآتی المال علی حبـه ) [1] واتـه : مالّەكەی دا له رێگەی خوادا لەگەلّ ئەوەشدا كه خۆشی دەوێت .

٢_ **الباء**: ئەم پیته بۆ چەند مانایەكی ڕاستینه و خوازراو بەكار دەهێنرێت وەك ئەمانەی خوارەوه :

أ _ بەواتای (علی) هەروەك له ماددەی ( ١/١٠٠٤ ) ی ئەردەنیدا هاتووه :(تبقی للـدین الحـال بهضـمانه بـالرغم مـن تغـیر شـخص المـدین) ( قـەرزه رەوا ن كراوەكـه زامینەكـەی دەمێنێتەوه سەره ڕای گۆڕانی كەسی قەرز دار) واتەسەرەرای لەبەرئەوەی پیتی -ب- لەم بوارەدا بەكارناهێنرێت لەم بوارەدا مەگەر به شێوەی خوازه .

ب_ بۆ هۆكاری : وەك له ماددەی ( ١٠١٧) ی ئەردەنیدا هەیه (هەوالّە هەمدیس كۆتایی پیّ دێت به هۆی دانەوەی قەرز له لایەن لاڕەوا نەكراوەكه چ بەڕاستی و دیاری یان مەعنەوی

[1]. سورة البقرة الایة ١٧٧

. هەروەکو لە ماددەی ٢٨ لە یاسای سزا کانی عێراقیدا هاتووە(الركن المادي للجريمة سلوك إجرامي بارتكاب فعل حرم القانون أو الآمتناع عن فعل أمر بـه القـانون (پایـەی مـادی تـاوان ئاکارێکی تاوانکاریە بە هۆی ئە نجامدانی کارێکەوە کە یاسا بەتاوانی دەزانێت یان نـەکردنی کارێـك کـە یاسـا فـەرمانی پێکـردووە ) پـیتی (ب) لەوشـەی (بارتکـاب) بۆهۆکاریونـە(ج) . هەروەك لە ماددەی (٢٤٥ ) لـە پـرۆژەی یاسـای مـەدەنی عێراقـی دا هەیـە : (ينتقـل حـق المساطحة بالميراث والوصية) (مافی ڕوبەر کاری دەگوێزێتەوە بە هۆی میرات و سـپاردەوە)

ج- بەندی بەواتای(مع) لەگەڵ هـەروەك لـە مـاددەی ٤٥/ بەنـدی (٢) یاسـای عێراقیـدا دەبینرێت . (والمطن المختار لتنفيذ قانوني يكون هو الموطن بالسنبة لكل ماتعلق بهذا العمـل بمافي ذلك إجرا إت التنفيذ إلا إذا نص صراحة على قصر الموطن على أعمـال دون أخـرى) [١] شوێنی هەڵبژێر دراو بۆ جێ بەجێکردنی کارێکی یاسایی تەنها شوێنێك دەبێت بـە نیسـبەت هـەموو شـتێکەوە کـە پەیوەنـدی بـەم کـارەوە هەیـە لەگـەڵ ئەوانەشـدا ڕێکارەکـانی جـێ بەجێکردن ، مەگەر کاتێك بە ڕاشکاوی ئەو شوێن دیاری بکرێت بۆ جـێ بـەجێکردنی چـەند کارێکی یاسایی بێ کارەکانی تر پیتی (با) لە ڕستەی (بمافي ذلك) دا بەواتای (مع) دێت واتە لەگەڵ ئەوەدا.

د- بۆ پیا نوسان و بەراورد بون : هەروەك لـە مـاددەی (١٧٤) ی بەنـدی یەکـدا (١) لـە یاسای سزا کانی عێراقیدا هاتووە(إذا وقع الاخلال أولخش بقصد الاضرار بالدفاع عن البلاد أو بعمليات القوات المسلح كانت العقوبة الإدام) شایانی باسـە پیتـی (ب) دەچـێتە سـەر لـەبری هینراو (المبدل منه) لەکاتی بەکار هێنانی دەربڕینی (إیستیبدالا) یان داڕێژراوەکە(مشـتقاته) بەڵام زۆر جار نوسەرەکان دەکەونە هەڵـەوە کاتێـك کـەپیتی (ب) دەخەنـە سـەر لەبریەکـە لەباتی ئەوەی بیخەنە سەر لەبری هێنراوەکە بۆنموونە دەوترێت لەسـێدارەدان دەگۆڕدرێـت بەسزای هەتاهەتایی کەچی ڕاست وایـە بوترێـت (يسـتبدل بالاعـدام العقوبـة الؤبـدة) سـزایی هەتاهەتایی دەکرێتە لەسێدارەدان(ئەگەر کەلە بەر دروست کردن و فێڵ و چاو بەستی ڕویدا بـە مەبەسـتی زیـان دان و زیـان گەیانـدن لـە بـەرگری لـە وڵات یـان پرۆسـەکانی هێـزە

[١]. سورة الجاثية الاية ١٢.

چەکدارەکان ئەوا سزاکە سێدارەیە) واتە ئاژاوەگێڕیەك یان فێڵێك بەئامانجی زیانگەیاندنە) هەروەك لە ماددەی : ١٥٦ دا هاتووە لە هەمان سزادا :(يعاقب بالاعدام من ارتكب فعلا عمدا بقصد المساس باستقلال البلاد ووحدتها) ( سزادە درێت بەلە سێدارە دان هەرکەس کارێکی ئەنقەستی ئەنجامبدات بەمەبەستی زیان گەیاندن بەسەر بەستی و یەکیەتی وڵات )

هـ_ بۆ نیشان دانی ئەوە کە ئەو وشەیەی لە دوایەوە دێت ئەوە لەبری هێنراوەکەیە(المبدل منه) . هەروەك لە ماددەی (٤٧٢) بەندی یەکەمی یاسای یەمەنیدا هاتووە ( پابەندی نویَ دە بێتەوە( بەردەوامە) لەم بارودۆخانە دا :

١_ (بتغيرالدين إذا إتفق الطرفان على أن يستبدل بالالزام الاصلى إلزام جديد يختلف عنه فى محله أومصدره) (بە هۆی گۆڕانی قەرزەوە ئەگەر هەر کاتێك هەر دولایەنەکە ڕێك کەوتن لەسەر ئەوەی کەلە جێگەی پابەند بونی بنە ماییدا ، پابەند بونێکی نویَ جێگەی بگرێتەوە کە جیاواز بیَ لە پابەندیە ئەسڵیەکە لە شوێن یان سەر چاوەیدا) .

٣_ (من) : ئەمیش بۆ چەند واتا بەکار دەهێنرێت لەمانە :

أ_ بۆ هۆکار بون زۆر جار دەستە واژەی (من جرإ ذلك ) بەکار دەهێنرێت ، وشەی (من) لەم دەستە واژەدا بۆ هۆکار بون دەبێت .

ب_ بۆ ڕون کردنەوە : هەروەك لە ماددەی ١٧ ی یاسا ئەردەنیدا هاتووە(يسير على المسائل الموضوعية الخاصة فى الولاية والوصاية والقرابة وغريها من النظم الموضوعية لحماية المحجوبين والغائبين قانون الشخص الذى تجب حمايته) (یاسای ئەو کەسەی کە پێویستە بپارێزرێت جیَ بە جیَ دەبێت بەسەر باسە بابەتیە تایبە کاندا لەسەر پەرشتیکردن و سپاردەیی (الوصاية) و نزیکیدا (القرابة) جگە لەمانە لە سیستەمە بابەتیەکان بۆ پاراستنی نادیار و بیَ بەشەکان ) . هەروەك لە ماددەی (٢٧٤) لە هەمان یاسادا (كل من أتى فعلا ضارا بالنفس من قتل أوجعرح أو يذاء يلتزم بالتعويض عما أحدثه من ضرر للمجنى عليه أو ورسثه الشرعيين، أو لمن كان يعولهم وحرموا من ذلك سبب الفعا الضار) کەوابوو وشەی(من) لەدەستەواژەی (من قتل أوجـرح. . . . . . إلخ) بۆ ڕونکردنەوەی کارە زیانگەیەنەرەکەیە کەچیە؟ (هەر کەس کردەیەکی زیاندەری کرد بە کوشتنی کەسێك یان برینـدار کردنـی یـان

ئازار دانی ، ئەوا پا بەند دەبێت بە بژار دنەوەی ئەو زیانەی کەلە تاوان لەگەڵ کراوەکەی داوە ، یان میرات بەرەکانی دەبژێرێتەوە ، یان بۆ ئەوانەی کە بە خێوی دەکردن بێ بەش بون لەو بە خێو کردنە بە هۆی ئەم کارە زیان گەیەنەوە) .

ت_ بۆ مانای پارچە پارچە کردن (للتبعيض) : هەروەك لە ماددەی (١٢٧٢) ی بەندی (٢) ی یاسای ئەردەنیدا هەیە(وتكتسب بالقدم الحقوق المجردة الضاهرة، ومينها المرور والمجرى والمسيل إلا إذا ثبت أن الحق غير مشروع، فانه يتعين رفع ضرره مهما بلغ قدمه) وشەی(منها) واتە هەندێکی( بەدەست دێنێت بۆ هۆی دێرین بونەوە مافە ڕوتە دیارەکان ، لە وانە تێپەڕ بون ، جۆگە، جۆگەی تێپەڕ بونی ئاو ، مەگەر کاتێك سەلما کە مافەکە نادروستە (غير مشروع) ، لەم کاتەدا دەبێت زیانەکەی لابەرێت هەر چەندە لە زووەوەبێت ) .

ث_ بۆ خستنە بەرەوە (للمفاضلة) واتە لەگەڵ ناوی خستنە بەرەوەدا بەکار دەهێنرێت هەروەك دەوترێت التعبير الصريح في العقود أولى من التعبير الضمني) واتە : دەر برینی ڕاشکاو لە گرێبەستەکاندا بە جێ ترە( شیاو ترە) لە دەربڕینی نائاشکرا ناواخنی .

ج_ بۆ سەرە تای مەبەست : لابتداء الغاية هەروەك لە ماددەی ١٦٤ لە یاسای سزادانی عێراقیدا : (تكون مدة إيقاف التنفيذ ثلاث سنوات تبدأ من تأريخ الحكم) (ماددەی وە ستاندنی جێ بە جێ کردن سێ ساڵە دەست پێ دەکات لە سەرەتای بەرواری بڕیارەکەوە).

٤_ **(ل) لامی مەجرورکەر** : بە کار دەهێنرێت بۆ چەند واتایەکی ڕاستینە یی (الحقيقة) یان خوازەیی (المجاز) هەندێکلە وانە کە لە مەولا دێن :

أ_ بۆ سود وەر گرتن و سەرپشك بۆن بەیەکەوە (الانتفاع) والخيار معا : هەروەك لە ماددەی ٧٧٢ ی بەندی (١) ی یاسای ئەردەنیدا هەیە(للمستعير أن ينتفع بالعارية على الوجه المعتاد في الا عارة المطلقة ألتي لم تقد بزمان أو مكان أو بنوع من الإنفاع) (خوازەر (المستعير) بۆی هەیە سود وەر بگرێت لەو شتەی خواستویەتی بە شێوەی ئاسایی لە خواستنی ڕەهادا (الإعارة المطلقة) کە نەبە سترابێت بە کات ئان شوێن یان جۆرێك سود لێ وەر گرتنەوە)

ب_ تەنها بۆ سەر پشك کردن (للخيار فقط) : هەروەك لە ماددەی ١٣٥ ی بەندی (٤) دا لە یاسای مەدەنی عێراقی(وإذا سلم الفضولي العين المعقود عليها المن تاخاقد معه فهلكت

فی يده بدون تعد فللمالك أن يضمن قمتها أيهما شاء) (ئەگەر هەرکاتێك فزولی (فضولی) شتە گرێبەست لەسەر کراوەکەی دایە دەستی ئەو کەسەی گرێبەستەکەی لەگەڵ کردووە ، لە ئەنجاما لە ناو چو بە دەستی کابراوە بە بێ هیچ کەمتەر خەمی و دەست درێژ کاریەك ئەوا خاوەن شتەکە دەتوانێت (بۆی هەیە) کە نرخەکە ی لە هەر کامێکیان بسێنێت کە دەیەوێت ) .

ج_ تەنها بۆ سود لێ وەرگرتن (الانتقاع فقط) وەك لەم ئایەتە پیرۆزەدا هاتووە(الله الذی سخر لكم البحر لتجری الفلك فيه بأمره ولتبتغوا من فضله ولعلكم تشكرون) [1] واتە : ئەو خوایەی دەریای بۆ سودی ئێوە ڕامکردووە تا کەشتی تێدا بروا بەرێوە بە فەرمانی ئەوە ، وەتا بچن بە شوێن بەرژەوە ندیەکانتاندا لە شکۆو گەورەی ئەوەوە ، و بەشکوم سوپاسگوزاری بکەن .

د_ بۆ هۆهێنانەوە (للتعليل) هەر وەك لە ماددەی ١٣٨ ی بەندی (٣) دا هاتووە لە یاسای عێراقیدا :(ومع ذلك لايلزم ناقص الأهلية إذا بطل العقد لنقص أهليته أن يرد غير ماعاد عليه من منفعة بسبب تنفيذ العقد) (لەگەڵ ئەوەدا پێویست نابێت لەسەر کەسێك کەشایستەی تەواو نەبێت ئەگەر گرێبەستەکەی هەڵوەشاندەوە لەبەر ناتەواوی شیانی کە جگە لەو قازانجانە بگێڕێتەوە کە بە بۆنەی جێبە جێکردنی گرێبەستەکەوە بۆی گەڕاوە تەوە) ئەوە تێبینی دەکرێت کە یاسادانەری عێراقی لە ئاراستەی خۆی دەرچووە لەم برگەدا چونکە گرێبەستی کەسی شایستەی نا تەواوی بەوە تەماشا کردووە کە هەڵوەشاندنەوەی هەڵدەگرێت هەر وەك ئاراستەی فیقهی ڕۆژئاوایی ، کەچی لە ماددەی ٩٧ دا دەقی پێداناوە کە هەڵس و کەوت و مامەڵەی منداڵی بچوکی چاك و خراپی جیاکەرەوە وەستێنراوە .

هـ_ بۆ گونجان (للصلاحية) : هەروەك لە ٨٥٢ ی بەندی (١) یاسای ئەردەنیدا هاتووە (للوكيل الذی وكل ببيع مال موكله بصورة مطلق أن يبيعه با لثمن المناسب) (دە گونجێت بۆ ئەو بریکارەی کە کراوەتە بریکار بۆ فرۆشتنی ماڵی بریکارگرەکەی (موكل) بە شێوەیەکی ڕەها کە بیفرۆشێت بە نرخێکی گونجاو) .

[1]. سورة الجاثية الاية ١٢.

و_ بە واتای (علی) دێت بۆ پابەند کردن : هەروەك لە ماددەی ١٩١ ی بەندی ٣ عێراقیدا هاتووە(عند تقرير التعويض العادل عن الضرر لابد للمحكمة أن تراعي في ذالك مركزالصوم) کەوابوو پیتی(ل) لەوشەی(للمحكمة) دا بەواتای (علی) دێت واتە:لەسەر بەبەڵگەی بوونی وشەی (لابد) لەپێشیەوە (کاتی بڕیار دانی بژاردنی دادگەرانە بۆ هەر زیانێك پێویستە دادگا لەو کارەدا ڕەچاوی پایەو شوێنی بکات) .

ز_ بۆ خاوەنێتی (للملكية) : هەروەك لە ماددەی (٧٢) ی یاسای شارستانی عێراقیدا هاتووە :تفقد الاموال العامة صيفتها بانتهاء تخصيصها للمنفعة العامة وينتهي التخصيص بمقتضى القانون أوالفعل أو بانتهاء الغرض الذي من أجله خصصت تلك الاموال للمنفعة العامة (سامانی گشتی سیفەتەکەی ون دەکات ( واتا بە گشتی نانا سرێت ) بە کۆتایی هاتنی تایبەتکردنەکەی بۆ سودی گشتی ، وە ئەم تایبە-تکردنە بە پێ ی خواستی یاسا کۆتایی دێت ، یان کار یان بەکۆتایی هاتنی ئەو مەبەستەی کەلە پێناویدا ئەو سامان و ماڵە دانراوە(تایبەتکراوە) بۆ سودی گشتی. ئەوەی تێ بینی دەکرێت لە سەر ئەم ماددەیە ئەوەیە (سودو) سود لێوەر گرتنیان یەکسان سەیر کردووە (تێکەڵ کردووە) ڕاست وایە کە بوترێت بۆسود لێوەرگرتنی گشتی(للانتفاع العام وليس المنفعة العامة نەك (سودی گشتی ) ، چونکە سودی هەموو ماڵێك بریتی یە لەو وزە شاراوەیەی کە لەو ماڵە دایە و وەسف ناکرێت بە تایبەتی و گشتی یەتی. ئەمەش تێکەڵ کردنێکە کە شەرعزانانی ڕێچکە (حنفی) تێکەو تووەو کەسانێکیش بە شوێن ئەواندا چون : چونکە وتویانە ئەو سودە بە ماڵ نادرێتە قەڵەم چونکە لەگەڵ نوێبونەوەی کاتدا ئەویش هەمان دۆخی هەیە ، کەوابو پێناسەی ماڵی (سامانی ) بەسەر دا نا چەسپێت . چونکە ماڵ هەموشتێکە کە مرۆڤی پێ دەو ڵەمەند دەبێت (یتصول بە) و دەگونجێت هەڵبگیرێت و کۆبکرێتەوە بۆ کاتی پێویستی ئەگەر مامەڵە پێکردنی لە ڕوی شەرعەوە ڕێگە پێدراوبو) ئاشکرایە ئەو شتەی لەگەڵ نوێبونەوەی کاتدا نوێ دەبێتەوە تەنها سودی لێ وەر گرتنە (الإنتفاع) نەك سود(المنفعة) ، لەسەر ئەم تێکەڵکردنەی وتمان ئەم قسەیان بنیات ناوە کە دەڵێت : داگیر کەر نابێتە زامنی سودی ماڵە داگیر کراوەکە ، چونکە زامن بونەکە بەنرخی ماڵەکە دەبێت ئەگەر ماڵە لە ناو چووەکە نرخی بوو(قیماً) وە دەبێت وێنەی ئەو ماڵە پەیدا بکات ئەگەر ئەو ماڵە فەوتاوە وێنەی (وەك خۆی ) دەست دەکەوت ، ئەمەش دیارە لە سودەکاندا نایە تەدی (نابێت ) لەبەر سودەکان

نه به ماڵی نرخی دەدرێته قەڵەم نەبە ماڵی وێنە دار (مثلیی) سەرە ڕای ئەم هەڵەی تێكەڵ كردنە ، ڕاكەیان ، كە دەڵێت داگیر كەری ماڵ زامنی سودی ماڵە داگیر كراوەنیە لەگەڵ دادگەری و لۆجیكدا دژایەتی هەیە ، چونكە داگیر كەر زانی سودی ماڵە داگیر كراوەكەیە بە ڕەهایی ئیتر كەمتەر خەمبێت یان دەست درێژ كار بێت كە فەوتاندنی ئەو ماڵە دا یان لە بێبەش كردنی خاوەن ماڵەكە لێ ی لەسەرە تاوە (یەكە مجار) .

٥_ **(فی) : بە چەند واتایەك هاتووە لە وانە :**

أ_ بۆ ئاوەڵ فرمانی شوێنی ڕاستین (لظرف المكان الحقیقی ) هەروەك لە ماددەی (٦) ی یاسای سزاكانی عێراقیدا هاتووە (تسري أحكام هذا القانون علی جمع الجرائم التی ارتكبت فی العراق) ( بڕیارەكانی ئەم یاسایە هەموو ئەو تاوانانە دەگرێتەوە كە لە عێراقدا ئەنجامدراوە) .

ب_ بۆ ئاوەڵفرمانی كاتی : وەك ئەوە بوترێت تاوانی دزیكردن هاوكاتە بە كاتێكی تونكراوەوە ئەگەر لە شەودا ئەنجامدرا .

ج– بۆ ئاوەڵفرمانی خوازەیی (للظرفیة المجازیة) : هەروەك لە ماددەی (٤٨) لە یاسای سزاكانی عێراقیدا هەیە(یعد شریكا فی الجرمة من حرض علی أرتكا بها. . . . الخ) (هەر كەسێك ، كەسێ هان بدات بۆ كردنی تاوانێك ئەوا ئەو كەسە بە هاوبەشی ئەو تاوانبارە دادەنرێت ) . . . هتد )

د_ بۆهۆ هێنانەوە (للتعلیل) : وەك لەم فەرمودەیەی پێغەمبەردا هاتووە : (دخلت إمرأة النار فی هرة) واتە ئافرەتێك چویە دۆزەخەوە بەهۆی ئەوەی پشیلەیەكی زیندان كردبو نەیدە هێلا بە ئازادی بگەڕێت و بژیت .

## دووەم : پیتەكانی لێكدان ( حروف العطف ) :

وشەی (العطف) لە زماندا واتە: الإمالة: لاركردنەوە ، لەبەر ئەوەی ئەم پیتانە چەماوە و گێڕدراوەكە (المعطوف) دەگێڕێتەوە بۆ وشەكەی پێش خۆی (معطوف علیه) بە گێڕەرەوە و لاركەرەوە ناو براوە ، هەندێك لەم پیتانە:

**١_ الواو(و)** : بەکار دەهێنرێت بۆ چەند مانایەکی خوازەیی (مجازی) و ڕاستی (حقیقی) کە ئەمانەی خوارەوەن:

أ_ بۆ کۆ بە ڕەهایی (للجمع مطلقاً) : بیّ ڕەچاو کردنی ڕێخستن (ترتیب) هەروەك لە ماددەی ٦٩٦ ی بەندی (١) ی یاسای ئەردەنی دا هاتووە (یشترط لصحة الحوالة رضاء المحیل والمحال علیه والمحال لە) (بەمەرج گیراوە بۆ دروست بونی حەواڵە دەبێت حەواڵەکەر (االمحیل) و حەواڵە بۆ سەر کراو (محال علیه) و هەواڵە کراو هەموو ڕازی بن) ، کەواتە ئەوەی داواکراوە: ڕازیبونی سیّ لایەنەکەیە ، بیّ ئەوەی پێش کەوتن یان دوا کەوتنی ڕازی بونی یەکێکیان لە وی تریان لەبەر چاو بگیرێت.

ب_ للترتیب (بۆ ڕێکخستن) : هەروەك لە ماددەی (٨٧) لە پرۆژە یاسای مەدەنی عێراقیدا هاتووە: (الحق میزة یمنحها القانون ویحمیها تحقیقا للمصلحة العامة) : (ماف تایبەتتمەندییەکە یاسا دەیبەخشێت و دەیپارێزێت لە پێناوی بە دیهێنانی بەرژەوەندی گشتی) .

ج_ بۆ نیشاندانی ئەوەی کە ئەو ڕستەیەی دەکەوێتە دوای پیتی (واو) ەوە ڕستەیەکی حاڵیە و ئەو واوەش پێی دەوترێت واوی حاڵی ، و دەبێتە بەندێکی لەبەرچاوگیراو لە چەسپاندنی ڕاستە مانای دەقدا ، ئەگەر ڕاستە مانای دەقەکە نەهاتەجیّ . دادوەر چەمکی پێچەوانەی ڕاستە مانا دەچەسپێنێت. هەروەك لە ماددەی (١٠١) دا لە یاسای سزاکانی شانشینی عومماندا هاتووە (لا عقاب علی من ارتکب جرمیة وهو فی حالة جنون أفقدته الوعي أو الإرادة) : (هیچ سزایەك لەسەر کەسێك نیە تاوانێکی ئەنجام دابێت کە بەهۆی ئەو نۆخەوە ویست و هەستی لە دەست دابێت) .

د_ بۆ مەرج (للشرط) : بەشێوەیەك گێڕدراوەکە ببێتە مەرج بۆ بڕیارەکە ، هەروەك لە ماددەی (٦٠٦) یاسای یەمەنیدا هاتووە: (إذا أجاز مستحق الصرف وکان مجلس العقد قائما صح الصرف) : واتە ئەگەر مەجلیسی گرێبەستەکە گیرابوو. وشەی (صرف) واتە: گۆڕینەوەی دراو هەندێکی بەهەندێکی (ئەگەر پیّ شیاوەکە (المستحق) ڕێگەی دابوو بە گۆڕینەوەی پارەکە (الصرف) وە مەجلیسی گرێبەستەکە گیرابوو ئەوا گۆڕینەوەکە دروستە.

هـ_ بۆ جیاکردنەوەی سروشتی گێڕدراوە و بۆ لاگێڕدراوە (للفصل بین طبیعة المعطوف والمعطوف علیه) : وەك لەم فەرمودەی قورئانەدا هاتووە: (ومن ثمرات النخیل والأعناب

تتخذون منه سكراً و رزقاً حسناً) [1] (لەبەر ئەوەی لە داری خورما و تـریێ . عـەرەق و ڕزق و ڕۆزیەکی چاك وەردەگرن) واتە: عەرەق ڕۆزیەکی ناشیرینە لەبـەر نـەبونی شـتێك لـە نێـوان جوانی و ناشیرینیدا .

٢- ( **أو** ) **بەکار** دەهێنرێت بـۆ چـەند مانایـەکی ڕاسـتێ و خـوازەیی ، لەوانـە ئەمانـەی خوارەوەن :

أ __ بـۆ دابەش بوون و جیابونەوە (للتقسيم والإنفصال) هـەروەك لـە مـاددەی (٦٧) ی یاسای ئەردەنی دا هاتووە: (يكون الحق شخصياً أو عينياً أو معنوياً) : (ماف یان کەسی یە یان ماددی یە یان مەعنەوی) وە لە تەرازوی لۆجیکدا ئـەم دەقـە یاسایی یـە بـە باسـێکی لێکجیـای ڕاسـتینە دادەنرێـت ، ناتوانرێـتـ بەشــەکانی بەیەکـەوە کۆبکرێتــەوە . ئەگـەر مەبەستمان لە (حق ) مانا گشتی یەکەی بێت و لایەنی دارایی و هیتر بگرێتەوە. . هەنـدێجار باسەکە خالّی نیە لـە هـەردوو شـتەکە و یـەکێکیان هەیـە و کۆنەبونـەوەی تێدانیـە ، واتـە: دروستە گێڕادراوە (المعطوف) و بۆ لاگێڕدراوەکە کۆبکرێنەوە ، بەلاّم دروست نیە بابەتە کە هەردوکیانی تێدا نەبێت بەیەکەوە هەروەك لە ماددەی (٣٩٥) لە پـرۆژە یاسـای شارسـتانی عێراقیدا هاتووە: (دروست نیە بۆ هیچ یە کێك لە ئەنجامدەرانی گرێبەست پەشـیمان بنـەوە لە گرێبەستەکە و گۆڕینی. . مەگەر بە خواستی دەقی یاسا یان ڕێکەوتنی هەردوولا) ، ئـەم دەقەش باسێکی جیای خالّیە لە هەردوو شتەکە ، کەواتە دروست نیە پەشیمان بونەوە یان گۆڕین مەگەر بە ڕازیبونی هەردولا یان دەقی یاسا. بەلاّم دروستە کۆبکرێنەوە بـە یەکـەوە ، بەو جۆرە ڕێککەوتن لە ڕێگەی ڕەزابونەوە بێت لەگـەلّ دەقـی یاسـاییدا. کـەوابوو دەقەکـە بریتی یە لـە کێشـەیەکی بـەش لێکجیـای دژە خـالّی بـوون. جـاری وا هەیـە بابـە تەکـە بـە پێچەوانەی ئەوەوە دەبێت واتە: دژە کۆبونەوە (مانعة الجمع ) ، بەلاّم دژەخالّی بـون نابێـت هەروك لە ماددەی (٢٧٨) دا هاتووە لە پڕۆژەکە دا: (يجوز أن يبرم عقد الفندقة لمدة محددة أو غير محددة) دروستە کە گرێبەستی مانەوە لـە میوانخانـەدا ئەنجامبـدرێت بـۆ ماوەیـەکی دیاری کراو بێت یان نادیار. جا لەم باسەدا دروست نیە هەردوو ماوە دیارەکە و نادیارەکە کۆ

---

[1]. سورة النحل /٦٧

بکرێنەوە ، چونکە دژایەتیان لەنێواندا هەیە ، بەڵام دروستە هیچ کامێکیان نەبێت ، بەوەی باسی ماوەکە نەکرێت بە ڕەهایی ، بەو جۆرەی ئەوەی دەچێتە میوانخانەکەوە دەرگای کات لەبەردەمیدا کراوەبێت بەپێی ئارەزوی کەسەکە و ویستی خۆی.

ب_ بە واتای (و) دێت: هەروەك لە ماددەی (٨٤٦) ی یاسای ئەردەنیدا هاتووە: (یلتزم الوكیل لضمان الضرر الذی یلحق بالوكیل من جراء غزله فی وقت غیر مناسب أو غیر مبرر مقبول) : (بریکار پابەند دەبێت بەو زیانەوە کە توشی وەکیل دەبێت لە ئەنجامی بێکارکردنی لە کاتێکی نەگونجاودا یان بێ بەهانەیەکی وەرگیراو. کەواتە پیتی (أو) لەم دەقەدا پێویستە بە واتای (واو) ڕاڤەبکرێت.

ج_ بۆ جیاکردنەوەی لە نێوان سروشتی گێڕدراوە (المعطوف) و بۆلاگێڕدراوە (المعطوف علیه) دا: هەروەك لە ماددەی (١٨٦) بەندی (١) لە.یاسای شارستانی عێراقیدا هاتووە: (إذا أتلف أحد مال غیره أو أنقص قیمته مباشرة أو تسببا . یکون ضامنا اذا كان فی إحداثه هذا الضرر قد تعمد أو تعدی) : (ئەگەر یەکێكماڵی کەسێکی تری لەناو برد یان نرخەکەی کەمکردەوە –ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ– بە زامن دادەنرێت ئەگەر ئەو زیانەی بەئەنقەست یان بەدەست درێژکاری گەیاندبوو) . یاسادانەر دەست درێژکاری (التعدی) گێڕاویەە بۆلای بە ئەنقەست (تعمد) بە هۆی پیتی (أو) ەوە وەك لە دەقە عەرببیە کەدا هاتووە ، بۆ نیشاندانی ئەوە کە نیازی زیان گەیاندن بە کەسانی تر لە گێڕدراوەکەدا نیە بە پێچەوانەی بۆ لاگێڕدراوەکە (المعطوف علیه) . کەوابوو دەست درێژکاری مانای بوونی ویست و نیاز ناگەیەنێت. بێگومان هەندێك لە لێکدەرەوانی یاسای عێراقی کەوتونەتە هەڵەوە لە تێگەیشتن و ڕاڤەی واتای وشەی (تعدی) دا ، وا گومانیان بردووەکە یاسادانەری عێراقی لەم ماددەیەدا کەوتۆتە ژێر کاریگەری فیقهی ڕۆژئاوایی بە گوێرەی توخمەکانی بەرپرسیاریەتی کەمتەرخەمیەوە ، کە بریتی یە لە (هەڵە +زیان +پەیوندی هۆکاری) . وە شایانی باسە هەڵەکردن لە فیقهی ڕۆژ ئاواییدا جیاوازە لە هەڵە لە یاسای عێراقیدا کە کاریگەرە بە فیقهی ئیسلامی ، هەڵە لە فیقهی ڕۆژ ئاواییدا بریتی یە لە بەجێ نەگەیاندنی ئەرکێکی یاسایی لەگەڵ پێ زانینی ئەو هەڵەیە بەپێی ئەوە پێویستە دوو ڕەگەز لە هەڵەدا هەبێت مادی و مەعنەوی ڕەگەزە مادیەکە ، بەجێ نەگەیاندنی ئەرکێکی یاسایی و مەعنەوی یە کە هەستکردن و زانینی بەجێ نەگەیەنەرەکە بە بەجێ نەگەیاندنی ئەرکە یاسایی یەکە.

بەڵام هەڵە لە یاسای مەدەنی عێراقیدا تـەنها بریتـی یـە لـە پایـەی یەکـەم ئـەویش بـە جـێ نەگەیاندنی ئەرکێکی یاساییە واتە هەستان بە کارێکی ڕێگە پێنـەدراو لـەڕووی یاساییەوە. جیاوازی نیە بەجێ نەگەیەنەرەکە بەم بەجێ نەهێنانـەی بزانێـت هـەروەك لـە دۆخـی زیـان گەیاندن بە کەسانی تر لـەڕووی ئەنقەسـتەوە بێـت ، یـان نـەزانێت شـێوەیەکی وا کـە هـیچ ویستێکی نەبێت وەك منداڵی جیانەکەرەوە (غیر الممیز) و شێت و کەسـێکیش وەك ئـەمان وابێـت ، یـان خـاوەن ویسـت بێـت بـەڵام لـە ڕێگرێـك هـەبێت لـە بـەردەم بـەکار هێنـانی هەستپێکردن و ویستی دا ، هەروەك لە دۆخەکانی لە لێ تێکچوون و سەرخۆشـی و خـەو و بێ ئاگایی و هەڵە کردن و. . . . وێنەی ئەمانە. لەم ڕاستیەوە دەگەینە ئـەو دەرئەنجامـەی کە توخم و پێکهێنەرەکانی بەر پرسیارێتی کەمتەرخەمی لە یاسای عێراقـی کاریگـەریوو بـە فیقهی ئیسلامی بریتی یە لە: (بەجێ نەهێنانی ئەرکێکی یاسایی (یان کارێکی ناڕەوا) + زیان + پەیوەندی هۆکاری) ئەم جیاوازیە لە نێوان هەردوو فیقهی ئیسلامی و ڕۆژ ئاواییدا تەنها لە دۆخێکا دەبێت: کە هەڵەکە مەدەنی و ڕاستەوخۆ و ئەرێنی بێت ، بەڵام لە هەڵەی تاوانکاری و هەڵە لەدۆخی بوونەهۆدا (التسبب) و هەڵەی نەرێنی. . ئەوا جیاوازی نیە لـە نێـوان فیقهـی ئیسلامی و ڕۆژ ئاواییدا لە بەمەرج دانانی هـەبوونی هـەردوو پایـەی مـاددی و مەعنـەوی لـە هەڵەکردندا. کەوابوو پێویستە بەجێ نەگەیەنەر بە بەجێ نەهێنانەکەی خۆی بزانێت ، ئەگەر وانـەبوو ئـەوا ڕەچـاو ناکرێـت و بێبایەخـە ، وەك بـونی بـە توخمێـك لـە پێکهێنـەرەکانی بەرپرسیارێتی شارستانی بە هەردوو بەشەکەیەوە ، یان بەر پرسیارێتی تاوانکاری. بەڵگەش لەسـەر ڕاشـەکردنی بـۆ (دەسـت درێـژکاری) بـە مانـای (نـاڕەوای ڕەهـا) بـە چاوپۆشـی لـە شایستەیی ئەنجامدەرەکە ئەمانەی خوارەوەیە:

**یەکەم**: جیاکردنەوە لە نێوان دەست درێژکار و ئەنقەسدا بەهۆی وشـەی (أو) ەوە ، وە ئەوەش نیشان دەدات کـە وشـەی (التعدی) لـە دەقـە یاساییەکەدا بەشـێکی سـەربەخۆی جیایەلە وشەی (تعمد) ، بەشی سەربەخۆش جیایە لەگەڵ بەشی بەرامبەریدا ئەگـەر بـوونی توخمی مەعنەوی لە وشەی دەست درێژکاریـدا بەمـەرج گـیرا ، کەواتـە هـیچ جیاوازیـەك نـا مێنێتەوە لە نێوان ئەنقەست و دەست درێژکاریدا ، ئەمـەش پێچـەوانەی لـۆجیکی زمـانی و لۆجیکی یاسایی یە.

دووەم : ئـەنجام دەرەکـە ئەهلیـەتی ئـەوەی نـەبێت یـان هـۆش و زانینـی خـۆی بەکارنەهێنێت. . کارە نادروستەکە لە پەسنی نادروستی داناماڵێت ، هـەروەك بکوژ ئەگـەر شـێت بـوو یـان منـداڵێکی جیاکـەرەوە نـەبوو. . کـارە ئەنجامدراوەکـەی لـە پەسـنە تاوانکاریەکەی ڕووت ناکاتەوە. کارەکە بە تاوانکاری دە مێنێتەوە ، بەڵام ئەنجامدەرەکە لە ڕووی تاوانکاریەوە بەرپرس نیە لە بەر بوونی بەریەست: کە شێتی یان بچوکی یە ، بە پێـی ڕێسای: (هەر کاتێك خوازەر و ڕێگر دژ یەك وەستان ئەوا ڕێگر دەخرێتەپێشەوە) .

**سێ یەم** : بە بەڵگەی ئەوەی کەلە ماددەی (١٩١) ی یاسای عێراقیدا هاتووە کە :

١_ (إذا أتلف صبي مميز أو غير مميز أومن في حكمهما مـال غـيره لزمـه الضـمان مـن ماله) : ئەگەر منداڵێکی جیاکەرەوە یان جیانەکەرەوە یان کەسێك وەك ئەوان وایە. . مـاڵی کەسێکی تری فەوتاند پێویستە ئەو زیانە لە ماڵی خۆی ببژێدرێت.

٢_(إذا تعذر الحصول على التعويض من أموال من وقع منه الضرر إن كـان صـبيان غـير مميز أو مجنونا جاز للمحكمة أن تلزم الولي أو القيم أو الوصي بمبلغ التعويض على أن يكون لهاذا الرجوع بما دفعه على من وقع منه الضرر) : ئەگەر بە هەر بەهانەیەك نەدەتوانرا زیـانی زیان لێکەوتووەکە ببژێردرێت لە ماڵی زیان دەرەکە. . ئەگـەر منـداڵێکی جیانەکـەرەوە بـوو یان شێت بوو دروستە بۆ دادگا سەر پەرشتیارەکەی یان سەر سپاردەکەی پابەند بکات بەو ئەنـدازە بژاردنـەوەوە ، بـەوپێ یـە لـە مـاڵی ئـەو منداڵـە بدرێتـەوە وەك بـژاردن بەسـەر پەرشتیارەکەی یان هەڵسورێنەرەکەی یان سەر سپاردەی منداڵەکـە بـە پێـی ئـەوەی هـیچ بەهانەیەك بۆ دژایەتی لـە نێـوان مـاددەی (١٨٦) و (١٩١) دا نامێنێتـەوە ، کەواتـە وشـەی (تعدی) دەست درێژ کاری لە ماددەی یەکەمدا بە واتای کردەوەی زیانبەخشی نـاڕەوا دێـت بە چاوپۆشی لە لێهاتویی بکەرەکەی.

د_ **بۆ گومان لە قسەکەرەوە:** وەك قسـەی شـایەت لـە کـاتی دواوالێکردنـی شـایەتی داندا: نازانم کە تاوانکار ئایا نیەتی پێشوەختەی هەبووە لە ئەنجامدانی تاوانەکەیدا (کوشتن) یان نە ، وێنەی ئەم قسانە گوماناویە دروسـت نیـە بـۆ داداوەر کـردەوەی پـێ بکـات بـەکار کردنێك دژی بەر ژەوەندی تۆمـەتبار ، چـونکە گومـان لـە بـەر ژەوەنـدی تاوانبارەکـە لێـك دەدرێتەوە هەر وەك لە بەرژەوەندی قەرزارەکە لێك دەدرێتەوە.

هـ_ **بۆ سەرپشککردن**: زۆر جار بەم واتایە دێت لەو دەقـە تاوانکاریانـەدا کـە سـزایەك زیاتری لەخۆ گرتووە ، ئەوسا دادوەر دەسەلاتی هەلسەنگاندنی هەیە لە هەلبژاردنی یـەکێك لەوان یان کۆکردنەوە لە نێوانیاندا بە پێی ئەوەی لە دەقەکەدا هاتووە لەگـەل ڕەچـاوکردنی بارودۆخە دیاری کراوەکـان بـە هـۆی بڕیارەکـەوە هـەروەك لـە مـاددەی (٣٣٤) لـە یاسـای سزاکانی عێراقی کارپێکراودا هاتووە: (يعاقب بالحبس والغرامة أو باحدى هاتين العقوبتين كل موظف أو مكلف بخدمة عامة إستغل سلطة وظيفته) : (هەموو فەرمانبەرێك یان هەر کەسـێك خزمەتێکی گشتی پێ سپێر درابێت و سودوەریکرێت لە دەسەلاتی فەرمنابەریەکەی. . سـزا دەدرێت بە زیندان کردن و بژاردن یان بە یەکێك لەم دوو سزایە) . لە ماددەیـەکی وەك ئـەم ماددەدا دادوەر دەتوانێت یەکێك لە سزاکانی بچەسپێنێت ئەگەر دۆخەکان لـە بەرژەوەنـدی گومان لێکراو بوو یان هەردوو سزاکە کۆ بکاتەوە ئەگـەر دۆخـەکانی کێشـەکە و پاشـەکانی دژی بەرژەوەندی گومان لێکراو و تۆمەتبارەکە بوو.

٣_ **(ثـم) پاشـان**: پیتـی لێکـدەرە بـۆ هاوبەشـی لـە (إعـراب) و (الحكـم) و مۆلـەت بەکاردەهێنرێت لەسەر ڕای دروستی زانایانی زمانی عەرەبی ، وەك ئەوە: وەقفکـار دەلێـت: ئەوە و ئـەوەم وەقـف کـرد لـە سـەر منداڵـەکانی بـرام (ثـم) (أولاد أولاده) پاشـان منـداڵی منداڵەکانی ، لەکێك لە نمونەکانی ئەم پیتە کە بۆ ڕێکخستن هـاتووە. . مـاددەی (٣٤١) لـە پرۆژە یاساکە (سەرپەرشتیاری کۆرپەلە باوکیەتی پاشان دایکیەتی) (ولي الجنين أبـوه ثـم أمه) .

٤_ **الفـاء** : ئـەمیش بـەکار دەهێنرێـت بـۆ چـەند واتایـەکی ڕاسـتینی یـان خـوازەیی ، بەکاریش دەهێنرێت وەك پیتێکی لێکدەر بۆ ڕێکخستنی مەعنەوی و (ذکری) و بـۆ بـەدوادا هاتن (للتعقيب) و بۆ هۆکاری پێشەکەی بۆ پاش پیتەکـە ، هـەروەك لـەم ئایەتـەدا هـاتووە (والسارق والسارقة فاقطعوا أيديهما) [١] ئەو پیاو ژنەی دزی دەکەن دەستەکانیان بـبڕن ، دزی هۆکارە بۆ سزای بڕینی دەست. جاری واش هەیە وەك وەلامێك دێت پاش پیتی مـەرج یـان پیتی أما.

---

[١]. سورة المائدة /٣٨

# باسی دووەم:
# پەیوەندی نێوان لۆجیکی زمانی و لۆ جیکی یاسایی لە کردارەکاندا

وشەی (الفعل) لە زماندا واتە: (العمل) : کردەوە. لە زاراوەدا: وشەیەکە ڕوودانی کارێك نیشان دەدات کە بەرامبەرە لەگەڵ یەکێك لە سێ کاتەکەدا (ڕابورد و ئێستا و داهاتوو) ، کار لە ڕووی کاتەوە دابەش دەبێت بۆ (ڕابردوو و ڕانەبردو و داخوازی) ، ڕانەبردوو هاوبەشە لە نێوان ئێستا و داهاتوودا ، لە هەردووکیان دا ڕاستینەیە ، یان بە ئێستا دەوترێت ڕاستینەدا وە بۆ داهاتوو بەکار دەهێنرێت لە ڕوی خوازەوە[1] ، یان بە پێچەوانەوە. ڕێژگەی گرێبەستە دارایی و نادارایییەکانی زۆربەی کات بە هۆی کرداری ڕابردووەوە دەبێت ئەگەر دەربڕینی ویستی ناوەکی بە وشە بێت ، چونکە کۆمەڵێك هەڵسوکەوتی گوفتارین ، لە لایەن مرۆڤەوە ئەنجام دەدرێت کە شەرع یان یاسا ئاساوارە شەرعی یان یاسایی یەکانی لەسەر ڕێك دەخات ، چونکە ڕابردوو جەختکردنەوە و بەدیهاتن نیشان دەدات لەلایەکەوە ، لە لایەکی ترەیشەوە زانایانی زمان بۆ دروست کردن و پێکهێنانی گرێبەستەکان وشەی تایبەتیان دانەناوە ، بەڵکو یاسادانەر یان یاساداڕێژەر بریاریان داوە کە ڕێژ گەکانی ڕابردوو بە کار بهێنرێت بۆ نیشاندانی ڕووداو یان کارێك ، لەبەر ئەمە هەردوو دەربڕینەکانی پێشنیاز و وەرگرتن بە دەربڕینی ڕابردوو دەبن ، کەوابوو ئەو گرێبەستە دروست نیە کە بە شێواز و شێوەی ڕانەبردوو و داهاتوو دەردەبردرێت ، ئەگەر مەبەست لێی ئێستا نەبێت. بە پێی ئەمە بەکارهێنانی کاری ڕانەبردوو کە بۆ پێکهێنانی گرێبەستەکان بەکار دەهێنرێت پەیماندانە بە گرێبەست کردن و گرێبەست نیە ، کەوابوو پەیمان دان بە گرێبەستکردن

[1]. الرد المختار لابن العابدين ج ٣ ل ١١ ، الانوار للفيقه يوسف الاربيلي ب ل ٣٠٤ ، و وتحفة المحتاج لابن مجر ب ل ٢١٧ و الروضة البيهقية شرح الدمشقية للعاملي ب ٢ ل ٦٩ .

ئـەنجامێکی لـۆجیکی شـێوەی کـاری ڕانـەبوردووە ، ئـیتر لـە گرێبەسـتە داراییەکانـدا وەك پەیمان بە فرۆشتن یان لە نادارایی یەکان دا بێت وەك پەیماندان بە بەشـوودان و ژن هێنـان کە پێی دوترێت خوازبێنی.

## پەیمان دان بە گرێبەستکردن لە لۆجیکی یاسایی دا

ئەگەر دەربڕینی ویست بە دەربڕین و شێوازی ڕابردوو بێت یان ئێستا بـە گـرنگ سـەیر دەکرێت و گرێبەستەکە دادەمەزرێ بە دامەزراندنی یـەکجارەکی ، هـەرکاتێك داخوازیـەکانی تری گرێبەستەکە دابین بون ، بەڵام دەربڕین بە شێوەی داهاتوو بوو لەم کاتەدا لەبـەر چـاو ناگیرێت و گرنگـی نیـە ، مەگـەر لـەو ڕووەوە کـە: پەیماندانـە بـە گرێبەسـت کـردن یـاخود ڕێکەوتنێکی سەرەتایی یە.

**پەیماندان بە گرێبەست کردن:** برتیی یە لەو پەیمانەی کە پەیماندەر پابەند دەبێـت پێوەی بۆ پەیمان لەگەڵ بەستراو لەسەر ئەنجام دانی لـە ئاینـدەدا ئەگـەر ئـارەزووی خـۆی نیشاندا لە ماوەیەکی دیاریکراودا.

**گرێبەستی سەرەتایی:** بریتی یە لە وێنەی پەیمان بە گرێبەستکردن لەگەڵ ئەوەشـدا پابەندکەری هەردوو لایە ، ئەمە بریتی یە لە پەیمانی ئاڵوگۆڕکراو لە ئەنجام دانی گرێبەستێك لە ئایندەدا و لەکاتی گونجاوی دیاری کراو دا.

**هەندێك لە جێبەجێکردنەکانی ئەم بوارە:**

أ_ ئەگەر کەسێك هەڵسـا بـە ئەنجامـدانی پرۆژەیـەك لـە زەویەکدا و پێشـبینی دەکـرد پێویستی دەبێت بە پارچە زەویەکەی دراوسێی. . بۆی هەیە لەگەڵ خـاوەنی ئـەو زەویـەدا ڕێك بکەوێت لەسەر فرۆشتنی پێی لە ئایندەدا بە نرخێکی دیاریکراو لـە مـاوەی دیـاریکراودا ئەگـەر ئـەم ڕێککەوتنـە پێـك هـات ئـەوا دەبێتـە هـۆی پابەنـدبوونی پەیماندەرەکـە بـە فرۆشتنەکەوە بێ ئەوەی پەیمان پێدراوەکە پابەند بێت بـە هـیچ شـتێکەوە ، کـەوابوو ئـەم گرێبەستە پابەندکەری یەك لایەنە.

ب_ ئەگەر بە کرێگر داوای کرد لە بە کرێدەر کە چەند گۆڕانکاریـەکی بناغـەیی لـە ماڵـە بەکرێدراوکەدا بکات و هانی بدات لەسەر ئەم کارە لـە کـاتێکی دیـاری کـراو و سـنورداردا. . ئەگەر وەڵامی داوا کاریەکەی دایەوە و پەیمانەکە لە نێوان هەردوولادا جێ بەجێ کرا. . ئەوا

ڕێکەوتنێکی سەرەتایی دەبێت بۆ کڕین و فرۆشتنی ئەم ماڵە و هەردوولا پابەند دەکات هەر کاتێك توخمە داوا کراوەکانی ئەم ڕێك کەوتنە دابین بوون. بێگومان یاساکانی وڵاتە عەرەبیەکان بابەتی پەیمان بە گرێبەستی چارەسەر کردووە بە ڕێکەوتنی سەرەتاییەوە و گرنگترین پێکهێنەر و حوکمەکانی ڕوون کردۆتەوە. یەکێك لە دەقەکانی ئەویاسایانە: شارستانی عێراقی (م ٩١) ئەردەنی (م ١٠٥– ١٠٦) ، میسری (١٠١_١٠٢) سوری (م ١٠٢) ، لیبی (م ١٠١) ، کوەیتی (٧٢) . وە بەرەنجامی ئەم ماددانە ئەوەیە ئەو ڕێکەوتنەی کە هەردوو ئەنجامدەری گرێبەستەکە یاخود یەکێکیان پەیمان دەدات بە تەواوکردنی گرێبەستێکی دیاریکراو لە ئایندەدا کە دانامەزرێت مەگەر کاتێك هەموو بابەتە بناغەییەکانی گرێبەستەکە شێوەیەکی دیاریکراوی بەمەرج دانا. . ئەوا پێویستە دیسان ڕەچاو بکرێت لەو ڕێکەوتنەدا کە پەیمانی تەواو کردنی ئەم گرێبەستە لەخۆ دەگرێت. وە لە ناوەرۆکی ئەم دەقانەوە دەگەینە ئەم ئەنجامەی کە لە پەیمانی ئەنجامدانی گرێبەستدا بە ڕێکەوتنی سەرەتاییشەوە پێویستە ئەم توخمانەی خوارەوە هەبێت:

١_ التراضي: ڕازی بوونی هەردوولا: پێکهێنەرێکی سەرەکی یە لە پەیماندان بە گرێبەست کردن و ڕێکەوتنی سەرەتاییدا ، هەروەك لە گرنگترین پێکهێنەرەکانی هەموو گرێبەستێکی کۆتاییە ، شایستەیی و نەنگی یەکانی ڕازیبوون بەگوێرەی پەیماندەر لە پەیمان دان بە گرێبەستەکە دەخەملێنرێت ئەگەر گرێبەستەکە یەکلاگیربوو لە کاتی پەیماندا ، چونکە لە کۆتایدا پابەند دەبێت بە گرێبەستەکەوە و هیچ کاریگەریەکی نابێت بۆ نەمانی توانا و لێهاتنەکەی پاش ئەوە ، چونکە گرێبەست کردنی کۆتایی پێکدێت تەنها بەدەرخستنی ئارەزووی پەیمان پێدراوەکە ، بەڵام توانای پەیمان پێدراوەکە لە کاتی گرێبەست کردنە کۆتاییەکەدا دەخەملێنرێت ، دروستە شایستەیی تەواوی نەبێت لە کاتی گرێبەستەکەدا ئەگەر توانای تەواوی هەبوو لە کاتی نیشاندانی ئارەزووی گرێبەستەکەدا ، چونکە پێش گرێبەستی کۆتایی پابەندبوون پێویست نیە بەهیچ شتێکەوە کە ئەم شایستەگیە بخوازێت. بەڵام لە هەموو دۆخەکاندا پێویستە شاستەیی گرێبەست کردن هەبێت لە کاتی پەیمانەکەدا ، بەڵام لە ڕێکەوتی سەرەتایی دوولادایەنەدا. . پێویستە توانا و شایستەیی هەردوو گرێبەستکارەکە لەکاتی ئەم ڕێککەوتنەدا هەبێت یاخود لە کاتی بە ئەنجام گەیاندن و تەواوکردنی گرێبەستی کۆتاییدا. ئەگەر ئەم توانایە هەبوو لەکاتی

ڕێكەتنەكـەدا پاشـان ناتەواویـەك ڕووی تێكـرد. . كاریگـەری نیـە. وە ئەگـەر لـە كـاتی ڕێكەوتنەكەدا ئەم توانایە نەبوو. . ئـەوا بوونەكـەی بەسـە لـەكاتی تـەواوكردن و بڕینـەوەی گرێبەستە كۆتاییەكەدا ، تەواو كردنی گرێبەستەكەش بە مۆڵەت دان دادەنرێت بۆ ڕێكەوتنی كۆتایی.

٢_ ڕێككەتن لەسەر شتە بنەماییەكان: بۆ ئەو گرێبەستەی كە دەویسترێت لـە ئاینـدەدا ئەنجام بدرێت. . پێویستە پایەكانی ئەم گرێبەستە و مەرجە بنچینەییەكانی هـەبن كـە دوو ئەنجامدەری گرێبەستەكە دەیانەوێت لەسەری ڕێك بكەون.

٣_ دیاری كردنی ئەو ماوەیەی كە پێویستە گرێبەستەكەی تێدا ئەنجام بدرێت ، تا ڕێگە هەمواربێت بۆ تەواو كردنی گرێبەستی كۆتایی تەنها بە نیشاندانی ئارەزوو لە لایـەن پـەیمان پێدراوەكەوە ، بێ پێویست بوونی هیچ ڕێكەوتنێكی تر.

٤_ تەواوكردنی شێوە خوازراوەكە لـە ڕووی یاسـاوە ئەگـەر هـاتوو ئـەو گرێبەسـتە كـە دەویسترا بە ئەنجام بگەیەنرێت[1] شێوەیی بوو. هەندێك لە لێكدەرەوانی یاسـای شارسـتانی میسری[2] پێیان وایە: ئەمە مانای دانەمەزرانـدنی گرێبەسـتەكە نیـە لـە كـاتی تـەواو نـەبونی شێوەكەدا. بۆیە ئەم مەرجانە لەبەرچاودەگیرێت چونكە دەگونجێت بەهۆی ئـەم مەرجـەوە بڕیارێك دەستبكەوێت كەجیێ گرێبەستە پەیمان پێدراوەكە بگرێتەوە. لە كاتێكـا هەنـدێكی تر پێیان وایە:[3] ئەگەر ئەم مەرجـە بـەدی نـەهات. . پەیمانەكـە پووچـە. منـیش پـێم وایـە ڕێچكەی یەكەم نزیكترە لە ڕاستی یەوە. دەقی یاسای ئەردەنی ماددە (١٠٦) ، میسری ١٠٢ ، و سوری م ١٠٣ ، لیبی م ١٠٢ دەڵێت: (ئەگـەر كەسـێك پـەیمانی دا بـە ئـەنجام گەیانـدنی گرێبەستێك پاشان نكوڵی لێكرد و ئەوانی تر لای دادوەر شكاتیان لێكرد بـۆ جێبـەجێكردنی

---

[1]. تەماشای ئەم سەرچاوانە بكە : الوسیط ب ١ ل ٢٧٢ پاش ئەوە أصول الإلتزامات للدكتر سليمان مرقص ل ٩٦ پاش ئەوە ، الأستاذ الدكتر حسن الذنون ، النظرية العامة الإلتزامات ل ٧٢، دكتور كمال قاسم ثروت ، عقد البيع دراسة فقارنة ل ٢٦ ، مصادر والإلتزام و عبدالمجيد حكيم ب ل ١٠٩ شرح قعد البيع في القاون المدني العراقي دز مالك دوهان حسن ل٧٩ .

[2]. الا ستاذ مرقص ، سەرچاوەی پێشو ل ١٠٠ مجموعة الاعمال التحضيرية ب ٢ ل ٧٥ التعليق على نصوص الانون المصري للاستاذ النور طلبة ب (٧٨_٧٩) .

[3]. الا ستاذ الدكتور السنهوري ب ١ ل ٢٧٠_٢٧١

پەیمانەکە و مەرجە پێویستیەکانی گرێبەستەکە بە تایبەتی ئەو مەرجانەی کە پەیوەندیان بە شێوەیەکەیەوە هەیە هەبوون. . بریارەکە هەرکاتێك هێزی شتە بریارپێدراوەکەی بە دەست هێنا. . جێگەی گرێبەستەکە دەگرێتەوە. لە ناوەرۆکی ئەم دەقانەوە دەگەینە ئەو ئەنجامە کە: شێوە لەبەرچاو دەگیرێت بە مەبەستی بە دەستهێنانی بریارێکی دادوەری کە جێگەی گرێبەستە پەیمان پێدراوەکە بگرێتەوە ، ئەگینا دروستە پەیمانکە دابمەزرێت وەك گرێبەستێکی پێ رازی بوو کە ئەم ئامانجە بەدی نەهێنێت ، بەلأم لە هەمان کاتدا چەند شوێنەوارێکی تر بەجێ دەهێلێت.[1] بێگومان یاسادانەری میسری پەیمان بە بەخشینی لەم رێسایە کردۆتە دەرەوە ، چونکە دانامەزرێت مەگەر بە نوسراوێکی فەرمی هەروەك لە ماددەی (٤٩٠) دا هاتووە کە دەلێت: (الوعد بالهبة لا ينعقد إلا إذا كان بورقة رسمية) : پەیمان بە بەخشین دانامەزرێت مەگەر بە هۆی نوسراوێکی فەرمیەوە بێت. جار ئەگەر بەخشینێك ئەنجام درا بەبێ هیچ نوسراوێکی فەرمی. . هیچ نرخێکی یاسایی نابێت ، نابێتە بناغەیەك بۆ داوا لێکردنی پەیماندەر بە بژاردن بە هۆی بە ئەنجام نەگەیشتنی گرێبەستی بە خشینەکەوە.[2]

## شوێنەوارەکانی پەیماندان بە گرێبەستکردن

ئەم شوێنەوارانە لە دووقۆناغدا جیاوازن:

**یەکەم**: حەز لە گرێبەست کردن لەلایەن پەیماندەرەوە ، **دووەم**: رێکەوتنی سەرەتا لە کاتی خۆی دا ، وەك ئەمانەی خوارەوە:

**ئاساوارەکان لە قۆناغی یەکەمدا** : دەست پێدەکات لە کاتی بەستنی پەیمانەکەوە ، کۆتاییش دێت بە کۆتایی هاتنی ماوەکە:

---

[1]. اصول الالتزامات الا ستاذ مرقص ل ١٠١ .

[2]. المذكرة الايضاحية للقانون المدني المصري / الاعمال التحضيرية ب ٢ ل ٧٥ تێیدا هاتووە (لەگەڵ ئەوەدا پەیمان دان بە بەئەنجام گەشتنی گرێبەستێکی فەرمی خاڵی بون نیە لە هەر ئاسەوارێکی یاسایی ئەگەر پایەی فەرمی بونی نەبو.

١_ پەیمان پێدراوەكە مافێكی كەسی بەدەست دێنێت كە بـە هۆیـەوە دەتوانێـت داوای برینەوەی گرێبەستی كۆتایی بكات وە سەبارەت بەوەش هـیچ پابەندیـەكی ناكەوێتـە سـەر بەگوێرەی ئەم گرێبەستەوە.

٢_ پەیماندەر پابەند دەبێت بە بەجێ هێنانی پەیمانەكەیـەوە و برینـەوەی گرێبەسـتی كۆتایی ، ئەگەر رێكەوتنێكی سەرەتایی بوو. . مافەكەسێتی و پابەندبوونە رووبەرووەكان بە دی دێنێت ، لەبـەر ئـەوەی هـەردوو لایـەنی گرێبەسـتەكە بـە پەیمانـدەر و پـەیمان پێـدراو دەژمێردرێت.

٣- پەیماندان بە گرێبەست كردن هیچ مافێك ناگوێزێتەوە بۆ لاكەی تـر؟ جیـاوازی نیـە ئایا گرێبەسـتەكە یـە كلاگیربێـت یـاخود دوولا گـیر ، ئـەم ئاسـەوارە ئـەم دەرەنجامانـەی لێدەكەوێتەوە :

أ_ ئەگەر شتەكە لەناوچوو. . لەئەستۆی خاوەنەكەیدایە.

ب_ بۆخاوەن شتەكە هەیە هەڵسوكەوتی پێـوە بكـات پـێش تـەواو بـوونی ماوەكـە بـۆ نیشاندانی ئارەزوومەندی و هاتنی وادەكەی ، هەموو ئەنجام و بەروبوومەكانی بۆ ئەوە.

**ئاساوارەكان لە قۆناغی دووەمدا:** پاش كۆتایی هاتنی ئەو ماوەیەی كـە دیـاریكراوە بۆ ئەوەی پەیماندەرەكە ئارەزوی خۆی نیشان بدات و پاش هاتنی گفتـە دیاریكراوەكـە لـە رێكەوتنە سەرەتاییەكەدا ئەم ئاسەوارانە دەردەكەون:

١_ ئەگەر هەموو پابەندێك پابەندبوونی خـۆی جێبـەجێ كـرد پەیمانەكـە دەگۆرێـت بـۆ گرێبەستی كۆتایی ، ئاسەوارە یاسایی یە بنەڕەتیەكان دەردەكەون لە بەرواری دەرخسـتنی ئارەزووەكەوە نەك لە بەرواری پەیمانەكەوە .

٢_ ئەگەر پەیماندەركە دەسكاری ماڵەكەی كردبوو بە فرۆشتنی بە كەسانی تـر. . ئـەوا پابەندبوونی پەیماندەرەكە بە گوێزانەوەی خاوەنداریەكە دەبێتـە شـتێكی موسـتەحیل كـە ئەگەڕێتەوە بۆ كێشە دروست كردنی پەیماندەرەكە لە پەیمانەكەیـدا و پێویسـتە ئـەم زیـان گەیاندنە ببژێرێت. [1]

---

[1]. اصول الإلتزامات للدكتر مرقصى سەرچاوەی پێشو ل ١٠٣ ، ألبيع فى شرحالقانون المدنى العراقى د. مالك دوهان ل ٨٥ .

٣_ ئەگەر پەیمانەکە بە گرێبەستێکی وەکالەتی درابوو و پەیماندەرەکە هەڵ نەسا بەجێ بە جێکردنی ئەرکەکانی. . دروستە بۆ پەیمان لەگەڵ کراوەکە داوای دەرکردنی بریارێك بکات لە دادوەر کە جێگەی جێبەجێکردنی پەیمانەکە بگرێتەوە ، ئەگەر هاتوو پەیمانەکە مەرجی رواڵەتی خۆیی تێدابوو.

## پەیماندان بە هاوسەرگیری (خوازبێنی)

پەیمان بە هاوسەری کە پێی دەوترێت: (داخوازی) هەروەکو چۆن بە گرێبەست نازمێردرێت ، بێگومان هەمدیس جیا دەبێتەوە لە پەیمان بە گرێبەست یاخود رێککەوتنی سەرەتایی لە بابەتە دارایی یەکاندا ، لەبەر ئەوەی پابەندکەر نیە بۆ هیچ کام لە دوو خوازبێنیکەرەکە یان سەر پەرشتیارەکە یان لە رووی دادوەریەوە. هەرکەس لەوان پەشیمان بوویەوە لە پەیمانەکە ئیتر بە بەهانە و هۆکاری دروستەوە بێت یان نا. . ئەوا بەرپرس نیە لەرووی دادوەریەوە ، وە ناچار ناکرێت لەسەر جێبەجێکردنی پەیمانەکەی ، بەلأم لە روی ئاینییەوە بەرپرسە ئەگەر بۆ ئەم پەشیمان بوونەوە بە هانەی شەرعی نەبوو ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم پەشیمان بوونەوە کۆمەڵێك شوێنەوار بەجێ دێڵێت لەسەر بنەمای بەر پرسیاریەتی کەمتەرخەمی نەك گرێبەستی.

## ئاسەوارەکانی پاشگەزبوونەوە لە خوازبێنی دا[1]

خوازبێنی لە رووی ئەرێنیەوە هیچ کێشەیەك ناوروژێنێت ئەگەر گەیشتە ئامانجەکەی لە برینەوەی هاوسەری پەیمان پێدراودا ، بەلأم لایەنە نەرێنیەکەی ئەوەیە کە یەکێك لە لایەنە خوازبێنیکەرەکان لە خوازبێنیەکە پەشیمان بێتەوە بێ رازی بوونی ئەوی تر ، یاخود یەکێکیان پێش ئەنجامدانی پرۆسەکە بمرێت ، بێگومان ئەمە دەبێتە هۆی مشتومڕ و ئاژاوە

---

[1]. تەماشای ئەم سەرچاوانە دەکرێت : تنویر الابصار والدر المختار ب ٣ ل ١٥٣ — ١٥٤ واعانة الطالبين ب ٣ ل ٢٦٧ ، القوانين العربية المدنية العراقي م(٦٢٣) ، لەیاسای باری کەسێتی تونسی بەندی یەکەم و دووەم ن ،یاساکانی یەمەنی م٢، جەوائیری م٢ ، کوێتی م٢ وم٣ پرۆژەی یاسای یەکگرتوی عەرەبی بۆ بارەکەسێتییەکان م١—٤.

دەربارەی چارەنوسی ئەو خەرجیانەی لەم پرۆسەدا کراوە ، وە ئەو دیاریانەیش کراونەتە دیاری ، ئەو دەر ئەنجامەی بە هۆی پەشیمان بونەوەوە کەوتۆتەوە لە زیانی ماددی و مەعنەوی و ئاکاری کە دەلکێنرێت بە لایەنی بەرانبەرەوە کە ئارەزووی پەشیمان بوونەوەی نەبووە لە پرۆسەکە ، ئەو کەلوپەلەی کە خوازبێنیکەر کڕیویەتی لەوانەیە بەو نرخە نەفرۆشرێتەوە کە پێی کڕدراوە ، ڕەنگە خوازبێنیکراوەکەش واز لە خوێندن بێنێت یان ئەرکە فەرمانبەریەکەی یان ئەو پرۆژەیەی کە بەهۆیەوە ژیانی خۆی مسۆگەر دەکات. . . . هەموو ئەمانە لەسەر داخوازی خوازبێنی کراوەکەیە بە سەیرکردنی وەك مەرجێك بۆ ڕازی بوون لەسەر هاوسەرگیرییەکە ، سەرەڕای ئەوە زیانی ئاکاری و مەعنەوی کە لە خراپی کەسایەتی خوازبێنی کراوەکە یان خوازبێنی کەرەکە لەکاتی بلاوبوونەوەی پەشیمان بوونەوەیان لە گرێبەستەکە لە نێوان خەڵکیدا. پاشان ئاڵوگۆڕکردنی دیاریەکان لە نێوان خوازبێنیکەر و خواز بێنیکراودا یان لە لایەن خزمان و هاوڕێیانەوە. . ئایا چارەنوسیان چیە؟ هەموو ئەم بابەت و کێشە چاوەڕوانکراوانە بەهۆی پەشیمان بوونەوەی لایەنێك لەو دوو لایەنە لە خوازبێنی کردنەکە بەویستی تەنهای خۆی ئەمانە ، یاسادانەر چارەی نەکردوون لە زۆرێك لە یاساکانی وڵاتە عەرەبیەکاندا وچارەسەرێکی دادگەرانەشی بۆ نەدۆزیوەتەوە ، وە زۆربەی زانایانی شەریعەتی ئیسلام لە کاتی لێکۆڵینەوەیان لە خوازبێنی و ئەحکامە پەیوەندی دارەکانی. . بە هۆی سادەیی ژیان لە سەردەمی ئەوان دا ، و ڕوونەدانی ئەم کێشانە مەگەر بە دەگمەن ، بۆ ئەوەی لە درێژە پێدان دوور کەوینەوە کۆتایی دێنین بە لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتە بە خستنە ڕوویەکی کورت کە پەیوەندی بە وەڵامی ئەو پرسیارانەی پێشەوەوە هەیە:

١_ خوازبێنی گرێبەست نیە ، پاش ئەوە بێگومان بەرپرسیارێتی کەسێك لە خوازبێنیەکە پەشیمان دەبێتەوە بەر پرسیارێتێکی گرێبەستی نیە ، ئەگەر چی پەشیمان بوونەوە لە خۆیدا بێ بەهانەی ڕەوا. . دژی ئاکار و شێوازی دروستە ، لەبەر ئەوەی خوای گەورە فەرمانی کردوە بە ئەمەکداری و بە جێهێنانی گفت و پەیمان فەرمویەتی: (. . . وأوفوا بالعهد إن العهد كان مسؤولا)[1] واتە: پەیمان و گفت جێبەجێ بکەن بێگومان پەیمان

---

[1]. سورة الإسراء الاية ٣٤ .

لێرسینەوەی لەسەر دەکرێت. پێغەمبەری خوا (ص) جەختی لەسەر کردۆتەوە لەم فەرمودەیەدا: (آية المنافق ثلاث اذا حدث كذب واذا اؤتُمن خان واذا وعد أخلف) واتە: نیشانەی دوڕوویی سێ یە: کاتێك قسەی کرد درۆ دەکات ، ئەگەر سپاردەی درایە دەست. . ناپاکی تێدا دەکات ، ئەگەر پەیمانی دا. . جێبەجێی ناکات. بەڵام شەریعەتی ئیسلام زۆر ناکات لە خوازبێنیکەر و خوازبێنی لێکراو بە تەواو کردنی گرێبەستەکە ، و ناچار ناکرێن لەسەری ، لە بەر ئەوەی ئەوە زۆرلێکردنە ، پرۆسەی هاوسەرگیری بە زۆر ئەنجامدراو پووچ و بەتاڵە ، پاشان پرۆسەی هاوسەرگیری پەیمانێکی هەتا هەتاییە ، پێویستە دوور بخرێتەوە لە هەموو زۆرلێکردن و ناچارکردنێك.

٢_ پاشگەزبوونەوە هەمیشە لادان نیە لە بەکارهێنانی مافدا. لەبەر ئەوەی هەر کەسێك لە خواز بێنی واز بێنێت. . هەندێك جار پشت دەبەستێت بە بەڵگەیەك کە پاکانەی بۆ بکات ، هەروەها بۆ لایەنەکەی تر نیە داوای بژاردن بکات لەسەر بەر پرسیاریەتی کەمتەرخەم بوون ، ئەمە سەرەرای ئەوەی لەڕووی شەرعەوە تاوانبارە لەکاتی نەبوونی بەهانەیەکی شەرعیدا ، بەڵام بەرپرسیاریەتی لە ئەستۆ نیە لە ڕووی دادوەریەوە تا لێپرسینەوەی لەگەڵ بکرێت لەسەر زیانی دروست بوو.

٣_ پەشیمانبوونەوە دروستە لە ڕووی شەرعەوە بە نیسبەت بەرپرسیارێتی دنیاییەوە ، ڕەوابوونی شەرعی دژی زامنبوونە بەپێی بنەما گشتی یەکان ، لەبەر ئەمە تەنها پەشیمان بوونەوە نابێتە هۆکاری بژاردن ، لەبەر نەبوونی هیچ کام لەو بەرپرسیارێتی (گرێبەستی و کەمتەرخەمی) . بەم پێیە ئەوە کە وترا پێویستە لێکۆڵینەوە لەسەر بناغەی قەربووکردنەوە بکرێت بۆ ئەو زیانەی پێش پەشیمان بوونەوە لە خوازبێنیەکە ڕویداوە ، یاخود پاشی ، ئەگەر کاری هەڵە پێش پەشیمان بوونەوەکە هەبوو و زیانی ماددی لێکەوتبووەوە وەك وازهێنان لە خوێندن یان لە ئەرکی فەرمانبەریی یان دەست هەڵگرتن لە پرۆژەیەکی پڕ قازانج جگە لەو مەرجانەی کە سەپاندوویەتی بەسەر لایەنی زیانلێکەوتوو دا. . لایەنەکەی تر وەك مەرجێك بۆ قبولکردنی خوازبێنی و هاوسەرگیری ، یان پەشیمان بوونەوەکە بوویە هۆی زیانی مەعنەوی وەك ناو زڕاندن یان ناموس لەکەدارکردن. . بێگومان دادوەر پاش دڵنیابوونی لە بوونی هۆکارێك لەم هۆکارانە و هاو وێنەیان ، وە بە پێی داواکاری زیان لێکەوتوو یان ئەو کەسەی لە جێی ئەوە. . دەتوانێت بڕیار بدات بەقەرەبوو کردنەوەیەکی

دادگەرانەی گونجاو لەگەڵ قەبارەی زیانەکەدا ، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت ئەو هەل و مەرجانە لەبەرچاو بگیرێت کە لەگەڵ پاشگەزبوونەوەکەدان لەو خوازبێنیە لەگەڵ ڕەچاو کردنی ئەم پێوەرانەی خوارەوە:

أ_ هەر کەس پەشیمان بوەوە لە خوازبێنییەکە بێ هیچ بەهانەیەکی شەرعی. . دەبێت هەرچی وەرگرتووە بەم بۆنەیەوە بیگێڕێتەوە ئەگەر خودی شتەکان مابوونەوە ، بەڵام ئەگەر نەمابوونەوە. . دەبێت بڕییەکەی بگێڕێتەوە ، ئەگەر مەرجێك یان عورف و نەریتێك ڕێگر نەبێت .

ب_ ئەگەر خوازبێنییەکە کۆتایی هات بە کۆچی دوایی یەکێکیان یان بە هۆکارێکی تری خۆنەویستەوە بوو بەهۆی تەواو نەکرجنی پرۆسەکە. . ئەوا هیچ شتێك لە دیارییەکان ناگەڕێنرێتەوە مەگەر بە ڕێکەوتنێکی ڕەزامەندانە.

ج _ ئەگەر پەشیمان بوونەوە لە خوازبێنیەکە زیانی ماددی یان مەعنەوی لێکەوتەوە. . ئەوە ئەو کەسەی بۆتە هۆی زیانەکە قەرەبووی ئەوی دی دەکاتەوە لەسەر بنەمای بەرپرسیارێتی کەمتەرخەمی.

د _ ئەوەی وەك مارەیی وەرگیراوە پێویستە بگەڕێتەوە لە هەموو کاتەکاندا ، چونکە لە ئاسەوارەکانی پرۆسەی هاوسەر گیری یە ، ئەگەر خواز بێنیکراوەکە کەلوپەلی زەماوەنی پێ کڕی بێت. . ئەوا دەبێت ئەو پارانە بگێڕێتەوە ئەگەر پەشیمان بوونەوە لە لایەن ئەوەوە بوو ، ئەگینا سەرپشك دەکرێت لە گەڕاندنەوەی پارەکەدا یان ئەو شتانەی بە پارەکە کڕیویەتی.

# باسی سێیەم:
# پەیوەندی نێوان لۆجیکی زمانی و لۆجیکی یاسایی لە ناوەکاندا

**ناو:** بریتی یە لە وشەی دانراو بۆ واتایەکی سەربەخۆ کە لە ڕووی خودەوە پەیوەندی بە یەکێك لە سێ کاتەکەوە نیە (ڕابردوو ، ئێستا ، داهاتوو) . لە ڕووی بابەتەوە دابەش دەبێت بۆ تایبەت (الخاص) و گشتی (العام) و هاوبەش (مشترك) . لە ڕووی بەکارهێنانەوە بۆ ڕاستینە (الحقیقة) و خوازە (المجاز) ، وە لە ڕووی ئاشکرایی یەوە بۆ ڕاشکاو (الصریح) و ناڕاشکاو (الکنایة) ، بەڵگەی ئەم جۆرە دابەش بوونەش ئەوەیە: ئەگەر وشەکە بۆ یەك مانا دانرابوو ، جا ئەگەر هەموو ئەو واتایانەی گرتەوە بە نۆبە و یەك لە دوای یەك. . ئەوە تایبەتە ، ئەگەر بە یەکجار واتاکانی گرتەوە گشتی یە ، وە ئەگەر بۆ زیاتر لە واتایەك دانرابوو. . ئەوا هاوبەشە ، وە ئەگەر لە ماناکەی خۆیدا کە بۆی دانرابوو بەکار هێنرا ئەوە ڕاستینەیە (حقیقة) ، ئەگینا خوازەیە (مجاز) ، وە ئەگەر مەبەستەکەی ڕوون و دیاربوو. . ئەوا ڕاستەوخۆ ئەگینا ناڕاستەوخۆیە (کنایة) . دانان (الوضع) : دانانی شتێکە بۆ نیشاندانی مانا ، ئیتر ئەو شتە وشە بێت یان شتێکی تر ، ئەم دانانەش سیفەتی دانەرە کەیە و دەدرێتە پاڵی ، ئەوجا دانانەکە زمانیە ئەگەر دانەرەکە لە زانایانی زمانەوانی بوو ، وە شەرعیە ئەگەر دانەرەکە لە زانایانی شەرع بوو ، وە یاسایی یە ئەگەر دانەرەکە لە شارەزایانی یاسابوو. . هەر بەو شێوەیە. بەکارهێنان: دەربڕینی وشەکە بە ویستی واتایەك ، ئیتر واتاکە ڕاستینەیی بێت یاخود خوازەیی ، ئەم بە کارهێنانە سیفەتی قسەکەرە.

**هەڵگرتن:** بڕینی وشەیە بەسەر مانادا بە گوێرەی گومان ئیتر لەگەڵ واقیعدا پڕاوپڕبێت یان نا ، ئەمەش سیفەتی دوێنراوە.

## یەکەم : تایبەت و حوکمەکەی.

**تایبەت:** بریتی یە لە وشەیەك کە دانراوە بۆ مانایەکی دیاری کراوی تەنها ، جیاوازی نیە کە ئەو تاکە یەك تەنها بێت بە ڕەگەز یان بە جۆر یان بە تاقم یان بەکەس.

**أ _ یەك بە ڕەگەز (الواحد بالجنس)** : وشەیەکە دانراوە بۆ یەك چیەتی هاوبەشی لە نێوان ئەو جۆرانەی کە دەکەونە ژێریەوە وەك (تاوان) کە لە شەرع و یاسادا دانراوە بۆ قەدەغەکراوێك لە کردار یان گوفتار یان نەکردنی داوا کراوێك ، وە هەموو جۆرەکانی تاوان دەچنە ژێر ئەم وشەیەوە ، و هەموو دانەیەکیشیان دەگرێتەوە بە نۆبە.

**ب_ یەك بەجۆر (الواحد بالنوع)** : وشەیەك کە دانراوە بۆ چیەتێکی هاوبەش لە نێوان ئەو جۆرانەدا دەچنە ژێریەوە لە جۆرەکان وەك کوشتن ، کە لەڕووی شەرع و یاساوە دانراوە بۆ دەرکردنی گیانی مرۆڤ ، ئەویش هەموو جۆرەکانی کوشتن دەگرێتەوە یەك لە دوای یەك.

**ج_ یەك بە پۆل (الواحد بالصنف)** : دانراوە بۆ چیەتێکی هاوبەش لە نێوان ئەو کەسانەدا کە دەکەونە ژێریەوە و هەموویان دەگرێتەوە یەك لە دوای یەك وەك کوشتنی هەڵە ، کە دەرکردنی گیانی مرۆڤێکە بەبێ مەبەستبوونی کار و ئەنجام.

**د_ یەك بە کەس:** وشەیەکە دانراوە بۆ چیەتێکی دیاریکراو لە خودی خۆیدا وەك کوشتنی کەسێکی دیاریکراو.

**حوکمی تایبەت:** پێویستە دادوەر پابەندبێت بە ڕواڵەتی دەقی تایبەت و حوکمی خواستەکەی ، بەهۆی ئەوەی دەلالەت کردنی دەقەکە لەسەر حوکمەکە براوەیە ، هەموو براوەیەکیش لەڕووی دەلالەتەوە بواری ئیجتیهاد کردنی تێدا نیە ، ئەمەش مەبەستە لە ماددەی دووی یاسای مەدەنی عێراقی ئێستادا: (بواری ئیجتیهاد نیە لە بابەتێکدا کە دەقی لەسەر بێت (لا مساغ للإجتهاد في مورد النص) . مەبەست هەموو دەقێکی یاسایی لە ماددە یاساییەکان نیە ، لەبەر ئەوەی دەلالەت کردنی هەندێك ماددە لەسەر حوکمە مەبەستەکانیان بۆ یاسادانەر گومانیە یان نادیارە و پێویستی بە ئیجتیهاد هەیە بۆ دیاری کردنی حوکمی مەبەست.

## دووەم: گشتی و حوکمەکەی

**گشتی**: دانراوە بۆ چیەتیەکی هاوبەش لە نێوان تاکەکاندا (المفردات) بە جۆرێك کە بە یەکجار هەموویان دەگرێتەوە ، بەمەش گشتی (العام) لە تایبەت (الخاص) جیادەبێتەوە ، گشتی لە ڕووی سەرچاوەی گشتی بوونیەوە یان زمانی یە (لغوي) یان عورفیە یان عەقڵیە (عقلية) .

أ_ **گشتی زمانی (العام اللغوي)** : وشەیەکە زانایانی زمانەوانی دایانناوە بۆ گشتییەتی و شەرع و یاساش وەریانگرتووە ، وەك وشەی (الجرائم) تاوانەکان لە ماددەی شەشەم لە یاسای سزادانی عێراقی ئێستادا هاتووە: (بڕیارەکانی ئەم یاسایە جێبەجێ دەبێت بەسەر ئەو هەموو تاوانانەدا (الجرائم) کە لە عێراقدا ئەنجام دەدرێت) ، ئەم وشەی (الجرائم) ە کۆیەکە و (أل) ی (الإستغراق) ی پێوەیە و هەموو کۆیەك ئاوابێت مانای گشتی بوون دەگەیەنێت لە لۆجیکی زمانیدا.

ب_ **گشتی عورفی (العام العرفي)** : وشەیەکە زانایانی شەرع یان یاسا بەکاریان هێناوە بۆ واتایەکی گشتی ، سەرەڕای تایبەتی بوونی مانا زمانیەکەی وەك وشەی (أكل) ، مانا زمانەوانیەکەی دیار و ئاشکرایە ، قورئانی پیرۆز بەکاری هێناوە بە واتای: هەموو ئەو زیادەڕۆیی و سنوور بەزاندنە ناڕەوایانە بەرانبەر ماڵ و سامانی خەڵکی دەکرێت بەناڕەوا ، خوای گەورە فەرمویەتی: (ولا تأكلوا أموالكم بينكم بالباطل) [1] واتە: ماڵ و سامانتان لە نێوان خۆتاندا بە ناڕەوا و لە ڕێگەی پووچەوە مەخۆن.

ج_ **گشتی عەقڵی (العام العقلي)** : بریتی یە لە هەموو دەقێك کە بە ڕاشکاوی و بێ پێچ و پەنا هۆکاری حوکمێك نیشان بدات ، بێگومان زانایانی ئیسلامی یەك ڕان لەسەر ئەوە کە حوکم دەسوڕێتەوە لەگەڵ هۆکاری ئاشکرادا لەبوون و نەبوون دا ، هەروەك لەم ئایەتەدا هاتوە: (يسألونك عن الخمر والميسر قل فيهما إثم كبير و منافع للناس وإثمهما أكبر من نفعهما) [2] واتە: پرسیارت لێدەکەن دەربارەی مەی (ئارەق) و قومار ، بڵێ زیانێکی گەورە لە ئەنجامدانیاندا هەیە و لەگەڵ ئەوەشدا سودیان تیایە بۆ خەڵك ، زیانەکەشیان گەورە تر و

---

[1]. سورة البقرة : ١٨٨

[2]. سورة البقرة : ٢١٩

قورسترە لە سودەکەیان. وشەی (إثم) مانای: زیانە ، بەو بەلگەیەی لە بەرامبەر وشەی (نفع) دا هێنراوە ، ئەم دەقە قورئانیە بەبێ دوودڵی نیشانی دەدات کە هەر شتێك زیانەکەی زۆر تر بێت لە سودەکەی حوکمەکەی هەمان حوکمی ئارەق و قومارکردنە ، کە ئەویش یاساغ بوونە وەك جگەرەکێشان ، بێگومان زانا پسپۆڕ و پزیشکە گەورەکان سەلماندویانە کە زیانی جگەرەکێشان زۆر ترە لە سودەکەی ، لە بیروباوەڕی ئێمەدا زیانی زیاترە لە بەکارهێنانی ماددە سەرخۆشکەرەکان و یاری قومار ، چونکە جگەرە کێشان ژینگە پیس دەکات و زیانەکەی دەگوێزرێتەوە بۆ کەسانی دەوروبەری ، ڕای لێکۆڵەران و پسپۆڕان لەم بابەتەدا ئەوەیە: کە هەرکەس لە ژوورێکدا چل جگەرە بکێشێت. . کەمنداڵێکی شیرە خۆرە لەو ژوورەدا هەبێت وەك ئەوەوایە کە ئەو منداڵە (١٠) جگەرەی کێشابێت لە کاتێکا کە زیانی ئارەق خواردنەوە و یاری قومار تەنها بۆ ئەنجامدەرەکەیەتی لەلایەنی تەندورستیەوە ، کەوابوو پێویستە هیچ گومانێك لای عاقڵان نەمێنێتەوە لە یاساغ بوونی جگەرە کێشاندا بە پێی دەقی قورئانی پیرۆز.

حوکمی گشتی ( حکم العام )

دەلالەت کردنی دەقی گشتی لەسەر ئەو حوکمەکەی تێیدا هاتووە. . هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە دەچنە ژێریەوە بەڵام نەك لە هەموو دەقێکی گشتی دا کە تایبەت کردن هەڵگبرێت ، لەبەر ئەمە جەماوەری زانایانی زانستی (أصول الفقه) دەڵێن: پێویستە لەسەر دادوەر لەم دۆخەدا بگەڕێت بە دوای تایبەتکەردا پێش جێبەجێ کردنی دەقە گشتی یەکە. بەڵام لای ئێمە: پێویستە دادوەر بەمانای گشتی دەقەکە کار بکات مادام تایبەت کردنی نەسەلمابێت ، وەك چۆن ڕەها بەڕەهایی بەکار دەهێنرێت و لە سەر ڕەهایی خۆی دەمێنێتەوە مادام بەستنەوەی نەسەلمابێت.

## سێ یەم: ڕاستی و خوازە[1]

أ_ **ڕاستینەیی (الحقیقة)** : وشەیەکە بەکارهێنراوە لەو مانایەیدا کەبۆی دانراوە لەو زاراوەدا کە قسەی پێ دەکرێت. **حوکمەکەی**: پێویستە لەسەر دادوەر کار بکات بە مانای ڕاستینەیی دەقەکە بەمەرجێك پێچەوانەی ئەوە نەسەلمابێت.

ب_ **خوازە (المجاز)** : وشەیەکە بەکار هێنراوە لە جگە لەو واتایەیدا کە بۆی دانراوە لە زاراوەیەکدا کەقسەی پێدەکرێت ، لەبەر پەیوەندیەك کە لە نێوان مانا ڕاستین و خوازەیی یەکەدا هەیە.

**حوکمەکەی**: ئەوەیە کە واتا خوازەیی یەکە بەکار ناهێنرێت مەگەر لە کاتێکدا نەتوانرێت واتا ڕاستینەکە وەربگیرێت. پێویستە لەسەر دادوەر مانای ڕاستینی دەقەکە وەرگرێت ، ئەگەر ئەمە نەکرا. . ئەوا ئیش دەکات بە واتا خوازەیی یەکە ، کەوابوو هەرکەس وەسیەتی کرد بۆ برازاکانی و خۆی منداڵی نەبوو بەلام منداڵی منداڵی هەبوو. . ئەوا وەسیەتەکە بۆ ئەوانە ، چونکە ئیش پێکردنی قسە شیاوترە لە پشت گوێ خستنی.

گرێبەست ڕاستینەیە لە هەموو کار و هەڵسوکەوتێکدا کەپێك دێت لە بەیەك گەشتنی دوو ویستدا بەهۆی پێشنیار و قبوڵکردنەوە ، ئەگەر هەموو پایە و مەرجەکانی هاتنەدی ، وە ئەگەر پایەیەك لە پایەکانی نەهاتە دی. . ئەوا گرێبەستەکە بەتاڵە ، لەو کاتەدا ناتوانرێت وشەی گرێبەستی ڕاستینەیی بەسەردا ببڕدرێت. لەبەر ئەوە واتای خوازەیی بەکار دەهێنرێت بۆی ، ئەوەش نزیکترین هەڵسوکەوتە کە پێکهێنەرەکانی لە گرێبەستە بەتاڵەکەدا هاتبنە جێ ئەگەر ویستی هەردوو گرێبەست کارەکەی لەسەر بێت ئەگەر بە بەتاڵی هەڵسوکەوتە ئەسڵی یەکەیان زانی ، ئەوەش بە پێی ئەم دوو ڕێسا بەناوبانگە: (اذا تعذرت الحقیقة یصارُ الی المجان) : (ئەگەر نەدەکرا واتای ڕاستەقینە ئیشی پێبکرێت. . ئەوا پەنا دەبرێتە بەر واتای خوازەیی) . وە (إعمال الکلام أولی من إهماله) :[2] (کارکردن بە قسە

---

[1]. البرهان فی المنطق للکلنبوی ل ٢٤ و پاش ئەو.

[2]. مجلة الاحکام العدلیة ماددەی ٦٠

شیاوتره له پشت گوێ خستنی)[1] لەمەوە کە باسمان کرد دەگەینـه ئـەو دەرەنجامـه کـه:
پێکهێنەرەکانی تیۆری گۆڕانی گرێبەست سێ شته ، که بریتین له:

١_ دەبێت گرێبەسته ئەسڵیەکه بەتاڵ بێت ، جا ئەگەر گرێبەستەکه دروست بوو. . ئەوا هیچ پێویست به گۆڕینی گرێبەستەکه ناکات.

٢_ دەبێت هەموو پێکهێنەرەکانی هەڵسوکەوته بـۆ چـووەکه لـه گرێبەسـته بەتاڵەکـەدا بێته جێ ، جا ئەگەر پێکهێنەرێکی تازەی پـێ زیاد کرا. . ئـەوا گواسـتنەوەی پـێ نـاوترێ ، بەڵکو ڕاستکردنەوەی گرێبەستەکەیه ، بۆ نمونه ئەگەر کەسێك له کۆگایەکـدا شـتێکی کـڕی وای زانی شوێنەواریه پاشان بۆی دەرکەوت که وانیه ، ئەگەر خاوەن کۆگاکـه شـتێکی دایـه که کڕیار له شته ئاسەواریەکه به تەمای بوو ، ئـەویش وەریگـرت. . ئـەوا ئـەم کـاره ڕاسـت کردنەوەی گرێبەستەکەیه و گواستنەوه نیه بەهۆی زیادکردنی پێکهێنەره نوێیەکەوه.

٣_ دەبێت ویستی هـەردوو گرێبەسـت کارەکـه لەسـەر هەڵسـوکەوته نوێکـەبێت ئەگـەر زانیان گرێبەسته ئەسڵیەکه پوچه ، به پێـی ئـەم مەرجـەش ئەگـەر قـەرزار چـەکێکی دایـه خاوەن قەرزەکـه کـه مەرجـه یاسـایی یـەکانی تێدا نـەبوو. . ئـەوا بەتاڵـه ، بـەڵام دەبێتـه قەواڵەیەکی یاسایی ئەگەر لەمەو پێش ئەم قەواڵەیەی نـەدابێتێ ، ئـەگینا ناگۆڕدرێـت لەبـەر نەبوونی مەرجی سێ یەم. پاش ئەم خستنه ڕووه کورته بۆمان ڕوون دەبێتەوه کـه تیـۆری (گۆڕینی گرێبەسـت) شـەریعەتی ئیسـلامی پـێش یاسـا ناسـیویەتی بەبنـەما و جـێ بـەجێ کاریەکانیەوه. لەو جێ بەجێ کاریەکانیەش:

أ_ هەر کەس گفتی دا بەکەسێك که پەیوەندی پێوەی نەبوو له ڕێگەی ژن و ژنخوازی یا خزمایەتیەوه تا ببێتـه مـیرات بـەری پـاش مردنـی. . ئـەم پەیمانـه بەتاڵـه و بـه وەسـیەت دەدرێته قەڵەم.

ب_ دەستەبەری بەمـەرجی بێتـاوانی دەسـتەبەرکەرەکه بەتاڵـه و بـه حەواڵـه دەدرێتـه قەڵەم. حەواڵەش بەمەرجی بێتاوان نەبوونی حەواڵه کەرەکه بەتاڵه و دەگۆڕێـت بـۆ دەسـته بەری ، بێگومان یاسای شارستانی ئەردەنی مادده (٩٥٨) ئەم ڕێچکه فیقهی یه ئیسلامیەی وەرگرتوه ، هەروەها یاسای شارستانی ئیماراتی ماددەی (١٠٦٥) ، بەهۆی ئەوەوه قسـەی

---

[1]. مجلة الاحكام العدلية ، مادده ی ٦٢

هەندێك لە زانایانی یاسا[1] ڕاست نیە کە دەڵێن: تیۆری (گۆڕانی گرێبەست) یاسا زانەکانی ئەڵمانیا لە سەدەی نۆزدەهەمدا دایان ڕێژاوە ، بەمەرجێك مەبەستیان بەو قسەیە لایەنی ڕێك خستن نەبێت ، لەبەر ئەوەی بناغەی بیرۆکەکە هەبووە لە فیقهی ئیسلامیدا پێش یاسا بە سەدان ساڵ. شایانی باسیشە کە خوازە هەروەك دەبێتە سیفەتی وشەکان ، بە هەمان شێوە هەندێجار دەبێتە بەشێك لە سیفەتەکانی دانەپاڵی شتێك بۆ لای شتێکی تر و پێی دەوترێت خوازەی عەقڵی (المجاز العقلی) ، کە پێناسە دەکرێت بە: دانە پاڵی شتێکە بۆ لای شتێکی تر کە لە ڕاستیدا نابێت بدرێتە پاڵی ، وەك دانە پاڵی پرۆژە گشتی یەکان لە وڵاتانی جیهاندا بۆ لای سەرۆکی ئەو وڵاتانە ، بە دانە پاڵێکی خوازەیی عەقڵی ، چونکە ئەنجامدەرانی پرۆژەکان لە ڕاستیدا بەڵێندەر و کرێکارەکانن ، دانە پاڵی ئەم پرۆژانە بۆ لای سەرۆکەکان لەو ڕووەوەیە کە بە فەرمانی سەرۆکەکان ئەنجامدراون. وە خوازەی عەقڵیش بریتی یە لە: بناغەی لۆژیکی بۆ بەر پرسیارێتی کەسە مەعنەویەکان لە دەوڵەت و جگەدەوڵەت. یاسا دانانە نوێکان دانیان ناوە بە پابەندبوونی شارستانیدا بۆ کەسی مەعنەوی بەهۆی زەرورەتی کرداریەوە بۆ ئاسانکردنی بەدیهێنانی بەرژەوەندیە گشتی یەکان یان تایبەتیەکان ، لە ڕووی شارستانیەوە ڕەوایە کەسی مەعنەوی شاسیتەی ماف و پابەندەکان بێت ، لەبەر ئەمە دەگونجێت داواکار و داوا لەسەر تۆمار کراویش بێت ، بەلام هەڵسوکەوتەکانی خۆی ئەنجامیان نادات ، چونکە کەسایەتیەکی بەرجەستە و واقیعی نیە ، بەڵکو لە ڕێگەی کەسانێکەوە ئەنجامیان دەدات کە نوێنەرایەتی دەکەن ، بەلام لە ڕووی بەرپرسیاریەتی تاوانکاریەوە بیرۆکەکە دوو کێشەی لەسەرە:

١_ ئاراستەی یەکەم: ڕێچکەی ڕەتکردنەوە و دان نەنان بە پابەندبوونی تاوانکاری بۆ کەسی مەعنەوی لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە:

١_ بێگومان ویستی سەربەستی تێگەیشتو بنەمای بەرپرسیاریەتی تاوانکاریە ، کەسی مەعنەوی تەنها خەیاڵ و ئەندێشەیە و هیچ بونێکی لە واقیعدا نیە تا ئەم ویستەی هەبێت ، کەواتە ئەگەر ئەم بناغەیە نەبوو ئەوا ئەوەشی لەسەری بنیات دەنرێت نابێت.

[1]. کالاستاذ الدکتور السهضوری مصادر الحق ب ٤ ل ١٠٠

٢_ کەسی مەعنەوی ناگونجێت سزا بڕیاردراوەکانی بەسەردا جێبەجێ بکرێت کە لە یاسای سزاکاندا هەیە وەك لە سێدارەدان و سزای ئازادی زەوتکەر وەك (زینداني کردن و گرتن و وێنەی ئەوە) .

٣_ لە ڕووی تاوانکاریەوە کەسی مەعنەوی پابەند دەکرێت ، سزا دارایەکانی بەسەردا جێبەجێ بکرێت ، سنوردارکردنی چالاکیەکانی نەگونجاوە لەگەڵ بنەمای کەسیەتی تاوان و سزادا ، چونکە ئەو سزایانە لە واقیعدا دەسەپێنرێت بە سەر کەسانێك دا کە نوێنەرایەتی کەسی مەعنەوی دەکەن[1] .

**ڕێچکەی دووەم**: بەرپرسیاریەتی تاوانکاری ڕوودەکاتە کەسی مەعنەوی ، وە ئەنجامی تاوانەکان دەخرێتە ئەستۆیەوە کە لەلایەن ئەو کەسانەوە ئەنجام دەدرێن کە نوێنەرایەتی ئەو دەکەن ، پشتیوانانی ئەم ڕایە هیچ بەڵگەیەکیان نیە کە لەبەرچاوبگیرێت جگە لەبەر پەرچ دانەوەیان بۆ بەڵگەی ئەو کەسانەی کە ئەم ڕێچکە ڕەت دەدەنەوە ، کە وتویانە: (کەسی مەعنەوی تەنها خەیاڵێك نیە و بەس ، بەڵکو ڕاستیەکە و بوونی خۆی هەیە و خاوەنی ئەستۆیەکی دارایی یە ، مافی هەیە و ئەرکی لە سەرشانە هەروەك ویستێکی تایبەتی سەر بەخۆی لە بری ئەندامەکانی هەیە ، ویستی ئەو بریتی یە لە کۆڕاکانی ئەندامەکانی یان نوێنەرەکانی .

٢_ ئەو قسەیەی کە دەڵێت: تاوان لەو مەبەستەوە سەرچاوە دەگرێت کە کەسە مەعنەویەکی بۆ تایبەت کراوە بەرپەرچ دەدرێتەوە بەوەی کە: کەسی سروشتی بە هەمان شێوە دروست نەکراوە بۆ ئەوەی تاوان بکات ، سەرەڕای ئەوەش لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت و پاشان سزا دەدرێت .

٣_ ناکرێت سزاکان کە دانراون لە بەرامبەر تاوانەکانی کەسی سروشتیدا جێبەجێ بکرێت بەسەر کەسی مەعنەویدا ، ئەم قسەیەش نەسەلمێنراوە ، چونکە هەرچیەك لەوێدا هەیە جیاوازی بوونە لە سروشتی سزاکەدا ، کە وابوو لەناوبردنی کەسی مەعنەوی هەڵوەشاندنەوەیەتی و پەکخستنی کارەکەیەتی بۆ ماوەیەکی دیاری کراو و وێنەی ئەوە. . .

---

[1]. القلي الدكتور محمد مصطفى في المسؤلية الجنائية ل ٧٧ پاش ئەو

٤_ وتراوە کە سزاکە کەسی یە و پێویستە تەنها تاوانبارەکەی پێی ئازار بدرێت ، ئەم بۆچوونەش بەرپەرچ دەدرێتەوە بەوەی: هەر سزایەك کە جێبەجێ دەکرێت بەسەر کەسی سروشتیدا. . لە پاشیەوە کەسانی تر زیان دەبینن وەك هاوسەرەکەی یان منداڵەکانی یان خزم و کۆمەڵگاکەی. لەگەڵ ڕێزمان بۆ لایەنگر و پشتیوانانی دانەپاڵی بەرپرسیاریەتی تاوانکاری بۆ لای کەسی مەعنەوی ، بێگومان بەڵگەکانیان لاوازە و زیاتر لە سەفسەتەوە نزیکترە. هەموو بابەتێکی تاوانکاری بۆ کەسی مەعنەوی ، تەنها لەسەر خوازەی عەقڵی بنیات نراوە ، ئەگینا لەلایەنی ڕاستەقینەیی و واقیعیەوە ڕەت دەکرێتەوە ، چونکە نیشانگەی ئەم بەرپرسیارێتی یە تەنها عەقڵ و توانست و شیانی تاوانکاری تەواوە ، ئەبوایە بوترێت کەسی مەعنەوی بەرپرسە و سزادەدرێت وەك سەرۆکی وڵات.

## چوارەم: ڕاشکاو و ناڕاشکاو (الکنایة)

أ_ **ڕاشکاو (الصریح)** : هەموو وشەیەکە کە واتاکەی ئاشکرا بێت و مەبەستەکەی ڕوون بێت .

**حوکمەکەی**: بریتی یە لە: ئیش کردن بە گوێرەی مەبەستەکەی ، مادەم بەڵگەیەك نەبێت بە پێچەوانەی ئەوەوە.

**ب_ ناڕاشکاو (الکنایة)** : پێچەوانەی ڕاشکاوە و مانا گەیاندنەکەی ڕوون نیە.
**حوکمەکەی**: وەرگرتنی نیاز و ویستی نادیارە.

**ڕاشکاو و ناڕاشکاو دوو بنەمای لۆژیکین بۆ ڕەچاوکردنی ویستی دیار و نادیار**: کەواتە ئەگەر دەربڕینەکە ڕاشکاو بوو ئیتر گرێبەست بوو یان ویستێکی تاکە کەسی. . لەسەر دادوەرەکە پێویستە تەماشای ویستە دیارەکە بکات و نابێت پێچەوانەکەی وەرگرێت لەبەر ویستە شاراوەکەی مەگەر بە بەڵگەیەکی ڕازیکەر و پەسەند ، جا ئەگەر کەسێك وتی بە خێزانەکەی: تەلاقت کەوتبێت. . پاشان وتی: مەبەستم جیابونەوەی ژن و مێردایەتی نەبووە. . ئەوا ئەم داوایەی لێوەر ناگیرێت لە دادگادا تاکو بەڵگەیەکی دەرەکی پشتیوانی قسەکەی نەکات. وە ئەگەر دەربڕینەکە ناڕاشکاو بوو ئەوا پێویستە ویستە شاراوەکە وەربگریت و ویستی خاوەن دەربڕینەکە لەبەر چاو بگیرێت مادەم بەڵگەیەك بە پێچەوانەیەوە نەبێت ، کە وابوو هەرکەس وتی بە هاوسەرەکەی: بڕۆرەوە بۆ ماڵی باوکت. .

پاشان وتی: مەبەستم بەم قسانە تەلاق نەبووە ، پێویستە داواکەی وەربگیرێت ، مادەم بەڵگەیەك بە پێچەوانەیەوە نەبێت. وەرگرتنی ئەم بنەما لۆجیکیە شەرعزانانەتر و وردتر و ڕاست ترە لەو دوو ڕێچکە و ئاراستە ڕەهایەی یاساکاری یە لاتینی و ئەڵمانیەکان لە بابەتی وەرگرتنی ویستی دیار یان ویستی شاراوەدا هەیانە. بێ گومان یاسای لاتینی و ئەو یاسایانەش لە ژێر کاریگەری ئەودان کە پێیان وایە: دەبێت ویستی شاراوە بخرێتە پێش ویستی ئاشکراوە بەڕەهایی لەکاتی دژبەیەك بوویاندا جا ئیتر دەر بڕینەکە ئاشکرا بێت یا نائاشکرا. کەچی یاسای ئەڵمانی و ئەو یاسایانەش کە کاریگەری ئەو یاسایەیان لەسەرە پێیان وایە ویستی دیار و ئاشکرا بە ڕەهایی دەخرێتە پێشەوە ، بە چاوپۆشی لەوەی کە دەربڕینەکە ڕاشکاو بێت یان ناڕاشکاو.[1]

لەبەر ئەوە پێمان وایە دەبێت لۆجیکی یاسایی وەربگرین ، چونکە پێویستە جیاوازی بکرێت لە نێوان دۆخی ڕاشکاوی و ناڕاشکاوی دا لە خستنە پێشی یەکێك لەو دوو ویستە بەسەر ئەوی تردا.

کورتەی بەش:

پەیوەندی نێوان لۆژیکی زمانی و لۆژیکی یاسایی لە پیتەکانی واتادا ، و ئەندازەی کاریگەریان لە ڕاڤەی دەقە یاساییەکاندا ، و جیاوازی بڕیارەکان بە هۆی جیاوازی ئەو مانایانەوە دەبێت.

پەیوەندی نێوان دوو لۆژیکی زمانی و یاسایی لە کارەکاندا.

---

[1]. مصادر الحق للسنهوری ب ٥ ل ١٠ ، لە فەرهەنگی لسان العرب بەندی قاف پیتی ئا ج ٢٠ ل٤٧ قضى : القضاء : بڕیار . زوهری فەرموویەتی وشەی (القضاء) لە زماندا چەند واتایەکی هەیە هەمو دەگەڕێنەوە بۆ واتای (بڕانەوەی شت و تەواو بونی) هەر چیەك بە تۆکمەیی بکرێت و تەواو ئەنجام بدرێت یان بە جێ بهێنرێت یان بە واتای بە پێویستی گێڕا یان جێ بە جێ ی کرد یان بڕیاری داو واژوی لە سەر کرد ، هەمو ئەم واتایانە لە فەرمو دەدا هاتون لەولنە قەزایەك قەدەری لە گەڵدا بێت ، مەبەست بەوشەی ( قدر) ئەندازە دانان و مەبەستیش لە وشەی ( القضاء) دروست کردنە (فقضاهن سبع سموات ) واتە: دروستی کردون ، کەوا (القضاء_ قدر) پەیوەستی یەکترن (یەکێکیان لەوی تریان جیا نابێتەوە چونکە یەکێکیان وەك بناغە ولیە کە ئەویش ) (قدر) ئەوی تر کە قضایە وە دیوار وایە هەر کەسێك بیەوێت جیا یان بکاتەوە ئەوا ویستویەتی بیناو دیوارەکە بڕوخێنێ و هەڵتە کێنێت .

دەربڕینی وشەکان بە کاری ڕابردوو دەبێت بەڵام دەربڕین بە هۆی کاری ڕانەبردووەوە پەیماندانە بە گرێبەست کردن. گرنگترین پێکهێنەر و ئاساوارەکانی پەیمان بەگرێبەست کردن لە گرێبەستە دارایی و نا داراییەکاندا.

پەیوەندی نێوان لۆژیکی زمانی و لۆژیکی یاسایی لە ناوەکاندا.

دەقی تایبەت و حوکمەکەی ، دەقی گشتی و حوکمەکەی.

پەیوەندی لۆژیکی لە نێوان مانای ڕاستەقینە و خوازەدا ، وە لە نێوان تیۆری گواستنەوەی گرێبەست.

خوازەی عەقڵی بناغەیەکی لۆجیکی یە بۆ دانە پاڵی بەرپرسیارێتی بۆ لای کەسی مەعنەوی. ڕاشکاو و ناڕاشکاو دوو بناغەی لۆژیکین بۆ لەبەرچاوگرتنی ویستی دیار یان شاراوە.

# بەندی سێ یەم

# بنەماکانی وێناکردنە لۆژیکیەکان و پەیوەندییان بەیاساوە

کاتێك لێکۆڵەری زانستی بابەتێك هەڵدەبژێرێت بۆ تۆژینەوەکەی لە پێناو باسکردنی لایەنەکانی دا. . بێگومان سەرکەوتن و شکست خواردنی لە ئامادەکردنی باسێکی تۆکمەدا کە ئامانجەکانی پێکابێت بەندە بە ئەندازەی ڕەچاوکردنی یاساکانی لۆژیك ، چونکە ئەم یاسایە تاکە سەرچاوەیەکە یارمەتی دەدات لە بیرکردنەوە و ئاشکرایی لە دەربڕین و زنجیرەیی بوونی خستنەڕوودا و دووری دەخاتەوە لە تێکەڵکردن لە نێوان پێکهێنەرەکانی بابەتەکە و حوکمەکانی و لە بەیەکاچوونی بابەتەکانی تۆژینەوەکەی. هەروەك زۆربەی خوێندکارانی خوێندنی باڵا لەکاتی ئامادەکردنی نامەکانی ماستەر و دکتۆرادا دەکەونە ئەو دوو هەڵەوە ، لەبەر ئەوەی لە زانسی لۆژیکدا شارەزانین. کەوابوو لۆژیکی یاسایی ڕێنموونی لێکۆڵەر دەکات بۆ پێش خستنی هەر شتێك کە دەبێت پێش بخرێت تا ببێتە دستپێکێك بۆ ئەو شتەی بەدوای دا دێت ، وە بۆ دواخستنی ئەو شتەی کە پێویستە دوابخرێت ، تا ببێتە تەواوکەری پێش خۆی. وە بنەماکانی وێناکردنە لۆژیکیەکان ئەوەیە خودیەکانی بابەتەکە کە لە (فیقه) و یاسادا بە پایەکان ناوزەد دەکرێت وە چیەتی بابەت پێکدێنن ، وە لەنێوان ئەو وارسانەدا کە پێیان دەوترێت حوکمەکان (ئاسەوارەکان) . وە خودیەکان (الذاتیات) و

وارسی یەكان (العرضیات) هەیانە هاوبەشە و هەشیانە جیایە ، كەواتە چیەتی هەموو بابەتێك لە خودیە هاویەش و جیاكەرەوەكان پێك دێت و لەكاتی نەبوونی خودیە جیاكەرەوەكان وارسە تایبەتەكان جێگەیان دەگرنەوە. وە جیاكەرەوە خودی و وارسی یەكان دەبنە هۆی ئەوەی كە لێكۆڵینەوەی بابەتی باسەكە كۆكەرەوە و گشتگیر بێت بۆ هەر شتێك دەكەوێتە ژێر ئەو ناو نیشانەوە و ڕێگر بێت لە هێنانە ناوەوەی هەر شتێك كە پەیوەندی بەبابەتەكەوە نەبێت. وە چەمكە هەمەكیەكانیش (المفاهیم الكلیة) لەو زاراوانەوە وەردەگیرێن كە نیشانیان دەدەن ، چەمكەكانیش چ خودی بن چ وارسی ، هەندێكیان دوورن لە هەندێكیانەوە ، هەیانە نزیكن لە یەكتریەوە بەڵكو یەكسانن. ئەمە وامان لێدەكات كە لێكۆڵینەوەی بەندی سێ یەم لە لۆجیك بكەینە سێ باسگەوە:

یەكەم : تایبەت دەكرێت بە مانا جۆراو جۆرەكانی دەقەكانەوە

دووەم : بۆ سروشتی چەمكە هەمەكیەكان

سێ یەم : بۆ هاوسەنگی لە نێوان زاراوەكاندا لە ڕووی چەمك و بەرجەستەبوونەوە

# باسی یەکەم:
# ڕووەکانی ماناک دەقەکان

**الدلالة: (نیشـانە)** : بوونی شتە لە حاڵێکدا کە بەزانینی ئـەو دۆخـە شـتێکی تـری پـێ دەزانرێـت ، یەکـەم پێـی دەوترێـت: نیشـاندەر (الـدال) ، و دووەم: نیشـاندراو (مـدلول) ، هەردووکیشیان پابەندن بەیەکەوە و بناغەی ئەم بەیەکەوە بەسترانە. . دانانە لـە دەلالـەتی دانانیدا ، سروشتە لە مانا نیشاندانی سروشتیدا ، هۆکاری و بەرهۆکاری یە لە مانا نیشاندانی عەقڵیدا.

## بەشەکانی دەلالەت

مانا گەیانـدن لـە ڕووی سروشـتی مانـا گەیەنەرەکـەوە دابـەش دەکرێـت بـۆ بێـژەیی و نابێژەیی ، لـە ڕووی سروشـتی دۆخـە ناویراوەکـەوە دابـەش دەبێـت بـۆ: دانـانی بابـەتی و سروشتی (طبيعية) و عەقڵی (عقلية) ، وە لەم دوو لایەنەوە بەشەکانی مانا گەیاندن دەبن بە شەش بەشەوە کە ئەمانەی خوارەوەن :

١_ **بێژەیی دانانی (اللفظية الوضعية)** : ئەوەیە کە وشەیەك مانایەك بگەیـەنێت کـە بۆی دانراوە لە زماندا یان لە عورفێکی شەرعی یان یاسایی دا و جگە لە مانە. کەواتە بـەکار هێنانی ئەو وشە بۆ مانـای بنـەڕەتی خـۆی ڕاسـتینەیە و لـە جگـە لـە واتـای خۆیـدا لەبـەر پەیوەندیەك. . ئەوە خوازەیە وەك لە مەوپێش باسمان کرد.

٢_ **بێژەیی سروشتی (اللفظية الطبعية)** : ئەوەیە کە وشـەیەك مانایـەك بگەیـەنێت کە بۆ ئەو واتایە دانە نراوە بەڵام ئەو مانایە دەدات بە دەستەوە بە گوێرەی سروشت ، وەك ناڵانـدنی نـەخۆش یـان تـووش بـوو بـە کارەسـاتێك بەڵگەیـە لەسـەر ئـازارە دەروونـی و جەستەییەکانی.

٣_ **بێژەیی عەقڵی (اللفظية العقلية)** : ئەوەیە وشەیەك مانایەك بگەیەنێت نەك لەسەر بنەمای دانان و سروشت ، بەڵكو لەسەر بنەمای پەیوەندی هۆكار و بەرهۆكاری ، وەك بەڵگەبوونی وشەی بیستراو بە هۆی ئامێری تەلدار و بێ تەلەوە لەسەر بوونی بێژەر و قسەكەرێك كە پەیوەندداره لەگەڵ بیستەرەكەدا لەكاتی قسە لەگەڵ كردندا سەرەڕای دووری ماوە ، هەم وەك بەڵگەبوونی وشە دزەكان و ئاڵۆزەكان لە وەڵامگۆیەكانی تاوانباركراوان یان شایەتەكان لەسەر ڕاستگۆ نەبوونی تاوانبار و ناپاكی شایەتەكان لە دانی شایەتیەكانیان بە شێوەیەكی واقعی ، بەڵام ئەم بەڵگەبوون و ماناگەیاندنە نیشانەیەكی گومانیە و دەگونجێت بۆ سەلماندنی پێچەوانەكەی.

٤_ **ماناگەیاندنی دانانی نابێژەیی (الوضعية غير اللفظية)** : نیشانەكانی هاتوچۆ كە لە ڕێگە و بانە گشتی و ناوخۆكاندا دادەنرێت بۆ ڕێكخستنی هاتوچۆ. . نیشاندانی نمونە و هەڵواسراوە بازرگانیەكان بۆ جۆری بازرگانی و وەك ناونیشانە نوسراوەكان لەسەر تابلۆی كۆگا بازرگانیەكان كە ئەو واتایانە دەگەیەنێت بۆیان دانراون و وێنەی ئەمانەش.

٥_ **ماناگەیاندنی عەقڵی نابێژەیی (العقلية غير اللفظية)** : وەك بەڵگەبوونی ئاسەواردار لەسەر ئاسەوارەكەی وەك بەڵگەبوونی میكرۆبەكانی خوێنی نەخۆش پاش شیكردنەوەی خوێن لەسەر جۆری نەخۆشی ، ئەم جۆرە لە نیشاندان و ماناگەیاندن پزیشكەكان بەكاری دەهێنن لە دەست نیشانكردنی دۆخەكانی نەخۆشی ، وە دیسان لەم جۆر و گروپەیە: مانا گەیاندنی هەموو ئاسەوارداریك بۆ ئاسەوارەكەی ، وە هەر هۆكارێك بۆ بەرهۆكارەكەی ، هە وەك شوێنەواری تاوان بۆ دیاریكردنی تاوانەكە و دەستنیشانكردنی تاوانكار ، ئەم جۆرە لە نیشاندان لێكۆڵەرەكان بەكاری دەهێنن لە لێكۆڵینەوە تاوانكاریەكاندا ، پسپۆڕەكان لە پزیشكی یاسایی و شەرعیدا ، لەم گروپەیە بەڵگە هێنانەوە بە ئاسەواری سەرپەنجەكان یان چەكە ئاگرینەكان یان ئاسەواری پێكان یان ئامێرەكان یان چوارچێوەكان یان شانەكان یان پەڵە خوێنەكان یان شلەی تۆوی یان وێنەی ئەمانە.

٦- **ماناگەیاندنی سروشتی نابێژەیی (الدلالة الطبيعية غير الفظية)** : وەك گۆڕانكارییە فیزیاییەكان لە كەسی تاوانكاردا لەكاتی لێكۆڵینەوە لەگەڵیدا سەبارەت بە تاوانێك كەدراوەتە پاڵی ، هەم وەك خێرا لێدانی دڵی و جێگیرنەبوونی ترپەكانی ، وە گۆڕانی

ڕەنگی ڕوخساری و وێنەی ئەمانە ، بەڵام ئەم نیشانە و هێمایانە بەڵگەی گومانین دەکرێت پێچەوانەی ئەمانەش بسەلمێندرێت.

## بەشەکانی نیشاندانی بێژەیی دانانی

ئەم مانا گەیاندنە لەڕووی مانا گەیەندراودکەوە دەبێتە سێ بەشەوە: (پڕاوپڕی ، لەخۆگری ، نوساوی)

١_ **ماناگەیاندنی پڕاوپڕی یان (واتا گەیاندنی پڕاوپڕ)** : گەیاندنی وشەیەکە بۆ هەموو ئەو مانایەی کە بۆی دانراوە بە جۆرێك کە وشە و واتا پڕاوپڕی یەکترن بێ زیاد و کەم وەك وشەی (قتل) : کوشتن کە پڕاوپڕ واتای دەرکردنی گیان دەگەیەنێت ، کە واتە هەموو وشەیەکی دانراو کە بۆ واتایەکی دیار کراو دانرابێت ، گەیاندنی بۆ واتای پڕاوپڕی ئەو وشەیە. ئەوە واتای پڕاوپڕی پێ دەوترێت ، لەبەر پڕاوپڕبوونی نیشاندەر لەگەڵ نیشاندراو دا.

٢_ **مانا گەیاندنی لەخۆگری**: گەیاندنی وشەیە بۆ بەشێك لە ماناکەی لە ناو کۆی مانای وشەکەدا بە مەرجێك مانا ویستراوەکە بەشێکی بێت. وەك نیشاندانی وتەی گرێبەست بۆ سەرجەم مانای پێشنیار و وەرگرتن پڕاوپڕە ، وە بۆ یەکێکیان لە کۆی هەموو مانای وشەکە لەخۆگرییە.

٣-**مانا گەیاندنی نوساوی**: نیشاندانی وشەیە بۆ لەگەڵ بووی واتاکەی (لازم المعنى) . واتە: گەیاندنی وشە بۆ بڕیارێکی کە لە مانا بۆ دانراوەکەی بەدەرە و لەگەڵ بووی واتا بۆ دانراوەکەشە ، وەك نیشاندانی گرێبەست بۆ هەموو ئەوماف و پابەندیانەی کە لێیەوە بەدی دێن بە گوێرەی شەرع یان یاسا. هەریەك لە نیشاندانی لەخۆگری (تضمينة) پێوە نووساوی ( إلتزامي ) پێویستی دەکەن کە نیشاندانی پڕاوپڕ هەبێت نەك بە پێچەوانەوە ، چونکە هەندێجار نیشاندانی پڕاوپڕ هەیە بێ ئەوەی هیچ کام لەو دووانە هەبن وەك مانایەك کە نەبەشی هەبێت و نە نوساوی واتاکەی. وە شایانی باسە کە هەموو دەقێکی تاوانکاری دوو سزا دەگرێتە خۆی و بەشێوەی پڕاوپڕ نیشانیان دەدات ، یەکێکیان نیشان دەدات وەك بوونێك لە چوارچێوەی مانا پڕاوپڕەکەدا و نیشاندانی پێویستی بوونی ستونەکان و مەرجەکانی تاوان و نەبوونی ڕێگرەکانی بە نیشاندانی مانای نوساو ، بناغەی ئەم پێوە نوسانە ئەو یاسایە کە ئەم پێداویستیانەی دیاری کردووە ، هەروەها واتای دەق لەسەر

هەڵبژاردنی دادوەر . پێویستە لەسەر ڕەچاوكردنی باروبۆخەكانی تاوانكار و تاوانبێت ، بە چەمكی پێوەنوویان دەدرێتە قەڵەم ، بۆ نمونە واتای ماددەی (٤٠٥) لە یاسای سزاكانی عێراقی بەردەست[1] (هەركەسێك كەسێك بە ئەنقەست بكوژێت. . سزای بەندكردنی هەتا هەتایی بەسەردا دەسە پێنرێت ، یان بەندكردنی كاتی) كۆی دوو سزاكە چەمكی پڕاوپڕە و یەكێكیان واتای لەخۆگرییە (تضمني) ، وە سزادان بە بەندكرنی هەتا هەتایی لە دۆخەكاندا دژی گومانلێكراو و بە سزادانی كاتی لە چەند دۆخێكدا كە لە بەرژەوەندی گومانلێكراوە چەمكی نوساوییە (إلتزامي) ، ئەم ڕێسا تاوانكاریە یاساییە بابەتێكی لێكجیایی ڕاستینەی قەدەغەكۆیە (مانعة الجمع) ، كەواتە ناكرێت هەردوو سزاكە پێكەوە كۆبكرێنەوە ، وە هاڵقەدەغە (مناعة الخلو) ، كەوابوو دروست نیە پشت گوێ خستنی هەردوو سزاكە بە مەرجێك بەڵگەیەك نەبێت بە پێچەوانەی ئەوەوە ، نیشاندانی چەمكی دەقەكان بۆ بڕیارەكان دەگەڕێتەوە بۆ ئەم سێ بەشە باسكراوە (**پڕاوپڕبوون ، لەخۆگرتن ، پێوەنووسان** ) . وە دەقە یاسایی و شەرعیەكان حوكمەكان نیشان دەدات لەیەكێك لەم شەش ڕووەی خوارەوەدا:

١_ **باسكراوی ڕاشكاو (المنطوق الصريح)** : حوكمێكە كە وشە و دەستەواژەكانی دەقەكە بە ئاشكرایی و چەمكی پڕاوپڕی دەیگەیەنێت ، وەك دەلالەتی ماددەی (٣/ بەندی ٣٣) [2] : (يُعتبر صغيراً من لم يتم التاسعة من عمرة) : كەسێك نۆ ساڵی تەواو نەكردبێت بە بچوك دا دەنرێت. بەو پێ یە كە تەمەنی جیاكردنەوە لە بابەت و دۆزە تاوانكاریەكاندا. . تەواو كردنی تەمەنی نۆ ساڵی یە.

٢- **ئاماژەی دەق (إشارة النص)** : چەمكێكی عەقڵی پەیوەست بە واتای دەقەوەیە ، كە حوكمی پاشكۆی وتراوی دەقەكە نیشان دەدات و هەروەها واتا لەگەڵ مانا بووەكەی. وەك دەلالەتی ماددەی ٣٧٨ ی بەندی یەكەم لە یاسای سزاكانی عێراقی ئێستا لەسەر ئەوە كە: (لايجوز تحريك دعوى الزاني ضد أي من الزوجين أو إتخاذ أي إجراء فيها إلا بناءً على شكوى الزوج الأخر) : دروست نیە جوڵاندنی داوای زیناكەر دژی هیچ كام لە ژن و مێرد یان

---

[1]. ژمارە ١١١ ی ساڵی ١٩٦٩.

[2]. یاسای چاودێری تازە پێگەشتوان ژ٧٦ ساڵی ١٩٨٣.

گرتنەبەری هیچ رێکارێك تێیدا مەگەر لەسەر سکاڵای هاوسەرەکەی تر بێت. بەو پێیەی کە ناپاکی هاوسەرێتی لەلایەن یەکێك لە ژن و مێردەوە دەست درێژکاری یە بۆ مافی تایبەتی هاوسەرەکەی تر. ئەمەش پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامە کە دەڵێت: زینا بە ڕەهایی لەلایەن یەکێك لە ژن و مێردەوە یان جگە لەوانەوە دەست درێژی کردنە بۆ سەر مافی گشتی و یاسای گشتی و نەریتە گشتی یەکان.[1]

٣_ **ماناگەیاندنی خواست (دلالة الإقتضاء)** : دەلالەتکردنێکی عەقڵی پەیوەستی یە ، نیشانی دەدات کە لەویٚ وشەیەك یان دەستەواژەیەك هەیە کە خواستی چەمکی دەقەکە لەسەر بڕیارە ویستراوە ڕەچاوکراوەکە دەخاتە ڕوو ، وەك دەلالەتی ماددەی (٩٥)[2] (يعتبر يوم صدور الحكم بموت المفقود تأرخا لوفاته) : ڕۆژی بڕیاردانی مردنی ونبوو. . دەبێتە بەرواری کۆچی دوایی کردنی. . نیشانی دەدات کە دەبێت ئەم دەستەواژەیە بۆ ماددەکە زیاد بکرێت (مالم يستند الى تأريخ سابق) بەمەرجێك پشت نەبەستێت بە بەروارێکی ڕابردوو.

٤_ **چەمکی ئامارژەی لاواز (دلالة الإيماء)** : چەمکێکی ئاوەزی پابەندبوونی دەقە ، نیشانی دەدات کە حومەکە هۆدارە بە هۆکارێك کە لەگەڵیدا دەسوڕێتەوە بە بوون و نەبوون وەك نیشاندانی ماددەی(٢٨٧)[3] یاسای بنەماکانی دادگایی کردنە تاوانکاریەکانی عێراق کە ڕاستە واتاکەی دەڵێت: ئەو ئافرەتەی سزای سێدارەی بەسەردا سەپێندراوە ئەگەر سکپڕبوو جێبەجێ کردنی لە سێدارەدانەکەی دوادەخرێت تا سکەکەی دادەنێت ، کاتێك سکەکەی دانا بە زیندویی ئەوا تا چوار مانگ بەسەر منداڵ بوونەکەدا بەسەرنەچێت سزاکە جێبەجێ ناکرێت ، ئەم چەمکە بە نیشاندانێکی پابەندی ئەوە دەخاتە ڕوو کە هۆکاری دواخستنی جێبەجێ کردنەکە پاراستنی ژیانی منداڵەکەیە ئەگەر بە دەزگا نوێیەکان ئاشکرابوو کە کۆرپەکە مردووە یان سکەکە هیچ بونێکی نیە ، بەڵکو سکپڕیەکەی لە نەخۆشییەکەوە بوو. . ئەوا سزاکە جێبەجێ دەکرێت بێ هیچ دواخستنێك بە هۆی سکپڕیەوە.

---

[1]. لەبەر مانای گشتی ئەم ئایەتە( ولا تقربوا الزاني انه كان فاحشة وساء سبيلا) الإسراء/ ٣٢.

[2]. یاسای چاودێری ناتەواو و کەم ئەندامان . ژمارە (٧٨) بۆ ساڵی ١٩٨٠.

[3]. ژمارە (٢٣) بۆ ساڵی ١٩٧١

٥_ **چەمكی ڕاستەوانە (مفهوم الموافقة)** : بریتی یە لە حوكمی بێدەنگی لێكراوەكە كە لە ناوەڕۆك و كاكڵەی دەقەكە و گیانەكەی وەر دەگیرێت نەك لە وشە و دەستەواژەكانی ، كەواتـە نیشـاندانی دەقەكـە بـۆ كـۆی دوو بڕیارەكـە (المنطـوق والمفهـوم) نیشـاندانێكی پڕاوپڕی یە ، بۆ یە كێكیان لە چوارچێوەی كۆكـەدا. . مانـا گەیانـدنێكی لەخۆگرییـە ، وەك ماددەی (٢٣٧) لە یاسای سزاكانی میسری[1] ، (من فاجأ زوجتة حالة تلبُسيها بالزنی و قتلـها فی الحـال هـي ومـن يزنـی بهـا يُعاقـبُ بـالحبس بـدلا مـن العوبـات) : هـەر كـەس لـە ناكـاو خێزانەكەی لە حاڵی زیناكردندا بینی و یەكسەر كوشتی و هەروەها ئەو كـە سەشـی كوشـت كـە زیناكـەی لەگـەڵ ژنەكـەی كردبـوو. . سـزا دەدرێـت بـە بەنـد كـردن لـەبری سـزا بڕیـار دراوەكانی ناو ماددەی (٢٣٤_٢٣٦) : كە چەمكی ناوەڕۆكە ئاشكرا كەی ئەوە دەگەیـەنێت كە سوك كردنی سزای مێردە بكوژەكە لە ئێشی گرانی هەتا .هەتایی یەوە بۆ كاتی یان بەنـد كـردن بـە هـۆی هەلومـەرجی سـوككراوی هـاوڕا لەگـەڵ تاوانەكـەدا ، ئـەم مـاددە چـەمكی ناوەڕۆكەكەی بە شیاوتر سوككردنی سزاكە دەگەیەنێت لە حاڵەتی برین یـان توشـبوون بـە نەخۆشیەكی درێژخایەن یان لێدانێك كە ببێتە هۆی مردن ، كەوابوو نیشـاندانی ئـەو مـاددە باسكراوە بۆ كۆی (چەمكی ناوەڕۆك و واتای ڕواڵەت) گەیاندن و مانا بە خشـینێكی پڕاوپـڕی یە ، بۆ چەمكی ناوەڕۆك بە تەنها یان چەمك بە تەنها لە چـوار چـێوەی كـۆی واتاكـەدا واتـا گەیاندنێكی بەشی یە.

٦_ **چەمكی پێچەوانە (المفهوم المخالف)** : بڕیارێكە پێچەوانەیە بۆ ڕواڵـەتی دەق ، دواكەوتنی بەندە هاتووەكەی ناو دەقە بڕوا پێ كراوەكە دەگەیەنێت لە بڕیاری باسكراودا بە گەیاندنێكی عەقڵی پابەندی ، چونكە هاتنی بەندەكە لـە دەقەكـەدا وەك مـەرجێك وایـە بـۆ جێبەجێ كردنی چەمكی ناوەڕۆكی دەقەكە ، ئەگەر نەهاتە جێ. . ئەوا حوكمی پێچەوانەی چەمكی ناوەڕۆك جێبەجێ دەكرێت وەك ئەو دووبەندە كە لە ناو ماددەی (١٢٩) بەندی یەك (١) دا هـاتووە: (دروسـتە جێگـەی پابەنـد بوونەكـە نـەبووبێت (معـدوم) كـاتی گرێبەسـت كردنەكە ئەگەر دەگونجا لە ئاینـدەدا دەسـت بخرێـت بـە شـێوەیەك دیاریكراوەكـە نـەزانین

---

[1]. ژمارە (٥٨) بۆ ساڵی ١٩٣٩.

وخەڵەتاندن نەهێڵێت. فرۆشتن بە سەلەم یەکێکە لە گرنگترین جێبەجێ کردنەکانی ئەم ڕێسا یاسایی یە ، کە بریتی یە لە فرۆشتنی شتێکی نەبوو لە کاتی گرێبەست کردندا بە نرخێکی وەرگیراوی یەکسەری ، سەلەم: فرۆشتنی شتێکی نەبووە ، وەك دەرکردنێك لە ڕێسای فرۆشتن و ئاسانکاریەك ، شەریعەتی ئیسلام دانی پێدا ناوە ، پێغەمبەری خوا دەفەرمێت (صلی الله علیه وسلم) : هەرکەسێك بەرووبوومی بەسەلەم فرۆشت. . با پێوانەکە زانراو و کێشانەکە زانراو و تا کاتێکی زانراویش بێت) . [١] هەروەك یاسا دانی ناوە بەم مامەڵەیەدا بە دوو مەرج: یەکێکیان ئەوەیە: شتەکە بگونجێت کە لەئایندەدا دەست بکەوێت ، وەك فرۆشتنی بەرهەمی کشتوکاڵ پێش کاتی پێگەشتنی ، دووەم: جۆری شتەکە یان چۆنیەتیەکەی یان بە چەند شێوەیەك کە شتەکە دیاری بکات بە دیاریکردنێك کە هیچ نادیاری و تەم و مژێك لە شتەکەدا نەمێنێتەوە کە ببێتەوە هۆی ئاژاوە و شکات و شکاتکاری و زیان ، ئەگەر ئەم دوو بەندە یان یەکێکیان نەهاتە جێ. . ئەوا حوکمی دروستیەتی دەگۆڕێت بۆ نادروستی ، ئەوەی تێبینی دەکرێت بەسەر دەقی یاسا عێراقیەکەوە ئەوەیە: کە شوێنی پابەندبوونەکەی -کە بەجێ هێنانە- لەگەڵ جێگەی گرێبەستەکەدا -کە شتە فرۆشراوەکەیە- تێکەڵ کردووە .

[١]. صحیح مسلم ب ٣/ ١٢٢٦ لەم فەرمو دەیەدا سێ بەندی لەبەر چاو گیراوی تێدایە ئەگەر یەکێك لە ولنە نەبو ئەوا سەلەمەکە پوچە.

## باسی دووەم:
## چەمکە هەمەکیەکان و
## زاراوە یاسایی یەکان

لەمەوپێش باسمان کرد کە لۆژیکی تیۆری لەگەڵ چەمکەکان و بیرەکاندا مامەڵە دەکات نەك لەگەڵ وشە و شتە بینراوەکان دا ، وشەکان مەبەستن نەك لە خودی خۆیاندا بەڵکو لەبەر ئەوەی چەمکەکان دەگەیەنن ، کەوابوو ئەو واتایەی وشەی بۆ دانراوە پێی دەوترێت (چەمك) لەبەر ئەوەی لە وشەکەوە وەردەگیرێت هەروەك پێی دەوترێت (مانا) و (ڕاستە قینە) و (چیەت) و (نیشان دراو) و (مەبەست) ، ئەو شتەی ئەم چەمکەی تیا بەرجەستە دەبێت و تاکەکان دەچنە ژێریەوە. پێی دەوترێت (ما صدق) و هەندەکی و تاك.[1] چەمك و چەمك لەخۆگر (ما صدق) لە ڕاڤەکردن و ڕوونکردنەوەی جیاوازی و جیاییان ڕاجیایی هەیە ، لە پێشتر و پەسەندتر ( الراجح ) لە دیدگای منەوە ئەم دووانە لەم خاڵانەدا لێکتر جیا دەکرێنەوە:

١_ چەمك تەنها بوونێکی زەینی هەیە ، چەمك لەخۆگر لە زەین و دەرەوەدا بوونی هەیە.

٢_ چەمك لەخۆگر (ما صدق) بەخۆیەوە وەستاوە (قائم بذاتە) و چەمك سیفەتە بە ماسەدەقەوە وەستاوە وە دەبڕدرێت بەسەریدا ، بۆ نمونە چەمکی کوشتن لە ناو بردنی گیانی تاوان بەرامبەرکراوەکەیە و وە ئەوەی ئەم چەمکەی بەسەردا دەچەسپێت ماسەدەقە کەیەتی ، کەواتە لە مانای کوشتندا لە بواری چەمك بوونەوە تەماشای سیفەتەکە دەکرێت ، وە لە بواری چەمك بەسەردا چەسپانەوە خود ڕەچاو دەکرێت.

---

[1]. المنطق فی شکله العربی ، للشیخ محمد المبارك عبدالله ، مطبعة علی صبیح ل ٢٣.

٣_ چەمك پەیوەندی بە چۆنیەتی واتاوە هەیە ، و تۆباڵە (محمول) لە باس دا(القضية) ، چەمك بەسەردا چەسپیوەكە پەیوەندی بە چەند و خودەوە هەیە و بابەتە لەدۆزدا.

٤_ دیارناو (العلم) ی كەسی چەمكی نیە ، بەڵكوو بوونی دەرەكی هەیە ، كەوابوو دیارناو سیفەتێك نیشان نادات كە لەبەر ئەو بڕابێت بەسەر خاوەنەكەیدا ، ئەگەرچی واتایشی هەبێت:[1] كە نیشاندانی خودێكی دەست نیشانكراوە كە خاوەنی چەند جیاكەرەوەی تایبەتی یە ، وەكو ئاماژەیەكیش وایە بۆ خاوەنەكەی بێ ئەوەی سیفەت و چۆنیەتیەكانی ئەم كەسە یا ئەو لەخۆ. (جون ئیستیوارد مێل) باسی ئەم جاوازیەی كردوە و زۆریەی زانایانی لۆجیك وەریان گرتووە[2] ، جگە لەمە ئەم ڕایە پەسەند نەكراوە كە دەڵێت: هەندەك بەشێكە لە چەمك. هەروەك باسی دەكەین.

## كاریگەری ئاسەواری چەمك لە دیاریكردنی ماصەدەق دا

لەبەرئەوەی كە چەمك سیفەتێكە یان ئەو سیفەتانەیە كە بوونی دەرەكی تاكەكان دەیگرێتە خۆی شتێكی سروشتی یە كە (ماصدق) لە ڕووی چەندەوە بكەوێتە ژێر كاریگەری چەمك ، هەرچەند چەمك زیادی كرد لە ڕووی بەندەكانەوە (ماصدق) ەكە كەم دەبێت ، هەر چەند چەمك كەم بێت ماصدق زیاد دەبكات ، بۆ نمونە چەنكی ڕەگەز پێش ئەوەی جیاكار بخرێتە (ماصدق) ەكەی زیاترە ، جا ئەگەر وتمان: تاوان كارێكی قەدەغە. . هەموو ئەو قەدەغەكراوانە دەگرێتەوە كە بەرپرسیارێتی تاوانی و مەدەنی یان لێ دروست دەبێت ، وە ئەگەر وتمان: تاوان قەدەغە كراوێكە سزای لەسەر دەدرێت. . (ماصدق) ەكە كەم دەبێتەوە چونكە تەنها ڕووداوە تاوانكاری یەكان دەگرێتەوە ، ڕوداوە شارستانیەكان دەكاتە دەرەوە ، چونكە پاداشتی دووەم تەنها بژاردنەوەیە نەك سزا.

[1]. بەشێك كە یەكسان بن بە چەمك.

[2]. المنطق ومناهج البحث العلمي في العلوم الرياضة. للدكتور عبدا المعطى محمد لا ٨٨.

## بەشەكانی چەمك

لە بواری فەلسەفیەوە چەمك دابەش دەبێت بۆ جەوهەر و وارس (عرض) ، وارسیش دەكرێت بە (نۆ) بەشەوە بە هەموویان دەوترێت دە واچەكە (المقولات العشر) ، وەك لەمەودوا دێت ، وە لە بواری لۆژیكیەوە چەمك (المفهوم) دابەش دەبێت بۆ هەندەكی (جزئی) و هەمەكی (كلی) ، هەمەكیش دابەش دەبێت بۆ رەگەز و جۆر (النوع) و جیاكار (الفصل) و وارسی گشتی (العرض العام) و تایبەت (الخاصة) هەروەك بەدرێژی باسی دەكەین :

**الجزئی (هەندەكی)** : هەر شتێكە تەنها بەسەر تاكێك دا بچەسپێت ، وەك دیارناوەكان بە گوێرەی كەسێك كە لەمەوپێش خاوەنی دیارناوەكەی بینیبێت یان بە دەماودەم بیستبێتی وەك (محمد) ، (خالد) ، (بەغداد) ، (دیجلە) ، (فورات) ، (قناة السویس) ، جگە لە مانەش لە دیارناوە كەسی و كەرەستەیی یەكان. ئەمەش بەپێی ئەو بنەمایەیە كە دیارناوەكان لە چەمكەكانن بە پێچەوانەی ئەوەی كە ئێستا باسمان كرد كە ئەم دیارناوانە (ماصدق) یان هەیە و چەمكیان نیە. لە پەرتوكی (برهان) [1]دا هاتووە: (چەمك ئەگەر تەماشای خودەكەی بكرێت. . ئەگەر عەقڵ رێگە نەدا یەك بگرێت لەگەڵ كۆمەڵێك شتی دەرەوەی زیهن دا. . ئەوا هەندەكی راستینەییە وەكو زەیدی بینراو) . كە وابوو هەموو شتێك لە زەیندا پێش بینینی. . هەمەكی یە بە گوێرەی هەر كەسێكەوە كە نەی بینیوە و پاش بینینی دەبێتە هەندەكی. وە هەندەكیش یا راستینەیی یە یاخود دانەپاڵی یە (إضافی) ، راستەقینەیی ئەوەبوو كە باسمان كرد ، دانەپاڵییش: بریتی یە لە هەمەكیەك كە دەچێتە ژێر هەمەكیەكی ترەوە وەك جۆرێك كە دەچێتە ژێر رەگەزەوە ، بێگومان ئەمە هەندەكیە بە گوێرەی رەگەزەكەی.

---

[1]. للكلنبوی الشیخ اسماعیل بن مصطفی المعروف بشیخ زادە ل ٣٥.

## هەمەکی و بەشەکانی

**الكلي**: هەمو وشە یان زاراوەیەکە کە عەقڵ ڕێگە دەدات چەمکەکەی بەسەر زیاتر لە شتێکدا بچەسپێن لە زەیندا ، جیاوازی نیە لە دەرەوەی زەین تاکی هەبێت یان نا ، چونکە جاری وا هەیە چەمکەکە لە زەیندا هەمەکی دەبێت کە ژمارەیەك لە تاك دەچێتە ژێری ، لەکاتێکا دەزانین تەنها یەك تاکی هەیە لە دەرەوەی زەیندا ، وەك ئەم هەسارەیە کە بۆ ژیان گونجاوە وە لە زەیندا ئەستەم نیە کە کۆمەڵێك هەسارە هەبێت کە ئاو و ئۆکسجین و جگە لە مانەی تێدا بێت لە پێویستییەکانی ژیان. بەڵام ئێستە ئەم چەمکە لە هەسارەی زەویدا کورت دەکرێتەوە. وە ژمارەی تاکەکانی هەمەکی هەندێجار دیاری کراوە وەك چەمکی دەوڵەت (الدولة) کە بێگومان دەچەسپێت بەسەر ژمارەیەکی دیاریکراودا کە بریتی یە لەو دەوڵەتانەی دانیان پێدا نراوە و ئەندامن لە نەتەوە یەکگرتووەکان دا ، هەروەك جاری وا هەیە ژمارەی تاکەکانی چەمکەکە دیارێکراو و کورت هەڵێنراو نین بەڵکو بێ کۆتان وەك تاکەکانی چەمکی زانست.

## بەشەکانی هەمەکی

زانایانی لۆژیك پێیان وایە کە لە پێنج بەش پێك دێت[1] : **ڕەگەز** (**الجنس**) **جۆر** (النوع) **جیاکار** (الفصل) **تایبەت** (الخاصة) **وارسی گشتی** (العرض العام) ، بەڵام ئەم کورت هەڵێنانە دژایەتی هەیە لەگەڵ ئەژمار کردن و دانانی پۆلەکان و تاکەکاندا لەڕیزی هەمەکیەکاندا پێش بینین لە هەمەکیەکان ، لەگەڵ ئەمەی کە ناچنە نێو یەکێك لەم پێنج بەشە باسکراوانەوە. زانایانی لۆژیك لە کۆن و نوێدا ئەم پێنج هەمەکەیان بە کۆمەڵێك پێناسەی تەم و مژاوی و کۆن پێناسە کردووە کە پاشین لە پێشینەوە وەریانگرتووە بێ هیچ بەرەو پێش بردنێك ئەوە نەبێت کە جیاوازی لە دەربڕینەکاندا هەیە ، سەرەڕای ئەوە کۆن و ڕزیون و لەگەڵ سەردەمی نوێدا ناگونجێن ، لە بەر ئەوە بۆ هەر یەکێك لەوانە پێناسەیەکی ئاشکراو ڕوون و گشتگر و (جامع) ڕێگر (مانع) پێشنیار دەکەم کە بگونجێت

[1]. البرهان للكلنبوى :٤٢ و شرح التنهيب للحسن بن احمد الجلال ل ٤٧ وتحرير القواعد المنطقية في شرح رسالة الشمسية ٣٩.

لەگەڵ لۆژیكی نویٚ ، لەگەڵ گۆڕینی زنجیرەییە كۆنەكەی و زیادكردنی جۆری شەشەم بۆ ئەم پێنج هەمەكیانە:

١_ **الجنس (ڕەگەز)** : سیفەتێكی خودی یە ، بەشی گشتی لە چیەتی شتەكەدا نیشان دەدات كە چەند چیەتیەكی جۆراوجۆر هاوبەشن لەو حەقیقەتەدا.

٢_ **الفصل (جیاكار)** : سیفەتێكی خودی یە ، بەشی تایبەتی چیەتی شتەكە نیشان دەدات ، دەبێتە هۆی جیاكردنەوەی بەشە تایبەتەكە لەو چیەتانەی هاوبەشن لەگەڵیدا لە بەشە گستی یەكەیدا .

٣_ **النوع (جۆر)** : چیە تێكە لە ڕەگەز و جۆر پێك هاتووە.

٤_ **الصنف ( پۆل _ گروپ)** : ئەو شتەیە دەكەوێتە ژێر جۆرەوە و یەك چیەتیەتیان هەیە و جیا دەبێتەوە لە پۆلەكانی تر كە لەژێر ئەم جۆرەدایە بە تایبەتەكانیەوە .

٥_ **العرض العام (وارسی گشتی)** : سیفەتێكی وارسی یە ، بە چیەتی شتەوە وەستاوە چەند چیەتێكی تر تێیدا هاوبەشە .

٦_ **تایبەت**: سیفەتێكی وارسی یە ، بە چیەتی شتەوە بەندە و جیای دەكاتەوە لە چیەتە هاوبەشەكان.

ڕونكردنەوەی ئەم زاراوانە

شتێكی بەڵگە نەویستە كە بۆ هەموو بابەتێك چیەتێكی پێكهاتو هەیە كە لەسەر دوو ستون وەستاوە بەلای كەمەوە: **یەكەمیان**: گشتی یە و كۆمەڵێك بابەتی تر تێیدا هاوبەشن ، **دووەمیان**: تایبەتێكە كە بابەتی خوازراو لە نەخوازراو جیا دەكاتەوە لەو بابەتانەی كە هاوبەشن لە گەڵی لە ستونی تایبەتی ئەودا. بێگومان زانایانی لۆجیك زاراوەی (ڕەگەز) یان بۆ ئەم پایە گشتی یە هاوبەشە داناوە. هەروەها بۆ ئەم پایە تایبەتە جیاكەرەوەدا زاراوەی (جیاكار) یان بەكارهێناوە. وە زاراوەی (جۆر) یان بەسەر ئەو چیەتەدا بریوە كە پێكهاتووە لە دوو ستونی گشتی و تایبەت ، جا بۆ نمونە تاوان جۆرێكە لە كاری نارەوا ، وە چیەتەكەی هەموو قەدەغەكراوێكە سزای لە سەر بێت ، وشەی (قەدەغە كراو) ڕگەزێكە هەموو كارێكی تاوانكاری دەگرێتەوە كە ببێتە هۆی سزاو كاری زیان بەخش كە ببێتە هۆی كاری بژاردن ، دەربڕینی (سزای لە سەرە) جیاكارێكە تاوان جیادەكاتەوە لە كردەوانێكی

ناشەرعی كە سزاكانیان بڕاردنە بەبێ سزادان. تاوانیش جۆرێكی دانەپاڵی ڕێژەیی یە بە پێی كاری ناڕەوا و ڕەگەزە بۆ هەموو جۆرەكانی تاوان وەك دزی كردن و كوشتن و جگە لە مانەش ، بەلام جۆرێكە چەند پۆلێك دەچنە ژێریەوە ، بۆ نمونە كوشتن جۆرێكە لە تاوان و چیەتە یاساییەكەی: (لەناوبردنی گیانی مرۆڤە) ، چەند پۆلێكی كوشتن دەچێتە ژێریەوە لەوانە: كوشتنی بەئەنقەستی دەست درێژكاری ، كوشتنی سادە كە باری ئاسانكار یان توندكاری لەگەڵدا نەبێت ، وە كوشتنی بەراورد بە دۆخی توندكار. وە كوشتنی بەراورد لەگەڵ دۆخی ئاسانكار ، كوشتنی نیمچە ئەنقەست (لێدانێك بێتە هۆی مردن) ، كوشتنی بەهەڵە ، كوشتنی ڕەوا ، هەروەها. . . ئەم پۆلانە لە چیەتی كوشتندا یەكن (كە لە ناو بردنی گیانی مرۆڤە) بەلام لەناو خۆیاندا جیاوازن لە وارسە تایبەتەكانیاندا ، لەبەر ئەوە جیاوازن لە سزاكانیاندا و دەچێتە ژێر پۆلەكانی تاكە سیفەت و تایبە تمەندی یە جیاكان سەرەڕای ڕێك كەوتنیان و بەشدار بوونیان لەیەك چیەتدا. وە ئەم نیشانانە كۆمەڵێك وارسگەلێكی گشتین لە ڕووی چەمكەوە و وارسگەلێكی تایبەتن لە ڕووی (ماصدق) ەوە ، كە زانایانی لۆژیك بەزاراوەی وارس دەیدەنە قەڵەم ، كە ئەمیش دابەش دەبێت بۆ وارسی گشتی و وارسی تایبەت ، بەم پێیە هەمەكیەكان –كە بریتن لە بنەما وێناكردەییە لۆژیكیەكان– دەبن بە شەش بەشەوە ، سەرجەم زاراوەكانی زانستەكان لە جیهاندا بە زاراوە یاسایی یەكانیشەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەم شەش بەشە:

### بەشی یەكەم: ڕەگەز (الجنس)

ئەو پایە گشتی یەیە لە هەموو چیەتێكدا كە چەند چیەتیەكی جۆربەجۆر تێیدا بەشدارە كە پایەكانیان جیاوازە ، ئەویش دابەش دەبێت لە ڕووی پلەكانیەوە بۆ چوار جۆر: **ڕەگەزی بالا (الجنس العالی)** ، **ناوەند** (المتوسط) ، **نزم (السافل)** ، **تەنها (المنفرد)** :

١_ **ڕەگەزی بالا (یان هەرە بالا)** : ئەو ڕەگەزەیە كە ڕەگەزێكی تری لەسەرەوەنیە ، بەلام چەند ڕەگەزێك دەچنە ژێری یان چەند جۆرێك وەك شت.

٢– **ڕەگەزی ناوەند (الجنس المقرسط)** : ئەو ڕەگەزەیە دەكەوێتە نێوان دوو ڕەگەزەوە وەك بووی زیندوو.

٣_ **ڕەگەزی نزم (یان هەرە نزم)** : ئەو ڕەگەزەیە ڕەگەزی لەسەرەوەیە بەلاّم تەنها جۆرەکان دەچنە ژێری وەك: زیندەوەر.

٤_ **ڕەگەزی تەنها (الجنس المفرد)** : ئەو ڕەگەزەیە کە هیچ ڕەگەزێك نەدەکەوێتە ژێریەوە ، نە دەکەوێتە سەریەوە وەك خالّ.

[illegible]

ڕووداوی یاسایی (تایبەت بە یاسا) : ڕەگەزێکی بالآیە کە دوو ڕەگەز دەکەونە ژێریەوە: دەسکاری یاسایی (التصرف القانونی) و ڕووداوی یاسایی (الواقعة القانونیة) . زانایانی یاسا دەسکاری یاسایی یان پێناسە کردووە بەوەی: ئاڕاستەی ویستە بۆ دروست کردنی ئاسەوارێك کە یاسا گرنگی پێدەدات.[1] پاشان دابەشیان کردووە بۆ گرێبەست و ویستی تەنها ، وە لەو دووانەدا کورتیان کردۆتەوە. هەموو کردەوە و قسەیەکیان جگە لەم دووانە بە ڕووداو داوەتە قەڵەم ، وە هەر یەکە لەم پێناسە و دابەش کردنە یاسایی یە هەڵەیە لە تەرازووی لۆژیك و زمانی عەرەب و نەریتی ئەواندا لەبەر ئەم هۆکارانە:

١_ **دەسکاری (التصرف)** : ئاراستەی ویست نیە ، بەڵکو بەرهەم و ئەنجامی ئەم ئاراستەیە یە.

٢_ (دەسکاری) ئاسەواری ڕاستەوخۆی ئاراستەی ویست نیە ، چونکە هەر شتێك لەلایەن مرۆڤەوە دەکرێت بە ویستێکی ئازادی پەیبەرەوە دەکرێت و یەکەمجار هەست پێکردن و پەی پێبردنی پەیوەندی پێوە هەیە ، پاشان ویستی ، ئەمجا توانینی شتەکە ، کە وابوو دەسکاری مرۆڤ بەرهەمی توانایەتی کە ئەویش پاشکۆی ویستیەتی ئەویش پاشکۆی پەیی پێبردن و هەست پێکردنیەتی.

٣_ ئاسەوار ئەگەر مەبەست پێی ئاسەواری دەسکاری بێت لە ماف و پابەندیەکان. . ئەوا لە دروستکردنی یاسایە یان شەرعە ، دەسکاری مرۆڤ هۆکاریەتی ، ئەگەر مەبەست پێی خودی دەسکاری بێت. . ئەوا ئاسەواری توانایە نەك ویست.

---

[1]. ماددەی (٣٠٥) لە پرۆژەی یاسای شارستانی عێراقی نوێ.

٤_ کۆکردنەوەی دەسکاری لە وتەکاندا و کورت هەڵێنانی وتەکان لە گرێبەست و ویستی تەنهادا دژە لەگەڵ زمانی عەرەب و نەریتە دەستاودەست پێ کراوەکانی لە برینی دەسکاری بەسەر کارەکاندا زیاتر لە برینی بەسەر وتەکاندا ، کەواتە هەر کەس زاراوە دادەنێت پێویستە لەسەری ڕەچاوی زمان و داب و نەریتی عەرەب بکات. پێناسەی ڕاست بۆ دەسکاری یاسایی (التصرف القانوني) ئەمەیە: هەموو کارێکە لەلایەن مرۆڤێکی پێگەیشتو (بالغ) ی عاقڵی سەرپشککراو (مختار) ی هوشیارەوە ئەنجام دەدرێت و یاسا ئاسەوارەکانی لەبەرچاو دەگرێت. بە پێی ئەم ڕاستیە بێگومان دەسکاری یاسایی بەدی نایەت مەگەر بە بوونی ئەم شەش توخمەی خوارەوە کە ئەگەر یەکێك لە مانە نەبوو. . ئەوە کارەکە دەبێتە واقیعەیە:

١_ دەبێت ڕووداوەکە لە لایەن مرۆڤەوە بێت ، کەواتە هەر ڕووداوێك لە زیندەوەرەوە یان لە سروشتەوە بێت واقیعەیە.

٢_ دەبێت لەلایەن پێگەشتویەکەوە یان جیاکەرەوەیەکەوە ئەنجام درابێت ؛ کەوابوو هەموو کارێك کە لەلایەن منداڵێکی جیانەکەرەوەوە بکرێت واقیعەیە.

٣_ دەبێت لە لایەن مرۆڤێکی عاقڵەوە ئەنجامدرابێت ، کەوابوو هەر کارێك لەلایەن شێتەوە ئەنجام بدرێت واقیعەیە.

٤_ دەبێت بە ویستێکی سەربەست ئەنجامدرابێت ، چونکە هەر کارێك لەلایەن کەسێکی زۆرلێکراو و ناچارەوە بکرێت ئەوە واقیعەیە ، نا گۆڕێت بۆ دەسکاری مەگەر بە مۆڵەت پاش نەمانی ئاسەواری زۆر لێکردن و ناچاری یەکە.

٥_ دەبێت کارەکە بە ویستێکی هوشیارانە بکرێت ، چونکە هەرچیەك سەرخۆش یان بێ هۆش (المغمى عليه) و خەوتو و هەڵەکەر (الخاطئ) و لەبیرچوو (الناسي) و گاڵتەکەر پێی هەڵبسێت واقیعەیە.

٦_ دەبێت ئەنجامدانەکە بە جۆرێك بێت یاسا لەبەر چاوی بگرێت و گرنگی پێ بدات و ئاسەوارەکانی بخوێنێتەوە ، کەواتە ئەو گوتە و کردارانە کە ئامانجی بەدیهێنانی مەبەستێکی نزیك یان دووری نیە. . یاسا بە گرنگ سەیری ناکات. دەسکاری یاسایی دابەش دەبێت بۆ: ڕەوا (المشروع) و ناڕەوا (غير المشروع) . چونکە یاسا هەروەك بڕیاری نادروستبوونی ئاسەوار دەدات لە سەر گرێبەست لە ماف و پابەندییەکان. . ئاواش بە هۆی

كـاری زیانـدەرەوە بڕیـاری بـوونی ئاسـەوار دەدات لـە دانـی مـاف بـە زیـان لێكـەوتوو و پابەندكردنی زیاندەرەكە بە بژاردنی زیانەكە ، هەریـەك لـە دەسـكاری ڕەواو نـاڕەوا دابـەش دەبێت بۆ گوتـاری و كـرداری ، وەكومەڵـە ڕگـەزی ناوەنـد و نـزم دەكەونـە ژێـر دەسـكاری یاساییەوە ، هەروەك كومـەڵێك جـۆر دەچـنە ژێـر ڕەگـەزە نزمەكانـەوە ، وە چـەند پۆلێـك دەچنە ژێـر جۆرەكانـەوە ، وە تاكـەكانیش دەچـنە ژێـر پۆلەكانـەوە. ڕەگـەزی تـەنها یـان ڕەگەزی تەنهایی (الجنس الإنفرادی) : ئەو ڕەگەزیە كە ڕەگـەزێكی تـری لەگەڵـدا نیـە. . نـە لەسەریەوە نە لەژێریەوە ، وەك هەڵەی یاسایی (الخطأ القانونی) : ئەویش زیان گەیاندنە بـە ئەركێكی یاسایی لەگەڵ هەستكردنی زیان گەیەنەرەكە پێی ، زیان گەیاندنەكەش ڕەگەزە و دوو جۆری لە ژێردایە: هەڵەی تاوانكاری (الخطأ الجنائي) و هەڵەی مەدەنی (الخطأ المدنی) ، وە لەژێر هەر یەكێكیان دا چەند پـۆل هەیـە: هەڵـەی بـە ئەنقەسـت (الخطـأ العمـد) هەڵـەی كەمتەر خەمی (خطأ الإهمال) هەڵەی ئـەرێنی (الخطـأ الإیجـابي) و هەڵـەی نـەرێنی (الخطـأ السلبی) .

بەشی دووەم، جیاكار (الفصل)

بەشی تایبەتی یە لەچیەتی جۆر و جیای دەكاتەوە لەو جۆرانەی كە لەگەڵیدا لە ژێر یەك ڕەگەزی نزمدا كۆدەبنەوە. ئەویش جۆری نزیكە: ئەگەر جۆری جیا دەكردەوە لە هەموو ئەو شتانەی كە هاوبەشیی لەگەڵدا دەكـات لـە ڕەگـەزی نزیكیـدا (الجـنس القریـب) ، جیاكـاری دووریشە ئەگەر جیای كردەوە لە ڕەگەزە دوورەكەی (ناوەند یان بالا) . بـۆ نمونـە: ئەگـەر گرێبەست پێناسە كرا بەوەی كە دەسكاری یەكی وتەیی ڕەوایە كە پێك هـاتووە لـە بەیـەك گەشتی دوو ویست و یاسـا شـوێنەوارەكانی بەسـەردا جێبـەجێ دەكـات ، كەواتـە وشـەی (دەسكاری) : ڕەگەزێكی دوورە ، و وشەی (وتەیی) : ڕەگەزێكی ناوەندە ، و وشەی (ڕەوا) ڕەگەزێكی نزیكە ، وە ڕستەی (پێك هاتووە لە بەیەكگەشتنی دوو ویست) : جیاكاری دوورە و گرێبەسـتەكە جیـا دەكاتـەوە لـەو شـتانەی لەگـەڵ گرێبەسـتدا هاوبەشـی لـە ڕەگـەزی دەسكاریدا هەیە ، ئەویش دەسكاری تاكی یە ، و ڕستەی (یاسـا شـوێنەوارەكانی بەسـەردا جێبـەجێ دەكـات) : جیاكـاری نزیكـە و جیـای دەكاتـەوە لەگرێبەسـتێك كەیاسـایی هـیچ شوێنەوارێكی ڕێگە گری بەسەردا جێبەجێ ناكات.

بەشی سێیەم : جۆر ( النوع )

ئـەمیش پێـك هـاتووە لـە ڕەگـەز و جیاکـار ، ئـەویش دوو جـۆرە: ڕاسـتەقینەیی و خستنەپاڵی (إضافي) .

**جۆری ڕاستەقینەیی** : ئەو جۆرەیە کە پۆلەکان دەکەونە ژێری بێ جۆر.

**جۆری خستنە پاڵی** : ئەو جۆرەیە دەبێتە ڕەگەزی ناوەند یان نزم لە ڕاستیدا بۆ ئـەو شتانە دەکەونە ژێری ، وە بەجۆر دەدرێتە قەڵەم بۆ ئـەو ڕەگـەزەی کـە لەسـەریەوەیەتی ، کەوابوو دەسکاری گوتەیی جۆرێکە لە دەستکاری ڕەها.

بەشی چوارەم : پۆل ( الصنف )

پۆلەکان چەند هەمەکیەکن دەکەونە ژێر جۆرییەوە و سازن و ڕێـك دەکـەون لەگـەڵی لـە چیەتیدا. بەڵام لە نێوان خۆیاندا جیاوازن لە سیفات و وارسە خودیەکانیاندا وەك ڕەنگ و تام و چاکی و خراپی و وێنەی ئەمانە ، ئەم جیاوازی یە لەبەرچاو دەگیرێت لەنرخدا لەبەر ئـەوە پۆلێك جێگەی پۆلێکی تر ناگرێتـەوە لـە جێبـەجێکردنی پابەندیدا بـە بەڵگـەی یـەکبوونی جـۆرەوە مەگـەر بـە ڕێککـەوتنێکی ڕازیبـوونی لـە نێـوان هـەر یەکـە لـە بەڵێنـدەر و بـۆ لەئەستۆگیراو . جیا کردنەوە لە نێوان ڕەگەز و جۆر و پۆلدا. . گرنگیەکی گەورەی هەیە لـە مامەڵە داراییەکاندا ، بێگومان زانایانی شـەریعەت و یاسـا ئـەم زاراوە لۆژیکییانـەیان تێکـەڵ کردووە. لە باسی سوددا زانایانی شەریعەت دەڵێن: (ئاڵتون و زیـو) هاوڕەگـەزن ، هـەروەها (گەنم و جۆ) بۆ نمونە ، کە چی ئەم هەمەکیانە و وێنەیان لە جۆرەکانن ، هـەروەك زانایـانی یاسا لە بابەتی هاوچەشنیەکان ، دانیشتنی وێنە لە جێگەی هاو وێنەکەی لە دانەوەدا جۆر و پۆلیان تێکەڵ کردووە ، و بڕیاریان داوە بە ڕەوا بوونی دانەوەی هاو وێنەی. . ئەگەر هـاتوو هاو وێنەییەکان لە یەك جۆر بوون ، کە ئەمەش لۆژیکی یاسایی ڕەتی دەکاتـەوە ، کـەوابوو دانەوە دروست نیە مەگەر بە پۆل ، بە مەرجێك ڕێکەوتنێکی ڕازی بوونی بە پێچەوانە و دژی ئەوەوە نەبێت. وە یەکێك لەو هەڵە بەربڵاوانەی لەناو یاسا و مامەڵـە و فـۆرم و وەبەرهێنانـە فەرمیەکان دا بەدی دەکرێت. . دانانی نێر و مێ یە لە مرۆڤدا بە دوو ڕەگەز ، لەبـەر ئـەوەی ئەم دووانە دوو پۆلن بۆ مرۆڤ ، کـە لـە چیـەت و ڕاسـتیدا ڕێـك دەکـەون ، لـە سیفەتەکاندا جیاوازن.

**بەشی پێنجەم و شەشەم** : وارسی گشتی و تایبەتی ، وشەی (العَرَض) : سەروەت و سامان دەگرێتەوە جگە لە دراوەكان (النقود) ، كۆكەی (عُرُوض) ە ، هەمدیس لە بەرامبەر (طلب) : داواوە بەكاردەهێنرێت لە كارە بازرگانیەكاندا ، وە بە واتای پانیش دێت و بەرامبەرە لەگەڵ درێژیدا (الطول) . وشەی (العِرْض) خووی جوان و ئەوەیە كە مرۆڤ دەیپارێزێت لە خۆیدا یان لە نەوەیدا یان شایەنی ستایش و زەم كردنە ، كۆكەی (أعراض)ە.

(العَرَض) لە شەرع و یاسادا: هەموو شتێكە كە ناتەواوی لە شیاوی و توانای مرۆڤدا دروست دەكات جا لە ناوی دەبات وەك شێت بوون ، یان كەمی دەكاتەوە وەك كەم عەقڵی ، یان هەڵس و كەوتەكانی سنور دار دەكات وەك نەخۆشی مردن ، كۆكەی (عَوارَض) ە واتە: كۆسپەكان ، وە پێی دەوترێت: عوارض الأهلية: واتە كۆسپەكانی شایستەگی.

(العَرَض) لە فەلسەفەدا: ئەو وشەیە كە لەسەر جەوهەر ڕادەوەستێت ، لە لۆژیكیشدا: ئەو شتەیە بە خودەوە وەستاوە ، وە واتای هەردوكیان لەفەلسەفەدا لێك نزیكن ، ئەم واتا لۆژیكی یە مەبەستە لە تۆ ژینەوەكەمان دا. ئەو چوار بەشەی پێشووش لە خودیەكان (الذاتيات) ە. وە ئەم دوو بەشەی كۆتایی لەو وارسانەیە كە بە خودەكانەوە وەستاون و لە دەرەی زەینەدان وەك: ڕەنگەكان و بۆنەكان و زبری و نەرمی و ساردی و گەرمی و وێنەكانیان ، لەو وارسانەن كە بە یەكێك لە پێنج هەستەوەرە دیارەكە هەستیان پێدەكرێت ، هەروەها كۆسپەكانی شایستەگی هەموویان لۆژیكی گشتین بە پێی چەمك و بەتایبەتی بە پێی بوونی دەرەكی و ماصدَق. پێوەری جیاكردنەوە لە نێوان وارسی گشتی و تایبەتی دا بوونی زەینی و دەرەكیە ، كەوابوو هەموو وارسێك گشتی یە بەپێی چەمكەكەی لە زەیندا ، تایبەتیشە بە پێی بوونی و ماصەدەقەكەی لە دەرەوەی زەین دا ، بۆ نمونە: شێتی بە پێ ی چەمكەكەی وارسێكی گشتی یە بۆ هەر كەسێك دوچاری دەبێت و هەموو مرۆڤێكی شێت و هەموو ئاژەڵێكی شێت دەگرێتەوە ، بەڵام بە پێی بوونی دەرەوەیی و بەدیهاتنی لە دەرەەی زەیندا تایبەتە بەو كەسەی تووشی دەبێت ئەوە شتێكی كەسی یە و بە هانایەكی ڕێگرە لە بەرپرسیارێتی تاوانكاری ، كەس سودمەند نابێت لێی جگە لە كەسێك ئەم وارسەی دێتە سەر ، ئەگەر كەسێكی شێت و كەسێكی عاقڵ بەشداربوون لە ئەنجامدانی تاوانێكدا. . ئەوا كەسە عاقڵەكە سودمەند نابێت لە بەهانەی شێتی كەسە هاوبەشەكەی لە

بەرپرسیاریەتی تاوانکاریدا ، بەڵکو لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت و سزا دەدرێت وەك ئەوەی بە تەنهایی تاوانەکەی ئەنجامدا بێت . لە مامەڵە دارایییەکانیشدا هەر کەس لە خۆیەوە کەوتە هەڵەوە یان بە هۆی هەڵخەڵەتاندنەوە: کە ئەویش بەکارهێنانی رێگە سەرلێشێوێنەکانە بۆ ئەوەی کەسێك بخرێتە ناو هەڵەوە و دووبارە بۆ پاڵ پێوەنانی بۆ گرێبەست کردن: تەنها مافی سەرپشکی هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستەکەی هەیە بێ لایەنەکەی تر ، چونکە هەڵە ئەگەرچی وارسێکی گشتییە لەرووی چەمکەوە: کە وێنا کردنی شتە لەسەر جگە لە راستیەکەی ، بەڵام ئەوە هەیە وارسێکی تایبەتە بە پێی کەسێك کەدەکەوێتە ناویەوە ، وە لە تاوانەکاندا سیفەتی تاوانی وارسێکی گشتی یە لە رووی چەمکەوە کە ئەویش هەڵسانە بە کارێکی تاوانکاری ، بەڵام وارسێکی تایبەت بۆ تاوانکارەکە لە رووی بە دیهاتنەوە ، کەوابوو پرسیار لە تاوانەکە ناکرێت جگە لە ئەنجامدەرەکەی نەبێت ، کەوابوو کەسانێك کە پەیوەندی خزمایەتی یان هاوسەرگیریان هەیە لەگەڵ تاوانکارەکە نەبەند دەکرێن و نە رادەوەستێنرێن ، وە ئەم بنەما لەو بنەمایانەیە کە قورئانی پیرۆز پێش یاسا دانی پێدا ناوە لە چەندان ئایەتیدا لەوانە: (ولا تزرُ وازرة وزر أخرى . . . ) [1] واتە: هیچ ئۆباڵێك تاوانی کەسی تر هەڵناگرێت. ئەم ئەندازە بە بەسی دەزانم بۆ ئەوەی باسەکە درێژ و وەڕسکەر نەبێت.

[1]. سورة الإسراء / ١٥.

# باسی سێ یەم:
# پەیوەندییە لۆژیکی یەکان لە نێوان زاراوە یاسایی یەکاندا

زانایانی لۆژیك لەسەر ئەوەن[1] کە هەموو هەمەکیەك لە زاراوە زانستیەکان و جگە لەوان دا ئەگەر بەراورد کرا لەگەڵ هەمەکیەکی تردا و هاوسەنگی کردن لە نێوانیاندا ئەنجامدرا لە ڕووی چەمکەوە یان بە دیهاتن و نەهاتەوە. . پەیوەندی لۆژیکی نێوانیان لە یەکێك لەم چوار خاڵەی خوارەوە بەدەر نیە: یەکسانی (المساواة) ، لێك جیایی (التباین) ، گشتی بوون و تایبەت بوونی ڕەها (العموم والخصوص المطلق) و گشتێتی و تایبەتێتی لە ڕوویەکەوە (العموم والخصوص من وجه) . بەڵگەی کورت هەڵهێنان: ئەوەیە کە دوو هەمەکی هاوتەریب یان دەسەپێن بەسەر یەك شتدا یان نا. **دووەم** :جیاوازی یە ، یەکەم یا ئەم بەسەردا چەسپاندنە لە هەردوو لاوە هەمەکیە یان هەمەکیە لە لایەکەوە و هەندەکیە لە لایەکی ترەوە ، یان هەندەکی دەبێت لە هەردوولاوە ، کەوابوو یەکەم یەکسان بوونە ، دووەم گشتی بوون و تایبەت بوونی ڕەهایە ، **سێ یەم**: گشتی بوون و تایبەت بوونە لە ڕوویەکەوە ، وە ئەم چوار پەیوەندی یە یا بە پێی چەمکەکان دەبێت یاخود بە پێی بەدیهاتن.

---

[1]. رسالة الشمسية وشرحها ل ٥٠ و ما بعدها وتهذيب المنطق بشرح الخبيصي ل ١٧ و البرهان للكلنبوى ل ٥١ پاش ئەو.

## یەکەم: پەیوەندیەکان[1] بە پێی چەمکەکان

**١_ یەکسانی**: بۆنمونە یەکسانی لە نێوان دوو زاراوەی یاساییدا: بریتی یە لە بەسەریەکدا چەسپاندن لە نێوانیاندا. واتە: یەکبوونیان لە تاکەکاندا ، بە شێوەیەك چەمکی هەر یەکێکیان هەموو ئەو تاکانە بگرێتەوە کە چەمکی ئەوی تریان دەیانگرێتەوە.

لەنمونەی یەکسان بوون لەزاراوە فیقهی و یاساییەکاندا ئەمانەن:—

أ _ گرێبەستی راگیراو و گرێبەستی جێبەجیٚ نەبوو ، هەموو گرێبەستێکی راگیراو گرێبەستێکی جێبەجیٚ نەکراوە وە بە پێچەوانەشە ، چونکە چەمکی هەریەکێك لەوان ئەو گرێبەستەیە کە دادەمەزرێنێت بەدروستی بەلاٚم ئاسەواری لیٚ ناکەوێتەوە لە ماف و پابەندبوونەکان مەگەر پاش مۆلەتی کەسێك کە مافی پێدانی مۆلەتی هەیە ، وەك گرێبەستی بژاردن (المعاوضة) کە یەکێك لە لایەنەکان توانای ناتەواوە بەوەی کە گەشتبێتە سالٚی جیاکردنەوە و هێشتا پێی نەنابێتە سالٚی رێدەرکردنەوە ، ئەم گرێبەستە دادەمەزرێت لای جەماوەری زانایانی شەریعەت بە پێچەوانەی شافعی[2] و زاهیریەکان[3] _ بەلاٚم ماف و پابەندی لیٚ ناکەوێتەوە مەگەر پاش رێگەپێدانی سەرپەرشتیار. شایانی باسە کە گرێبەست رادەگیرێت لەبەر چەند هۆکارێکی زۆر ، لەوانە: نەبوونی سەرپەرشتیاری گرێبەستکەرەکە بەسەر جۆری دەسکاریدا وەك نمونەی باسکراو یان بەسەر شوێنی گرێبەستەکەدا ، ئەوە راگیراو و وەستێنراوە لە فیقهی ئەبو حنیفە[4] و فیقهی مالکدا[5] ، وە ئەو یاسایانەی کە ئەم رایەیان وەرگرتووە کەوتونەتە ژێر کاریگەری ئەم دوو فیقهەوە وەك یاسای مەدەنی عێراقی مادده (١٣٥) ، یەمەنی م ١٧٢ و ئەردەنی (م ١٧١) ، گرێبەستی (فضولی) : (فرۆشتنی مالٚی کە سێکە لە لایەن کەسێکی ترەوە بیٚ هیچ وەکالەتێکی یاسایی یان دادوەری) هیچ شوێنەواری لێناکەوێتەوە مەگەر پاش مۆلەتدانی خاوەن مالەکە ، هەروەها هەموو

---

[1]. رسالة الشمسية وشرحها ، سەرچاوەی پێشوو.

[2] الأنوار ٣٠٦/١

[3]. المحلی ٣٢٣/٨

[4]. الإختيار لتعليل المختار ١٧/٢

[5]. بداية المجتهد لابن رشد ب ٢ ل ١٤٣

گرێبەستێكی ڕاگیراو لە فیقهی ئیسلامیدا ئەگەر مافی کەسی تری پێوە هەبوو ، وەك ئەوە ماڵەکە خرابێتە بارمتەوە یان بە کرێدراو بێت یان میراتێك بێت کە قەرزی لەسەر بێت ، کەوابوو فرۆشتنی ماڵە ڕەهنكراوەکە ڕاوەستێنراوە لەسەر مۆڵەتی قەرزدەرە ڕەهنوەرگرەکە وە فرۆشتنی ماڵە بەگرێ دراوەکە وەستێنراوە لەسەر مۆڵەتی بەکرێگرەکە یان کۆتایی هاتنی گرێبەستی بەکرێدانەکە ، بە پێچەوانەی یاساوە کە هەدوو گرێبەستەکە بە جێبەجێ بوو دەزانێت ، بەڵام بۆ قەرزدەری بارمتەوەرگر مافی بەدواداچوون هەیە ، دەتوانێت جێبەجێ بكرێت بەسەر ماڵە لەبارمتە دانراوەکەدا لای هەر کەسێك بێت ، وە فرۆشتنی ماڵی میرات کە مافی قەرزی بەسەرەوەیە لە لایەن میرات بەرەکانەوە ، لەسەر مۆڵەتی خاوەن قەرز یان دانەوەی قەرزەکە وەستاوە ، ئەمە واتای ئەم ڕستەیەیە (میرات نیە مەگەر پاش دانەوەی قەرز) واتە: دەسكاری ماڵی میرات ناكرێت کە مافی قەرزی پێوە بێت مەگەر پاش دانەوەی قەرزەکە یان مۆڵەتی قەرز دەرەکە.

ب- گرێبەستێ کە شیاوی پوچەڵ کردنەوە بێت و گرێبەستێك جێ بە جێ بكرێت و ناپەیوەست بێت ، هەروەك دووك یەكسانن ، چونكە چەمكەكانیان بریتیە لە: هەموو گرێبەستێكی دروست و جێبەجێ بوو بۆ ئەو لایەنە دەبێت کە بڕیاری پوچەڵبونەوە دەدات بۆ بەرژەوەندی خۆی هەڵیبوەشێنێتەوە. گرێبەستێ کە شایانی پوچەڵ کردنەوەیە زاراوەیەکی فیقهی ڕۆژئاوایی و ئەویاسایانەیە کە کاریگەرن پێی وەك دەسكاری فضولی (خۆهەڵقورتێنی) لە یاسای مەدەنی میسری ( م ٤٦٥ ) و سوری (م٤٣٣) و لیبی (م٤٥٤) ، وەك مامەڵەی تواناناتەواو (ناقص الأهلية) لە یاسای میسری دا (م ١١٩) وە گرێبەستێك کە تێكەڵ بێت لەگەڵ ناتەواویەك لە ناتەواویەکانی ویست وەك زۆر لێكردن و شاردنەوەی کەموكوڕی و هەڵەی میسری (م ١٢٠ _١٢٧) سوری (م ١٢١_ ١٢٨) و لیبی (م ١٢٠ _ ١٢٧) ئەم گرێبەستانە شایانی پوچەڵكردنەوەن (جێبەجێكراوی ناپێویستن) لەو یاسا ناوبراوانەدا. وە وەستێنراون لە یاسای عێراقیدا ، ماددەکانی (٩٧، ١٣٤، ١٣٥، ١٣٦، ) وە شایانی باسە ئەو گرێبەستانەی تێكەڵن لەگەڵ ناتەواویەك لە ناتەواویەکانی ویستدا جێبەجێ دەكرێت بەڵام نەك بە (پێویستی) لە فیقهی ئیسلامیدا هەروەك چۆن لە فیقهی ئیسلامی ڕۆژ ئاواییدا ، بەڵام یاسادانەری عێراقی بە تەنها دەڵێت: کاتێك لە گرێبەستە وەستێنراوەکانە کاتێك

هەڵخڵەتاندن ، لەگەڵ زەرەی گەورە دا هەبێت. لێرەدا نەڕای فیقهی ئیسلامی وەرگرتووە نەفیقهی رۆژئاوایی.

ج_ گرێبەستی پوچەڵ و گرێبەستی هەڵوەشاوە: هاوواتان و یەكسانن لای جەماوەری زانایانی شەریعەتی ئیسلامی بە جیاوازی لەگەڵ ڕای زانایانی حەنەفی ، كەواتە هەموو پوچەڵێك خراپ و هەڵوەشاوەیە ، هەروەها پێچەوانە كەشی. چونكە چەمكی هەردوكیان: هەموو گرێبەستێك دەگرێتەوە كە پایەیەك لە پایەكانی تیا نەبێت یان مەرجێك لە مەرجەكانی دروست بوونی.

د_ (الجريمة _ والجناية) مانای تاوان دەگەیەنن و هاوواتان لە فیقهی ئیسلامیدا ، بەجیاواز لەگەڵ هەندێ لە یاساكان كە وشەی (الجناية) تایبەت ترە بە ڕەهایی لە (الجريمة) هەروەك لە یاسای سزاكانی عێراقیدا[1] هاتووە ، چونكە چەمكی هەردوكیان لە فیقهی ئیسلامیدا یەكە ، ئەویش: هەموو كارێكە كە قەدەغەیە و سزا لەسەر ئەنجامدانی هەیە. وە دژی دوو یەكسان یەكسانن وە هەمدیس یەكسانن ، بۆ نمونە: هەر گرێبەستێك كە وەستێنراو نیە. . جێبەجێكراو نیە هەروەها پێچەوانەكەشی. وە هەر گرێبەستێك شایانی پوچەڵ كردنەوە نەبێت. . ئەوا نا پێویست نیە. . هەروەها پێچەوانەكەشی. وە هەر گرێبە ستێك پوچەڵ نەبێت. . خراپ و هەڵوەشاوە نیە ، هەروەها پێچەوانەكەشی ، هەر كارێك (جريمة) نەبێت (جناية) نیە لە فیقهی ئیسلامیدا هەروەها پێچەوانەكەشی.

٢_ جیایی (التباين) : جیابوون لە نێوان هەموو دوو زاراوەیەك دا ئەوەیە: هەر یەكە لەو دووانە نەچەسپێت بەسەر چەمكی زاراوەكەی تردا ، كەوابوو هەر شتێك كە یەكێكیان بیگرێتەوە. . ئەوی تریان نایگرێتەوە ، هەروەها پێچەوانەكەشی ، لە چەسپاندنەكانی جیایی و جیابوون لە زاراوە فیقهی و یاسایی یەكاندا ئەمانەن:

أ _ تاوانبار و بێتاوان (المجرم) و (البريء) : یەكەم كەسێكە كە كارێكی تاوانكاری كردبێت بە پێچەوانەی دووەمەوە.

ب_ ڕاستی و درۆكردن ، یەكەم :پڕاو پڕبوونی هەواڵە بۆ واقیع.

دووەم: نەگونجانی هەواڵە لەگەڵ واقیعدا.

---

[1]. ماددەكانی (٢٣ _ ٢٧) .

ج_ پوچ و خراپ (الباطل والفاسد) لای حەنەفیەکان ، یەکەم: ئەوەیە نادروست و نارەوا بێت لە بناغە و وەسفەکانیدا. [1]

دووەم: لە بناغەدا رەوایە بەڵام بەهۆی هەندێك و وەسفەوە بە نارەوا دادەنرێت ، وە لەسەر ئەم جیاوازی یە کۆمەڵێك بابەتی فیقهیان رێکخستووە لەوانە : چوونە لای ژن لە هاوسەر گیری پوچدا بە تاوانی زینا دەژمر نرێت. وە هیچ ئاسەوارێکی شەرعی لەسەر دروست نابێت ، بە پێچەوانەی چوونە لای ئافرەت لە هاوسەرگیری هەڵوەشاوەوە دا ، بێگومان ئەم ئاسەوارە شەرعیانەی خوارەوەی لێدەکەوێتەوە:

١_ ئەگەر بەهۆی ئەم چوونە لاوە کۆرپەیەك دروست بوو. . پشتەکەی شەرعی دەبێت ، مافی شەرعی خۆی هەیە وەك هەموو منداڵێکی شەرعی تر ، ئەرکی لەسەرە وەك مندالآنی تر بەرامبەر باوك و دایکی.

٢_ دەبێت ئافرەتەکە ئەگەر لاقەکرابوو مارەیی هاو وێنەی بۆ بدرێتێ ئەگەر مارەیی بۆ دیاری نەکرابوو ، ئەگەر مارەیی بۆ دیاری کرابوو. . ئەوا لای کەمی ئەو مارەییەی دەدرێتێ یان لای کەمی مارەیی هاو وێنەی ، وە یاسادانەری عێراقی کاری بەمە کردووە لە ماددەی (٢٢) ی یاساکانی باری کەسێتی دا ، وە پێویست بوونی ئەم مارەییە سەرەڕای پووچەڵی هاوسەر گیریەکە و پێویست بوونی جیاکردنەوە لە نێوان ژن و مێرددا. . بینات نراوە لەسەر بناغەی بژاردنی مەعنەوی لە بری زیانی ئاکاری.

٣_ پێویستە لاقەکراوەکە چاوەڕێ بکات لە بەرواری جیابوونەوەیانەوە (ژن و مێرد) .

٤_ لاقەکەری ئافرەتەکە ناچێتە ژێر بڕیاری ئەم ئایەتەوە (الزانية والزاني فاجلدوا كل واحد منهما مئة جلدة) [2] واتە : ئافرەت و پیاوی زینا کەر هەریەکێك لەوان سەد قامچی لێ بدەن ، چونکە چونە لای ئافرەتەکە بە گومانی رەوایی (حەلآلی) یەوە بووە بەهۆی بوونی گرێبەستی هاوسەرییەوە سەرەڕای پووچەڵ بوونی.

---

[1]. تبيين الحقائق شرح كنز الدقائق للزيلعي (عثمان بن علي ب ٤ ل ٧٣) .

[2]. سورة النور/٢.

٥_ ژن و ژنخوازی پێ دەچەسپێت ، کەوابوو لەسەر لاقەکەرەکە ئەسڵ و لقەکانی ئافرەتەکە (دایك و کچ و نەنك. . هتد) بە هەمان ئەسڵ و لقەکانی لاقەکەرەکە لەسەر لاقە کراوەکە یاساغ دەبێت.

د_ **توانا نەبوو (عدیم الأهلیة) و توانا تەواو (کامل الأهلیة)** : بەهۆی جیابوونیانەوە کۆمەڵێك بابەتی فیقهی دێتە ئاراوە ، لەوانە: هەڵسوکەوتی کەسی یەکیان بەتاڵە ، و لەڕووی تاوانکارییەوە لێپرسینەوەی لەگەڵ ناکرێت بەپێچەوانەی توانا تەواوەوە .

هـ_ **هەڵسوکەوتی یاسایی و ڕووداوی یاسایی**: پەیوەندی لە نێوان هەردوو دژی لە یەك جیادا کە جیابوونەوەی هەمەکی بن ، جیابونێکی هەندەکیە ، لە تاکەکاندا کۆدەبنەوە لە چەند تاکی تردا جیادەبنەوە. بۆ نمونە: نا پووچ و نا هەڵوەشاوە لە گرێبەستی دروستدا کۆدەبنەوە ، بەڵام نا پووچ بێ ناهەڵوەشاوە لە گرێبەستی خراپدا بەدی دێت هەروەك ناخراپ بێ ناپووچەڵ لە گرێبەستی پووچەڵدا دێتە دی لای کەسانێك کە ئەم دوو زاراوەیە (الباطل والفاسد) بە جیا دەزانن.

٣_ **گشتی و تایبەتی ڕەها (العموم والخصوص المطلق)** : ئەگەر دوو زاراوەی فیقهی یان یاسایی بە ڕاستی هەندێك تاکی گرتەوە ، ئەگەر گرتنەوەی یەکێکیان هەمەکی بوو و گرتنەوەی ئەوەی تر هەندەکی. . ئەوە یەکەمیان بەڕەهایی گشتیترە و دووهەمیان تایبەتتر. پێوەری جیاکردنەوەش ئەوەیە: تایبەتی ڕەها نایەتەدی بەبێ گشتگیری ڕەها ، بە پێچەوانەی گشتی ترەوە (الأعم) کە بێگومان هەروەکو لەگەڵ تایبەتترا کۆدەبێتەوە هەمدیسان هەندێجار لەگەڵ جگە لەودا کۆدەبێتەوە وەك ئەم نمونانەی خوارەوە:

أ_ دەسکاری یاسایی و گرێبەست ، یەکەم گشتی ترە بە ڕەهایی لەگەڵ گرێبەستدا کۆدەبێتەوە و بێ ئەویش ، هەروەك لە ویستی تەنهادا ، بەڵام ئەستەمە کە گرێبەستێکی دروست هەبێت دەسکاریەکی یاسایی نەبێت.

ب_ تاوان و کوشتنی بە ئەنقەست و دوژمنکارانە: تاوان تایبەت ترە بە ڕەهایی ، لەبەر ئەوەی لەگەڵ کوشتندا کۆدەبێتەوە لە تاوانێکی تردا لێی جیادەبێتەوە ، وە کوشتنی بەئەنقەستی دوژمنکارانە تایبەت ترە بە ڕەهایی چونکە بێ وەسفی تاوانکاری نایەتەدی.

ج_ تەڵاق و داڕنین (الطلاق والخلع) : یەکەم: گشتی ترە بە ڕەهایی. دووەم: تایبەتترە بە ڕەهایی ، کەوابوو هەموو داڕنینێك تەڵاق دانە لای جەماوەری زانایانی شەریعەت بێ

پێچەوانەکەی ، چونکە تەلاقدانێکە لە بەرامبەر خستنە بریەك ژنەکەی لە گەردنی دەگرێت کە بیدات یان کەسێك لە جێگەی ئەو دەیدات بە مێردەکە لە بەرامبەر تەلاقدانەکەوە ، هەندێجار جیابوونەوە لە نێوان ژن و مێرددا بە تەلاق دەژمێردرێت و دارێنی نیە وەکو تەلاقی بێبەرانبەر.

٤_ **گشتی بوون و تایبەت بوون لە ڕوویەکەوە**: ئەم بەشە لە چوار دانەپاڵەکەیە (النسب الأربع) ، جێبەجێکردنەکانی زۆرن بە پێی بەدیهاتن و کەمن بە پێی چەمك ، لە نمونەکانی: سامان و مافی کەسی: (مال) ئەوەیە نرخێکی کەرەستەیی (ماددی) هەبێت ، وە مافی کەسی (الحق الشخصی) ئەوەیە کە لە گەردنی کەسێکی تردا بێت ، ئیتر جیاوازی نیە دارایی بێت یاشتی مەعنەوی. وە (مافی ڕاستەقینە و بەرچاو) دەسەلاتێکی ڕاستەوخۆی کەسێکی دیاریکراوە بەسەر شتێکی دیاریکراوەوە ، سەر پشکی دەکات کە دەستکاری بکات و بەکاری بهێنێت و سوودی لێ وەربگرێت و هەڵی بگرێت ، کەواتە مانای مال بەسەر ئەم مافەدا دەچەسپێت بێ مافی کەسی ، هەروەك مافی کەسی بێ مال بەدیدێت لە سەرپەرشتیاری و سەرسپاردەیی و شیرخواردن و مافە هاوسەریەتیەکانی نادارابییەکان و وێنەی ئەوان. جا هەریەکە لە مافی کەسی و مافی ڕاستەقینە لەو ڕووەوە کە گشتگیرە گشتی یە و لەو لایەنەوە کە گیراوەتەوە تایبەتە. پەیوەندی لە نێوان هەردوو دژەکەیاندا گشتی بوون و تایبەت بوونە لەڕوویەکەوە.[1]

## دووەم : پەیوەندی لۆژیکی لە نێوان زاراوە یاسایی یەکاندا بە پێی بەدیهاتن:

هەرچوار پەیوەندی یە ناو براوەکە بەپێی چەمکەکان بوون ، بەلام پەیوەندی بە پێی بە دیهاتن لە نێوان ڕووداوەکاندا دەبێت ، وەکو لەم ڕوونکردنەوەی خوارەوەدا بەرچاو دەکەوێت :

١_ **یەکسانی**: یەکسانی لە نێوان ئەو ڕووداوانە دەبێت کە پەیوەستیان لە نێواندا هەیە بە جۆرێك: هەر ڕووداوێك پەیوەست و پەیوەست کراو دەبێت بە گوێرەی ڕووداوەکەی تر لە

---

[1]. تذهیب المنطق ، سەرچاوەی پێشو ل ١٨.

چەسپاندنەکانی یەکسانی لە نێوان ڕووداوەکاندا بە پێی بوون و بەدیهاتن. بوونی مردن بۆ مرۆڤ . نەمانی ئەستۆ دارییەکەیەتی ، دارایی لەگەڵ لەدایك بوونی مرۆڤدا دێتە دنیاوە ، وە بە مردنی دەمرێت ، هەرکامێك لە ڕووداوەکان بەدیهات. . ئەوەی تریان بەدی دێت ، کەواتە ڕووداوی مردن. . ڕووداوی کۆتایی هاتنی ئەستۆبەندیە ، هەروەها بەپێچەوانەوە. چونکە ئەستۆی دارایی لەناو ناچێت بەمردن نەبێت ، وە لەمپەرەکانی تری لێهاتویی کاری تێ ناکات ، وە ئۆباڵ و ئەستۆی میرات لێبراو ناگوێزرێتەوە بۆ میرات بەرەکەی ، لەسەر ئەم ڕاستی یە لۆژیکییە ئەو یاسایە بنیات دەنرێت کە دەڵێت: میرات بەر پابەند ناکرێ لە ڕووی شەرع و یاساوە بە دانەوەی قەرزی میرات براوەکەی لەوماڵەی نەبێت کە بەجێی دێڵێت. ئەگەر هیچ شتێك لە ماڵی بەجێ نەهێڵابوو یان ئەوەندە ماڵی بەجێ نەهێشتبوو کە بۆ دانەوەی ئەو قەرزانەی لەسەر ماڵە جێ هێڵراوەکەبوو. . پێویست نیە لەسەر میرات بەرەکە هەموو قەرزەکە یان هەندێکی بداتەوە ، بە.پێچەوانەی فیقهی ڕۆژ ئاواوە ، لە یاسای میراتی فەرەنسیدا هاتووە: لەسەر میرات بەر پێویستە قەرزە ماوەکان بداتەوە ئەگەر میراتەکە بەشی دانەوەی نەکرد ، چونکە ئەستۆی میرات بەر درێژبوونەوەی ئەستۆی میراتکە لێبراوەکەیەتی.[1] بەڵام مافی هەیە کە وازبهێنێت لە میراتەکە لە بەردەم دادوەردا و لەو کاتەدا پابەند ناکرێت بە دانەوەی قەرزەکانی میرات لێ براوەکەی ، لە شەریعەتی ئیسلامیدا ئەستۆی هەموو کەسێك سەر بەخۆیە لە ئەستۆی کەسی تر ، لەگەڵ لەدایك بوونیدا لە دایك دەبێت و بە کۆچی دوایی مرۆڤەکەش کۆتایی دێت. پەیوەندی لە نێوان دوو دژی دوو شتی یەکسان بوودا یەکسان بوونە. وە لەو نمونە باسکراوەدا دژی مردن ژیانە ، وە دژی نەمانی ئۆباڵ و ئەستۆ. . مانەوەیەتی ، پەیوەندی لە نێوان مانەوەی ژیان و مانەوەی ئەستۆدا. . لە ڕووی بەدیهاتنەوە یەکسانی یە ، هەر کاتێك یەکێکیان هاتە دی. . ئەوی تریان دێتە دی.

**٢_ جیایی بە پێی بە دیهاتن:** جیایی و جیاوازییەکە بە پێی بەدیهاتن لە نێوان دوو ڕووداودا دەبێت کە نەگونجان و لێك دوورکەوتنەوە و جیاوازی لە سروشتدا لە نێوانیاندا هەیە. بەجۆرێك کە بێ گومان بەدیهاتنی یەکێکیان نەبوونی ئەوی تریانە. وە ئەگەر نەبوونی یەکێکیان بوویە هۆی بوونی ئەوی تریان ئەوا پەیوەندیەکە لە نێوانیاندا بەگژداچوون و

[1]. مصادر الحق للسنهوری ب ٥ ل ١٠.

دژایەتیە. کەوابوو دوو دژ پێکەوە کۆنابنەوە و ناشبێت هەردووکیان نەبن ، کەواتە دژایەتی تایبەت ترە بە ڕەهایی لە جیابوون ، هەندێجار پەیوەندییەکە بە جیابوونە نەك دژایەتی بوون ، بەو جۆرە کە نەگونجێت بەیەکەوە کۆبکرێتەوە ، بەلاّم دەگونجێت پێکەوە لە بابەتێکدا نەبن. وە لە جێبەجیّ کردنەکانی جیایی بەپێی بەدیهاتن لە نێوان دوو ڕوودلوی یاساییدا ئەمانەی خوارەوەن:

أ _ **ڕوداو:** تاوانێکی بە ئەنقەستانەیە کە هەموو پایە و مەرجەکانی هەبن و ڕێگرەکانی نەمێنن لەگەلّ نەبوونی شیانی ئەنجامدەرەکەی بۆ سزا ، بیّ بوونی بەهانەیەك یان کات و شوێنێك ئەستۆ پاکی نیشان بدات. کەوابوو ئەم دوو ڕووداوە جیان ، ناگونجێت کۆبکرێتەوە لەیەك بابەتدا.

ب_ نەبوون و سەلیقە (العدوم والملكة) : ئەم دووانە لێکتر جیان بە شێوازێکی تایبەت ، وەك پەیوەندی لەنێوان زانین و نەزانین: نەزانین نەبوونی زانینە لەبوونەوەرێکدا کە بتوانێت فێری زانست ببێت ، لەبەرئەوە نەزانین بۆ جگە لە مرۆڤ بەکار ناهێنرێت لە نێوان دروست کراوە زیندووەکاندا. هەروەها کوێری و چاوساغی بە شتێك ناوترێت کە کوێرە بەمەرجێك ئامادەیی چاو ساغی هەبێت ، لەبەر ئەوە وشەی کوێر نابڕدرێت بەسەر جگە لە مرۆڤ و ئاژەڵدا ، ئەم دووانەش دووبارە لەیەك جیان بە شێوازێکی تایبەت.

ج_ **دوو ناتەبا:** ئەم دووانەش هەمدیس لە پێودان و شێوازێکی تایبەتن ، هەردوکیان وارسن و لەیەك شوێندا نابن و لە ڕووی سروشت و چیەتەوە جیاوازن ، سەرەڕای ئەوە کۆدەبنەوە بە جۆرێکە هەریەکێك لەوان دووەمەکە تەواو دەکات وەك سارد و گەرم لەوزەی ئەلەکترۆنیدا. وە لەنێوان دوو دژی دوولێکجیا کە لەڕووی هەمەکیەوە لێك جیان. . لێك جیاییەکی هەندەکی هەیە کە مانای گشتی بوون و تایبەت بوونە لە ڕوویەکەوە و کۆدەبنەوە و جیادەبنەوە وەك تاوانبارکردن و بیّ تاوان دەرکردن ، کە هەردووکیان لێك جیان ، کۆنابنەوە بەیەکەوە لە چەمك و لەبابەتێك دا و بە یەك چۆنیەتی. ° وە هاتنەدی ناتاوانبار کردن لە بیّ تاوان دەرکردن دا. . نابێتاوان دەرکردن لە تاوانبارکردندا.

٣_ **گشتی بوون و تایبەت بوونی ڕەها بە پێی بەدیهاتن:** جاری وا هەیە پەیوەندیەکە لە نێوان دوو ڕووداوەکەدا گشتی بوون و تایبەت بوونی ڕەهایە ، و هەرکاتێك

تایبەتتری ڕەها بەدی هات. . لەگەڵیدا گشتی تری ڕەها بەدی دێت بێ پێچەوانەی هەمەکی.
له جێبەجێ کردنەکانی ئەمە له زاراوە یاساییەکاندا:

**أ_ هەڵەی شارستانی (الخطأ المدنی) و هەڵەی تاوانکاری (الخطأ الجنائی) :**

**دووەم: تایبەتترە بەڕەهایی و یەکەم:** گشتی ترە بەڕەهایی ، هەرکات هەڵەی تاوانکاری بەدی هات. . هەڵەی مەدەنی بەدی دێت ، بێ پێچەوانەی هەمەکی ، نهێنی ئەمە ئەوەیە کە هەڵەی تاوانکاری یاسایی لەگەڵ هەست کردن و پێشێل کردنی ئەرکێکی یاسایی یە لەگەڵ هەست کردن و پە ی پێبردنی پێشێل کارەکە بەو کارە[1] ، ئەرك و پێویستی لە هەڵەی تاوانکاریدا بە دەقێکی تایبەت دیاری دەکرێت لە دەقەکانی یاسای سزاکان بۆ ڕەچاوکردنی بنەمای ڕەوابوون: (لا جریمة و لا عقوبة إلا بنص) واته: نه تاوان هەیە نە سزا مەگەر بەبوونی دەقێك. بەڵام پێویستی لە هەڵەی شارستانیدا. . ئەوەیە کە: بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ بەدەقێکی یاسایی دیاری دەکرێت بە ڕەهایی ، جیاوازی نیە یاساکە لە یاسا سزاییەکان بێت یان نا ، بەپێی ئەم بناغەیە: هەر کەس هەڵەیەکی تاوانکاری کرد بەوە دەدرێتە قەڵەم کە ئەو هەمدیس هەڵەیەکی مەدەنی کردووە ، چونکە ئەو ئەرکێکی یاسایی پێشێل کردووە بە پێچەوانەی پێچەوانکەیەوە. ئەگەر کەسێك ئەرکێکی پێشێل کرد کە بە دەقێکی تایبەت لە یاسا تاوانکاریەکاندا دیاری نەکرابوو. . بەوە دەدرێتە قەڵەم کە هەڵەیەکی مەدەنی ئەنجامداوە ، بەڵام هەڵەی تاوانکاری نادرێتە پاڵ.

ب_ پەیوەندی لە نێوان هەڵەی مەدەنی لە فیقهی ئیسلامیدا و هەڵەی مەدەنی لە فیقهی ڕۆژئاواییدا : گشتی بوون و تایبەت بوونی ڕەها بە پێی بەدیهاتن: هەر کاتێك هەڵە بەدی هات لە چەمکی ڕۆژئاوایی دا. . هەڵە بەدی دێت لە چەمکی ئیسلامی دا ، بەبێ پێچەوانەی هەمەکی ، نهێنی لەوەدا ئەوەیە: کە هەڵە لە فیقهی ڕۆژئاواییدا مەرجە دوو پایەی تێدا بێت ، **یەکەمیان:** ماددی (یان بابەتی) ئەویش بەجێ نەگەیاندنی ئەرکێکی یاسایی یە ، **دووەمیان:** مەعنەوی (کەسی) ، ئەویش ئەوەیە کە پێشێل کارەکە پەی بەوە ببات کە ئەو پێشێلی ئەرکێکی یاسایی کردووە. بەڵام لە فیقهی ئیسلامیدا تۆخمی مەعنەوی (کەسی) پێویست نیە بۆ هەڵەی مەدەنی ، بەڵکو تەنها بوونی پایەی ماددی پێویستە کە ئەویش

[1]. اصول الإلتزامات للدكتور سليمان مرقص ل ٣٦٨.

بەجێ نەهێنانی ئەركێكی شەرعیە ، جا لەسەر ئەم جیاوازی یە ئەوە بنیات دەنرێت ئەگەر لێنەهاتویەك (شێتێك ، منداڵێك . . . هتد) ماڵی كەسێكی لەناوبرد. . پێویستە ئەو زیانە لە ماڵی زیان دەرەكە ببژێردرێتەوە بەپێی فیقهی ئیسلامی ، لەبەر بوونی پایە ماددییەكە كە پێشێل كردنی ئەركێكی شەرعی یە (كە هەڵسانە بە كارێكی ناشەرعی) ، وە پرسیار ناكرێت لە بارەی بژاردنەكەوە وەك بنەمایەكی بنەڕەتی لە فیقهی رۆژ ئاواییدا لەبەر نەبوونی پایە مەعنەویەكە كە هەست كردنی پێشێلكەرەكەیە بەوەی كە ئەركێكی یاسایی پێشێل كردووە ، كەوابوو پێكهێنەرەكانی بەرپرسیارێتی كەمتەرخەمی لە فیقهی ئیسلامیدا لە ناوبردنە ڕاستەوخۆكان دا ( كاری نارەوا + زیان + پەیوەندی هۆكارێتی) كردەوەی لێنەهاتووی نا شەرعی لە سیفەتی نارەوابوون رووت ناكرێتەوە ، لەبەر ئەوەی كەسێك ئەنجامی داوە كە هیچ هەست و زانینێكی نیە. هەروەك تاوان سیفەتی تاوانكاری ون تاكات ئەگەر ئەنجامدەرەكەی كەسی نەشیاو بوو. . ئەوە هەیە بەرپرسیار نیە وەك تاوانكارێك ، وە ئەوەی شایانی ناوبردنە هیچ جیاوازی یەك نیە لە نێوان یاسای ئیسلام و یاسای رۆژ ئاواییدا لە هەڵەی تاوانكاریدا. كەواتە پێویستە هەردوو پایەكە هەبن ، هەروەها جیاوازییان لە نێواندانیە لە هەڵەی شارستانیدا ئەگەر هەڵەكەر زیانی بەشێوەیەكی ناڕاستەوخۆ بوو. ئەگەر ئاژەڵی كەسێك ماڵی كەسێكی لەناوبرد. . بژاردنەوە پێویست نیە لەسەر خاوەن ئاژەڵەكە بەمەرجێك كەمتەرخەمی نەكرد بێت لە ئاگاداری ئاژەڵەكەدا و رێی لێ گرتبێت لە ناوبردنی ماڵی كەسەكە ، هەروەها جیاوازی لە نێوان هەردوو فیقهەكەدا نیە لەدۆخێكا كە هەڵەكە نەرێنی بێت ، چونكە ئەم جۆرە هەڵەیە وێنا ناكرێت لە كەسێكەوە كە هەست و پەی پێبردنی نەبێت.

رێچكەی فیقهی ئیسلامی ڕاست و دادگەرانەیە بە نیسبەت زیان لێكەوتوانەوە ، لە ناڕاستەی رۆژ ئاواییدا پێشێل كردن و ناهەقی كردنە بەرامبەر مافیان ، پاش ئەوەی فیقهی رۆژئاوایی هەستی كرد بەم ناهەقی كردنە. . هەندێك لە یاسازانان لە فەرەنسا ڕایان وایە كە دەبێت رێز بگیرێت لەبەر پرسیارێتی كەسێك كە توانای جیا كردنەوەی نەبێت ، ئەویش بە پەنابردنە چەند هۆكارێك بۆ نەهێشتنی ئەم ستەم و پێ شێل كردنە[١] :

---

[١]. الاستاذ ابراهيم الدسوقي ، المسؤلية بين التقييد والإ طلاق ل ٧٨.

١_ هەندێك روویان كردۆتە بیرۆكەی هەڵگرتنی ملكەچیەك كە پاڵ نادات بـە هەڵـەوە لـە بڕیاردانی بەرپرسیارێتی مەدەنی كەمتەرخەمیەوە.

٢_ هەندێكی تر پەنایان بردۆتە بەر بیرۆكەی پێویسـتبوونی یارمـەتی دان كـە ماناكـەی ئەوەیە: كاتێك كەسێك زیان لە كەسێكی تر دەدات. . ئەركی سەرشانی كەسی یەكەمـە كـە یارمەتی كەسە دووەمەكە بدات و زیانەكەی بۆ ببژێرێت.

٣_ گروپێكی تر بیرۆكەی دادگەری دەخەنە روو كە لەم دۆخەدا ئەوەیە: پێویستە زیـان لێكەوتووەكە قەرەبوو بكرێتەوە.

٤_ ڕێچكەی چوارەم كە بەرپرسیارێتی كەسە جیانەكەرەوەكە لەسەر خودی كارە زیان بەخشەكە دادەمەزرێنرێت واتە: لەسەر لادان لە ڕێڕەوی كەسـی ئاسـایی ، ئـەوەش لەسـەر بناغـەی دەسـت درێـژی نەكردنـە ، بـەهۆی بـارودۆخی نـاوخۆیی بـۆ ئەنجامـدەری كـارە زیانگەیەنەرەكە ، ئەمەش لەگەڵ ڕێچكەی فیقهی ئیسلامیدا گونجاوە.

٥_ ڕێچكەی پێنجەم پشتی بەستووە بە بیرۆكەی گەرەنتی لەسەر ئەو بنەمایە كـە ئـەو كارەی لەكەسە ناهەراشەكەوە ڕوویداوە لە سنوری خۆیدا دەست درێژكاریە بۆ سەر مافەكان یان بەرژەوەندی یە ڕەواكانی زیان لێكەوتوتووەكە ، لەسەر ساغی جەستەیی و سامانەكانی ، جا كاتێك مافێك هەیە. . بێگومان پاراستنی ناوەسـتێت لەسـەر بـارودۆخی كەسێتی ئـەو كەسەی دەست درێژی دەكاتە سەر ئەم مافە ، ئەم ڕێچكەیە نزیكە لە ڕێچكەی چـوارەمەوە ، شـتێكی باشـی كـردووە یاسـادانەری عێراقـی كاتێـك ئـەو رایـەی وەرگرتـووە كـە فیقهـی ئیسلامیی لەسەر جێگیر بووە لە دانپێنانی بەرپرسیارێتی كەمتەرخەمی بۆ كەسی لێنەهاتوو و بەس بوونی توخمی ماددی لە هەڵەدا: ئەویش پێشـێل كردنـی ئـەركێكی یاسـایی یـە كـە خۆی لە كارە زیانبەخشەكەدا دەنوێنێت (یان كاری نـاڕەوا) كـە نـاوی نـاوە (دەسـت درێـژ كاری) لە ( م ١٨٦) بڕیاری داوە بە بەرپرسیارێتی. ناهەراسی لە (م ١٩١) ، وە داوا لە یاسـا دانەر دەكەین لە جیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا كە شوێنی بكەوێت. دوو دژی گشتی بـوون و تایبەت بوونی ڕەها بە پێی بە دیهاتن گشتی بوون و تایبەت بوونی ڕەهـا هەمـدیس ، بـەلاّم لەسەر ڕێگەی پێچەوانە ، كە وابوو دژی تایبەتتر: گشتیتری ڕەهایە ، دژی گشتیتری ڕەهـا. . تایبەتترە بە ڕەهایی. بۆ نمونە: نەبوونی هەڵەی تاوانكـاری گشـتی بـەڕەهایی و نـەبوونی هەڵەی مەدەنی تایبەتترە بەڕەهایی ، جا هەر كات هەڵەی مەدەنی بەدی نـەهات. . هەڵـەی

تاوانكاریش بەدی نایەت بیٚ پێچەوانەی هەمەكی ، جاری واش هەیە هەڵەی تاوانكاری بەدی نایەت ، سەرەڕای بەدی هاتنی هەڵەی مەدەنی هەروەك لە زیان گەیاندن بە مالّی كەسانی تر بیٚ ویستێكی تاوانكاری. هەروەها هەركاتێك هەڵەی مەدەنی لە فیقهی ئیسلامیدا نەبوو. . لە فیقهی رۆژ ئاوایشدا نابێت بیٚ پێچەوانەی هەمەكی ، هەندێجار هەڵەی مەدەنی نابێت لە فیقهی رۆژ ئاواییدا ، كەچی لە فیقهی ئیسلامیدا دەبێت وەك لە لەناوبرنی مالّی كەسانی تر لەلایەن شێتەوە یان منداڵەوە.

ج_ هۆكارەكانی رەوابوون و رێگریەكانی بەرپرسێتی تاوانكاری: هۆكارەكانی رەوابوون تایبەترە بەرەهایی ، رێگرەكانی بەرپرسێتی تاوانكاری گشتیترە بە رەهایی بەپێی بەدیهاتن ، كەواتە هەموو هۆكارێك لە هۆكارەكانی رەوابوون رێگرە لە بەرپرسێتی تاوانكاری بیٚ پێچەوانەی هەمەكی ، جا بەرگری شەرعی هۆكاری رەوا بوونە و رێگرە لە بەرپرسیارێتی تاوانكاری ، هەموو رێگرێك لە بەرپرسیارێتی تاوانكاری هۆكاری رەوابوونە ، چونكە شێت بوونی ئەنجامدەرەكە تاوانەكەی لە سیفەتی تاوانی رووت ناكاتەوە ، كەوابوو كارەكە ناسرێتەوە و وەك تاوان دەمێنێتەوە ، بەلاّم شێتی رێگرە لە لێپرسینەوەی ، لەم جیاوازی یەوە ئەوە دەردەكەوێت كە ئەنجامدەری كاری تاوانی لە دۆخی بوونی هۆكاری رەوا بوون دا. . لیٚ پرسینەوەی لەگەلّ ناكرێت نە لە رووی تاوانكاریەوە نە لە رووی شارستانییەوە ، بە پێچەوانەی دۆخی بوونی رێگری بەرپرسیارێتی تاوانكاری بیٚ فاكتەری رەوابوون ، كەواتە شێت ئەگەر بیٚ بەهانەی شەرعی ئۆتۆمبیلی كەسێكی سوتاند وەك تاوانكارێك پرسینەوەی لەگەلّ ناكرێت ، بەلاّم پێویستە لە مالّەكەی زیانی زیان لێكەوتووەكە ببژێردرێت.

دوو ناكۆك (المتعارضان) و دوو دژ (المتناقضان) : زۆرێك لە زانایانی یاسا ئەم دوو زاراوەیان لیٚ تێكەلّ بووە ، دەربڕینی دژبوو لەبری ناكۆكبوون بەكاردەهێنن ، دژ بوون گشتی ترە لە ناكۆك بوون ، چونكە دەگونجێت دوو ناكۆك كۆبكرێتەوە و یەكێكیان بخرێتە پێش یەكێكی تریانەوە و كار بە لەپێشترەكە بكرێت و لیٚ پێش كەوتووەكە پشت گویٚ بخرێت لەو رووەوە كە دوو دژ كۆ نابنەوە بەیەكەوە و پێكەوە نەبوونیشیان نابێت ، وە دوو دژ هەمیشە لێك جیان وەك بەر پرسیارێتی كەسێك و نابەرپرسیارێتی كەسێك لە یەك بابەت دا و بەیەك چۆنیەتی ، بەلاّم دوو ناكۆك دەكرێت پێكەوە كۆبكرێتەوە ، كەوابوو لەو كاتەدا

لێك جیابوون بەدی نایەت. درێژەی ئەم باسە خوا یاربێت لە باسکردنی بنەماکانی باوەڕکردندا دێت.

هـ_ ڕێگرەکانی بەرپرسیارێتی تاوانکاری و ڕێگرەکانی سزا: هەموو ڕێگرێکی بەرپرسیارێتی تاوانکاری ڕێگرە لە سزا ، بە بێ پێچەوانەی هەمەکی ، ڕێگری سزا لەوانەیە هەندێجار لەمپەڕ نەبێت لە بەرپرسیارێتی تاوانکاری ، وەك: وەستاندنی جێبەجێکردن و لێبوردنی گشتی یان تایبەت پاش دەرچوونی بڕیار بە تاوانبارکردن و سزا.

و_ پاڵدان و پەیوەندی لە نێوان قەرزاری و بەرپرسیارێتیدا: هەر کات بەرپرسیارێتی بەدی هات. . قەرزاری بەدی دێت بێ پێچەوانەی هەمەکی ، چونکە هەندێجار قەرزاری بەدی دێت بێ بەرپرسیاری ، هەروەك لە دۆخی پابەندبوونی سروشتیدا (نەمانی سکاڵای ماف بە هۆی بەسەر چوونەوە) ، چونکە قەرزاری بریتی یە لە: سەرقاڵبوونی ئەستۆ بە مافی کەسی ترەوە. وە ئەم سەرقاڵبوونە بە جێگری دەمێنێتەوە سەرەڕای پووچەڵ بوونەوەی داواکە بەهۆی بەسەر چوونەوە ، کەوابوو بەسەرچوون داوا ناهێڵێت ، بەڵام ماف دەمێنێتەوە ، بەو بەڵگەیەی کە قەرزار لە پابەندبوونی سروشتیدا ئەگەر هەستا بە دانەوەی قەرزەکە. . مافی نیە داوای گەڕانەوەی لێبکرێت بە بەڵگەی ئەوەی کە پابەندبوونەکەی سروشتی یە ، و هەر کات بەرپرسیارێتی بەدی هات. . قەرزاریش بەدی دێت ، چونکە یەکەم تایبەترە بە ڕەهایی لەو ڕووەوە کە ئەو بریتی یە لەوەی قەرزار داوای دانەوەی قەرزی لێدەکرێت بە ئارەزووی خۆی ، ئەگینا ئەگەر قەرزەکەی نەدایەوە زۆری لێدەکرێت.

بێگومان هەندێك لە ڕاڤەکەرانی یاسا[1] کەوتوونەتە هەڵەوە لەوەدا کە قەرزاری و بەرپرسیارێتیان بە بەشێك لە پێکهێنەرەکانی پابەندبوون داوەتە قەڵەم ، ئاشکرایە ئەم دووانە بەدی نایەن هەتا پابەندبوون نەبێت ، وە پێکهێنەرەکانی شت لە پێش بوونیەوەن ، ئەم هەڵەیەش لە نەزانینی لۆژیکەوە دروست بووە.

ز_ گشتی بوون و تایبەت بوون لە ڕوویەکەوە بە پێی بەدی هاتن: ئەم پەیوەندی و پاڵدانە بەپێی بەدیهاتن لە دوو ڕووداودا دەبێت: کۆدەبنەوە لە هەندێ بابەتدا و جیادەبنەوە

---

[1]. لەوانە الدكتور عبدالحي حجازي في كتابه النظرية العامة الإلتزام بە پێی یاسای کوێتی : ب ١ ل ٩٣ پاش ئەو.

لە چەند باسێكی تردا. هەندێ لە جێبەجێكردنەكانی: پەیوەندی لە نێوان بارودۆخە توندەكاندا كە هۆكاری توندكردنی سزا و بەهانە یاساییە یەكانە یان بارودۆخی سوك كە هۆكاری سوك كردنی سزایە: كۆدەبنەوە كە گەلێك تاوانی كوشتنی ئەنجامداوە بۆ رێگە خۆشكردن بۆ ئەنجامدانی دزییەك ، پاشان تاوانی دزی ئەنجامدا ، هاوكاتبوونی كوشتن لەگەڵ دزیدا دۆخێكی توندە و سزای سێدارەی لەسەرە لە یاسای عێراقیدا هەروەك لە برگەی (ج) لە ماددەی (٤٠٦) دایە لە یاسای سزاكانی عێراقی[1] كە دەقەكەی سزای سێدارە دیاریدەكات : (ح) : ئەگەر كوشتن ئەنجامدرا بۆ دەسپێكی تاوانێك یان كەتنێك كە سزاكەی بەندكردن بوو بە ساڵێك بەرەو ژوور یان بۆ رێخۆشكردن بۆ ئەنجامدانی یان بۆ جێبەجێ كردنی یان بۆ ئاسانكاری بۆ ئەنجامدەرەكەی و پەنادانی بۆ راكردن یان رزگار بوونی لە سزا. لە بارودۆخی كۆبونەوەی دۆخی توند و سوكدا لەسەر دادوەر پێویستە كە یەكخستن ئەنجام بدات لە نێوان سزا كاندا و ، دۆخی مام ناوەند هەڵبژێرێت ، چونكە باشترینی كارەكان ناوەندەكەیانە ، وە لەبەر ئەوەی دادگەری رەچاوكردنی هەردوو دۆخەكە دەخوازێت و دۆخی توند بەتەنها بێ دۆخی سوك بەدی دێت هەروەك لە تۆ برگەكانی ماددە ناو براوەكە هاتووە ، ئەگەر ئەنجامدەرەكە پێگەیشتووی عاقڵی سەرپشككراو بوو. . دۆخی سوككراویشە بێ دۆخی توند دێتە دی هەروەك لە ماددەی (٤٠٩) ی یاسای سزاكانی عێراقیدا هاتووە: (یعاقب بالحبس مدة لا تزید علی ثلاث سنوات من فاجأ زوجتە أو إحدی محارمه في حالة تلبسها بالزنا أو وجودها في فراش واحد مع شریكها فقتلهما في الحال أو قتل أحدهما أو اعتدی علیهما أو اعتداء أسفر إلی الموت أو إلی عاهة مستدیمة) : سزا دەدرێت بە بەندكردن بۆ ماوەیەك كە زیاتر نەبێت لە سێ ساڵ. . كەسێك لەناكاو خێزانەكەی یان یەكێك لە مەحرەمەكانی ببینێت لە دۆخی زینادا یان لەناو جێگەدا لەگەڵ هاوجێكەیدا ، دەست بەجێ هەڵسێ بە كوشتنی یان یەكێك لەو دوانە بكوژێت یان هەر دوكیان ، یا دەست درێژ بكاتە سەر هەردوكیان یان سەر یەكێكیان دەست درێژكارییەك ببێتە هۆی مردن یان كەم ئەندام بوونێكی هەمیشەیی.

---

[1]. ژمارە (١١١) بۆ ساڵی ١٩٦٩.

ح_ دژی گشتی بوون و تایبەت بوون لە ڕوویەکەوە : هەمدیسان گشتی بوون و تایبەتی بوونە لە ڕوویەکەوە . کەوابوو کۆدەبنەوە و جیاش دەبنەوە هەروەك ڕابورد لە باسی دژی گشتی بوون و تایبەت بوون لە ڕوویەکەوە بەگوێرەی چەمك .

نەبوونی دۆخی توند و نەبوونی دۆخی سوك[1] لە کوشتنی سادەدا کۆدەبنەوە هەروەك لە ماددەی (٤٠٥) لە یاسای سزاکانی عێراقیدا هاتووە: (من قتل نفسا عمدا یعاقب بالسجن المؤبد أو المؤقت) هەرکەسێك مرۆڤێك بکوژێت بەدەست ئەنقەست. . سزای بەندکردنی هەتا هەتایی یاخود کاتی دەدرێت. نەبوونی دۆخی توند بەدی دێت لەگەڵ بوونی دۆخی سوککراودا هەروەك بوونی دۆخی سوك بەدی دێت لەگەڵ نەبوونی دۆخی توندا.

سەرەرای ئەو چوار پەیوەندیانەی باس کران. . چەند ڕووبەڕووبوونێکی تر هەیە لە نێوان زاراوەکاندا ، لەوانە ئەمانەی خوارەوەن :

١_ **المترادفات: دوو هاوواتا**: ئەوانیش دوو زاراوەن یان دوو وشەن یەك واتایان هەیە ، وەك : گرێبەستی ڕاگیراو و گرێبەستی جێبەجێنەکراو ، گرێبەستی هەڵگری پووچکردنەوە ، گرێبەستی جێبەجێ بووی ناپێویست ، وە ئەم دووانە لەگەڵ دوو وشەی یەکسان یەك دەگرنەوە لە چەمك دا لەو چوار پەیوەندییەی باسکرا.

٢_ **دوو دژ**: دوو زاراوەن کە پێکەوە لە شتێکدا کۆنابنەوە ، پێکەوەش لاناچن. ئەم جۆرە تایبەتی ترە بەڕەهایی لە دوو لێکجیاکە ، چونکە هەموو دژێك جیایە ، نەك پێچەوانەی هەمەکی ، وەك وشەکانی تاوانبار و بێ تاوان بە گوێرەی ، مرۆڤ نەك گیاندارانی تر ، وێنا ناکرێت کەسێك هەبێت لەیەککاتدا بێ تاوان و تاوانباریش بێت لە تاوانێکاو لە یەك کاتدا هەروەك وێنا ناکرێت ئەو کەسە هیچ کامێکیان نەبێت.

٣_ **دوو ناکۆك (المتضادان)** : ئەو دووانەش وەك جیا وەهان ، لە یەك کاتدا کۆنابنەوە بەڵام دەکرێت هیچکامێکیان نەبن لە شتێکدا. وەك دۆخی سەخت و دۆخی ئاسان بۆ تاوان ، هەرگیز وێنا ناکرێت کە دۆخێك هەبێت لە یەك کاتدا سەخت و ئاسان بێت بە گوێرەی یەك تاوان پێکەوە لە تاوانی سادەدا هیچیان نەبن.

---

[1]. نقیض وجود الظرف المشدد عدم ونقیض وجود الظرف المخفف عدم.

**٤_ دوو وەپاڵ یەکنراو (المتضايفان)** : دوو زاراوەی پابەند و پەیوەستی یەکترن لە رووی وێنا کردنەوە ، چونکە وێناکردنی یەکێکیان. وێناکردنی ئەوی تریان پێویست دەکات ، وە لە نموونەکانی :

**دروست کەر و دروست کار (الخالق والمخلوق)** : باوك و کور ، مێرد و ژن ، تاوانبار و تاوان ، هاوبەش و هاوبەشی کردن ، زۆر و کەم ، بەهێز و لاواز. ئەگەر وێنای یەکێك لەو دوو وەپاڵنراوانەمان کرد. هەر دەبێت وەپاڵدراوەکەی تری لەگەڵدا وێنابکەین ، چونکە پێویستی لە نێوانیاندا ئاشکرا و زەروریە.

**٥_ بوون و نەبوون**: دوو زراراوەن یەکەمیان ئاماژە دەکات بۆ بوون و دووەمیان بۆ نەبوونێکی وا کە ئامادەیی بوونی هەبێت ، لە نموونەکانی: کوێری و چاوساغی ، نەزانی و زانین ، کەواتە هیچ بوونەوەرێکی زیندو پێی ناوترێت کوێر ، هەتا لە توانایدا نەبێت و چاو ساغی هەڵنەگرێت ، بۆ نموونە ناوترێت تەختە کوێرە ، هەروەها نەزانین بەکارناهێنرێت بۆ شتێك نەبێت کە زانین وەرگرێت .

لەمـەو پـێش ڕوونمـان کـردەوە لۆژیـك یاسـای بەدەسـت خسـتنی نەزانراوەکانـە لـە زانراوەکانەوە. وە ئاماژەمان کرد بۆ ئەوە کە هەموو پەرەسەندنێکی شارستانی لە کۆمەڵگە و نەتەوەکاندا لە کۆن و نوێدا لەڕووی هزرەوە لەژێر ڕۆشنایی ئەم یاسایەدا جێبەجێ دەبێت ، نـەوەی نـوێ ئـەو زانسـت و دەسـکەوتانەی لـە نـەوەی پـێش خۆیـەوە بـە مـیرات بـۆ دەمێنێتەوە تا قازانجێکی نوێی بخاتە سەر تا سەرمایە و قاوانجەکە پێکەوە بداتـە دەسـت ئەو نەوەیەی پاش ئەم دێت ، وە هـەروەها بـەم شـێوەیە. بێگومـان هـەموو شارسـتانیەتە مرۆڤایەتیەکان بەرەنجامی ئەم پرۆسە لۆژیکیەن لەژێر سایەی یاسای لۆژیکدا ، وە پێوەری جیاکردنەوەی لە نێوان گەلانی دواکەوتوو و پێش کەوتوودا بریتیە لە: ئەندازەی پابەندبوون بەیاسای دەست خسـتنی نـەزانراو لـە زانـراوەوە لـە هـەردوو بـواری تیـۆری و پراکتیکیـدا. زانراوەکان: بە شێکیان وێناکردەیین (تصورية ) و بەشێکی تریان باوەڕکردەیین (تصديقية) ، بۆ هەریەك لەم دووانە. . چەند بنەما و ئامانجێك هەیە کە لە بەندی سێهەمدا لە بنەماکانی وێناکردنـەکان قسـەمان لـێ کـرد ، ئـەم بەنـدەش تایبەتـە بـە لێکۆڵینـەوەی ئامانجـەکانی وێناکردنەکان ، کە ئەویش پێناسەکانە ، لە بواری بیردۆزەیی دا بەو ئەندازەیەی پەیوەنـدی بـە زاراوە یاسـاییەکانەوە هەیـە. پێناسـەکان چـەندان مـەرج و جـۆر و وێنـەیان هەیـە ، لـە گرنگترین وێنەکانیان: دابەش کردنەکانە ، بۆ لێکۆڵینەوەی هەر بابەتێك لەم سـێ بابەتانـە ، باسێکی سەر بەخۆ تەرخان دەکرێت بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە و سودی زیاتر گەیاندن.

# باسی یەکەم:
# ڕاستی پێناسە و مەرجەکانی

**پێناسە لە زماندا:** بابەتی پێناسە و وەرگیراوەکانی بە چەند واتایەك هاتووە ، لە وانە: ڕاگەیاندن (الإعلام) دەوترێت: (عرفه الأمر) : واتە شتەکەی پێ ڕاگەیاند ، و (عرف الضالة) : بانگەوازی بۆ شتە ون بووەکە کرد ، وە وشەی (تَعَرَّف) بە واتای (إعترف) دێت ، واتـا دانـی پێدا نا ، وە بە واتای (طلب) خواسـتن و داوا کردیشـن دێـت، دەوترێـت: (تَعَرَّفْـتُ كَمَـا عِنْـدَ فُلان) واتە: لای فلاَن کەس بە شوێنتاندا گەڕام.[1] وە لە زاراوە دا بە چەند پێناسەیەکی زۆر پێناسە کـراوە[2] هـەموویان بـە دەوری یـەك تـەوەرەدا دەسـوڕێنەوە ، کـە بریتیـە لـەوەی: پێناسە وتەیەکە لە وێناکرینیەوە وێناکردنێکی تر بەدەست دەهێنرێت ، جا ئـەو پێناسـەیە یان بە چیەتی ئەو شتە یان بە شێوەیەك دەبێت کە لە جگە لە خۆی جیای دەکاتەوە.[3]

(القول الكاسب) : پێی دەوترێت : (مُعَرِّف) : ناسێنەر ، و (تَعريف) : پێناسـە ، و (قـول شارح) : قسەی لێکدەرەوە ، وە (المُكتَسَب) : بەدەستهێراوەکە پێـی دەوترێـت: ناسـێنراو (مُعَرَّف) .

**ئەو شتەی پێناسە ناکرێت و ئەوەش پێناسە دەکرێت:**

هەموو شتێك کە وێنای دەکەین پێناسە هەڵناگرێت ، کەوابوو هەموو ئەو شتانەی لە ژێر یەك ڕەگەزدایە و لێك جیانابنەوە. . بە سیفەتێکی جۆری جیاکار پێناسە ناکرێت.[4] حاڵەتـە

---

[1]. لسان العرب مادة عرف _ فصل العين حرف الفاء ب ١ ل ١٤١.

[2]. تەماشای : تحرير القواعد المنطقية شرح رسالة الشمسية للعلامة السيد شريف الجرجانی : ٦٢ وتنوير البرهان للشيخ حسن الموصلی وشرح الخبيصی للعلامة الشيخ عبداله الخبيصی علی تهذيب السعر التقازانی ل ٣٠.

[3]. البرهان للكلنبوی ، المرجع السابق ل ١١٤.

[4]. المنطق التقليدی ، للدكتور مهدی فضل الله ل ٨٤.

دەروونی و بەرجەستەییە ڕاستەوخۆكان لە غەریزەكان دا وەك: دڵخۆشی و غەمباری و غەم و ئازار و خۆشی. . وێنەی ئەمانەش هیچ پێناسەیەكیان نیە ، چونكە ئێمە توانای ئەوەمان نیە ئەوەی هەستی پێ دەكەین و لە گەڵیدا دەژین بە ئامێر و هۆكارە زمانیە باوەكان دەری ببڕین. وە لەو شتانەی ناگونجێت پێناسە بكرێن (عەقڵ و ڕۆح) ن ئەمما عەقڵ: چونكە هەموو شتێك بە هۆی عەقڵەوە دەناسرێت ، كەوابوو عەقڵ بەشتێك پێناسە ناكرێت كە بە هۆیەوە عەقڵ دەناسرێت ، ئەگینا دەست بەسەردا گرتنی مەبەستەكە بە حەتمی ڕوودەدات ، بەڵام گیان. . لەبەر ئەم فەرمودەیەی خوای گەورە (ویسألونك عن الروح قل الروح من أمر ربی وما أوتیتم من العلم إلا قلیلا) واتە: پرسیارت لێ دەكەن دەربارەی گیان ، تۆش لەوەلام دا بڵێ: گیان یەكێكە لە كارەگانی پەروەردگارم ، منیش تەنها كەمێك زانستم پێ دراوە.[1]

ئەو شتەی پێناسە هەڵدەگرێت:

هەرشتێك وابێت كە مرۆڤ سیفەتێكی خودی ئەو شتە بزانێت یان سیفەتێكی وارسی كە جیای بكاتەوە لە شتانی تر. . دەگونجێت پێناسە بكرێت بە چەند سیفەتێكی خودی پێی دەوترێت ڕەگەز و جیاكار یان بە چەند سیفەتێكی وارسی كە پێی دەوترێت: وارسی گشتی و تایبەت.

مەرجەكانی ڕاستی پێناسە:

مەرجە لە تەرازووی لۆژیكدا بۆ ڕاستی پێناسەی زاراوەیی لە هەموو زاراوەیەكی یاسایی یان نایاسایی دا كۆمەڵە مەرجێك هەبێت ، كە گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

**مەرجی یەكەم:** پێویستە پێناسەكراو و پێناسەكار یەك بن لە خوددا و جیاواز بن لە پێودانگدا ، ئەگەر هەردوكیان لە خود و پێودانگدا یەك بوون. . ئەو كاتە پێناسەی شتەكە بەخۆی كراوە ، پێناسەی شتیش بە هۆی خۆیەوە بەتاڵە هەروەها پابەند كراوەكەش ، وەك ئەوەی بوترێت تاوان تاوانە و ، سزاش سزایە. ئەگەر هەردوك بە خود و پێودانگ جیابوون. . ئەوا پێناسەكە بە شتێكی جیاواز لەخۆی دەكرێت كە ئەویش بەتاڵە ، وەك پێناسەی پابەندبوون بە پەیوەندی یاسایی لە ماددەی (٦٩) لە یاسای مەدەنی عراقی جێبەجێ بوو.

---

[1]. سورة الإسراء ئایەتی ٨٥.

بەڵگەی بەتاڵبوونەکە ئەوەیە: کە پابەندبوون لە واچەی گروپی کاریگەر بوون و مل کەچ کردنە ، لەکاتێك دا پەیوەندی یاسایی لە واچەی دانەپاڵە دەدرێتە پاڵ قەرزدەر و قەرزار ، کەوابوو هەردوو واچەکە لێك جیان و دروست نیە پێناسەی یەکێکیان بە یەکێکی تریان بکرێت ، سەرەڕای ئەوەش (پابەندبوون) سیفەتێکی تایبەتە لە قەرزاردا ، بەڵام پەیوەندی یاسایی سیفەتێکی هاوبەشە لە نێوان قەرزدەر و قەرزاردا. کەواتە نابێتە پێناسەکردنی سیفەتە تایبەتەکە لەلایەکەوە بە سیفەتە هاوبەشەکەی نێوان هەردوولا. هەروەها دروست نیە پێناسە کردنی بە ئەرکی یاسایی هەروەك لە پرۆژە یاسای مەدەنی عێراقی تازە دا هاتووە[1] لەبەر ئەوەی ئەرکی یاسایی سیفەتی بەجێ هێنا ، بەجێهێنانیش جێگەی پابەندی یە ، هەروەها دروست نیە پێناسەی شت بە سیفەتی شوێنەکەی ، چونکە شت و شوێنەکەی جیاوازن بە خود و پێودانگ پێکەوە ، کەوابوو پێناسەکردنی شت بەشتی جیاواز لە خۆی روو دەدات ، پێناسەی شت بە شتی جودا لە خۆی بەتاڵە.

پێناسەی ڕاست بۆ پابەندکار ئەمەیە: هەڵگرتنی بە جێهێنانی ئەرکێکە بە ئارەزوو یان بەزۆر و ناچاری کە دەبێتە هۆی سەرقاڵبوونی ئەستۆ بە مافی کەسێکی ترەوە تا تەواو دەبێت.[2]

**مەرجی دووەم** : دەبێت پێناسەکە روونتر بێت لە پێناسەکراوەکە[3]: کەوابوو دروست نیە پێناسەی شتێك بکرێت بەهۆی شتێکەوە کە لەو شاراوەتر بێت ، یان یەکسان بێت لەگەڵیدا لە روونی و شاراوەییدا ، وەك پێناسە کردنی ئەستۆی دارایی بەوەی: دەفرێکە بۆ ماف و پابەندی یەکان ، لەبەر ئەوەی دەفر روونتر نیە لە ئەستۆی دارایی ، سەرەڕای ئەوە لەم پێناسەدا یان لە پێناسەکردنی دا ئەستۆی دارایی بەوەی کە کۆمەڵێك مافە بۆ مرۆڤ و پابەندبوونە[4] بە ئەرکی شانەوە دەست بەسەرا گرتنی مەبەستە (واتە باسکردنی ئەنجامە لە

---

[1]. بۆ ساڵی ١٩٨٥ ماددەی (١١٠) دە ڵێت پابەند بون ئەرکێکی یاسایی یە بە بە جێهێنانی سنوردارو دە کەوێتە سەر شانی کەسێکی دیاریکراو بۆ بەر ژەوەندی کەسێکی تر.

[2]. ئەم پێناسەیەم لە زمان و لۆجیك و اصول الفقه . . . . وەر گرتووە ، بۆ زانیاری زیاتر بروانە: الإلتزامات في الشريعة الإسلامية والشريعات المدنية العربية للمؤلف ب ١ ل ١٧.

[3]. البرهان سەرچاوەی پێشو ل ١٢٦ الرسالة الشمسية سەرچاوەی ڕابردوو ل ٦٥.

[4]. المدخل للقانون الخاص للدكتور عبدالمنعم البدراوي لا ٤٦٢.

پێشەکیدا) ، لەبەر ئەوەی ماف و پابەندییەکان لەسەر بوونی ئەستۆی دارایی وەستاون. ئەگەر ئەم لە سەری وەستا ئەوا سوڕانەوە (الدور) ڕوودەدات یان ئەوەی پێی دوترێت ئەستەمی لۆژیکی یان دەست بەسەراگرتنی ئەنجام لە دەست پێکدا. پاشان ئەگەر ئەم پێناسەمان وا وەرگرت ئەوا بە حەتمی ئەوە ڕوودەدات کە کەسێك لە دایك بووبێت و هیچ مافێکی دارایی نابێت یان هیچ پابەندییەکی دارایی و ئەستۆی دارایی لەسەر نیە. وە ئەگەر مەبەست پێی ماف و پابەندی یەکان بێت بە کردەکی یان هێزەکی واتە: بتوانێت لە ئایندەدا ببێت. . ئەوا بە ناچاری و پێویستی تێکەڵ کردن لە نێوان ئەستۆی دارایی و شیاویی هەمیشەیی ڕوودەدات ، وە دیارە ئەوەش پووچە ، هەروەها پابەند کراوەکەش ، کەواتە مەبەست پێی پابەندبوونی کردەکی یان هێزەکی نیە. بە هەمان شێوە دروست نیە کە هەندێك لە زانایانی (أصول الفقه) بنەمانی ئیسلامی کە پێناسەی ئەستۆی مالیان کردووە دەڵێن: وە سفێکە پێ سپێردراوی پێ دەبێتە شیاوی ئەرك خستنەئەستۆ و پابەندبوون. [1] چونکە پێناسەکە ڕوونتر نیە لە پێناسەکراوەکە ، تێکەڵ کردنی تێدایە لە نێوان ئەستۆ و شیاو و هەمیشەیی تەواو ، ئەوەی ڕاستی بێت ئەستۆی مرۆڤ دارایی بێت یان نادارایی تەنها گەردنیەتی هەروەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە لەم ئایەتەدا: (وكل إنسان ألزمناه طائره في عنقه) [2] واتە: هەموو مرۆڤێك کرەوەکەیمان ئاوێزانی گەردنی کردووە. واتە: لە ڕۆژی دواییدا کردەوەکانی دەکرێتە ملی ، وشەی (الطائر) کردەوەی چاکە و خراپەیە ، ئەگەر کردەوەی باش بێت ئەوا پاداشتەکەی چاکە ، وە ئەگەر خراپ بوو ئەوا پاداشتەکەی خراپە ، وە ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە خاوەن قەرز زاڵ بکرێت بەسەر جەستەی قەرزداردا هەروەك لە یاسا کۆنەکاندا بەو جۆرە بووە لەوانە یاسای ڕۆمانی ، بەڵکو گەرەنتی قەرزی خاوەن قەرزەکە لە ئیسلامدا تەنها سامان و دارایی قەرزارەکەیە بە بەڵگەی ئەم ئایەتە: (وإن كان ذو عسرة فنظرة إلى ميسرة) [3] واتە: وە ئەگەر کەم دەست بوو. . با چاوەڕێ بکات تا کاتی دەست ڕۆشتن. وە نهێنی لە هەڵبژاردنی ئەم بەشەی مرۆڤدا وەك ئەستۆیەك ئەوەیە وەك

---

1. التوضيح والتقبيح لصدر الشريعة عبيدالله بن مسعود مع التلويح للتفتازاني ب ٣ ل ١٢٥.
2. سورة الإسراء ١٣
3. سورة البقرة ٢٨

ئەڵقەی پێك گەیاندن وایە لە نێوان دەسگای بیرکردنەوە و دەسگاکانی کاردا (دەست و قاچەکان) .

**مەرجی سێیەم**: پێویستە پێناسەکە کۆکەرەوە و گشتگیر بێت بۆ سەرجەم ئەو شتانە کە دەچنە ژێر پێناسە کراوەکەوە ، کەوابوو دروست نیە پێناسەی گشتیتر بە شتێك بکرێت کە تایبەترە لێی.[1] وەك پێناسە کردنی کوشتنی ڕەها بەوەی لەناوبردنی گیانی مرۆڤێکە بە ئەنقەست و دەست درێژکاری ، چونکە پێناسەکە کوشتنی بە هەڵە و کوشتنی ڕەوا ناگرێتەوە هەروەك لە بەرگری شەرعیدا هەیە.

**مەرجی چوارەم** : دەبێت ڕێگر (مانع) بێت لە هاتنە ژوورەوەی ئەو شتانەی نامۆن بە پێناسەکە و ئەو شتانەش نەیەنە ژێر پێناسە کراوە کەوە ، چونکە مەبەست لە پێناسە زانینی چیەتی و بنەڕەتی پێناسە کراوەکەیە یان جیاکردنەوەیەتی لە جگە لەخۆی ، کەوابوو دروست نیە پێناسەکردنی تایبەتر بەشتێك کە لەو گشتی تر بێت.[2] وەك پێناسەی زۆر لێکردن –بۆ نمونە– بەوەی کە ناتەواوییەکە لە ناتەواویەکانی ویست یان ڕازی بوون ، لەبەر ئەوەی کەموکورپیەکانی تری ویست دەگرێتەوە لە خەڵەتاندن (شارینەوەی کەموکوڕی) و هەڵە و سودگیری و قۆستنەوە. سەرباری ئەوەش بێگومان زۆرلێکردن باسی لێوە ناکرێت بەوەی کەموکوڕیەکە لە کەموکوڕیەکانی ویست یان ڕازیبوون مەگەر بۆ خوازە نەبێ. دروست نیە بەکار هێنانی خوازە لە پێناسەدا چونکە خوازە چەسپاندنی وەسفە بەسەر هۆکارەکەیدا ، لەبەر ئەوەی زۆر لێکردن ترسی لە دڵی زۆر لێکراوەکەدا دروست دەکات ، وە ئەم ترسەیە کە کەموکوڕی ویستە ، بەڵام زۆر لێکردن بریتیە: لە کارێك یان وەسفێکی وەستاو بە کەسە زۆر لێکراوەکەوە ، هەروەها ناو نانی فریودان یان شارینەوەی کەموکوڕی سودگیری بە کەموکوڕیەك لە کەموکوڕیەکانی ویست پەسەند نیە بۆ خوازە نەبێت ، چونکە ئەو هەڵەیەی کە خەڵەتێنراوەکەی تێدەکەوێت ئەوە دەبێتە کەموکوڕی ویست نەك خەڵەتاندنەکە کە کاری خەڵەتێنەرەکەیە. لەبەر ئەوە دەوترێت بیردۆزی هەڵە جێی بیردۆزی خەڵەتاندن دەگرێتەوە ، لەسەر ئەو بنەمایەی کە گرێبەستکار هەندێجار لە

---

[1]. تهذيب المنطق لسعد الدين التفتازاني بشرح الخبيصي ل ٣٠.

[2]. تهذيب المنطق للخبيصي وحاشية الشيخ حسن العطار ل ١٠٣.

خۆیەوە دەکەوێتە هەڵەوە ، هەندێجار گرێبەستکار دەکەوێتە ناویەوە لە ئەنجامی بەکارهێنانی ڕێگە تەڵەکە کاریە فریودەرەکانەوە بۆ توشی هەڵەکردنی گرێبەستکارەکەی تر یان بەردەوام بوونی لەسەر ئەو هەڵەیەی کە تێی کەوتووە تا پاڵی پێوە بنێت بۆ گرێبەست کردن. [1]

**مەرجی پێنجەم** : پێناسەکە نابێت لە دەستە و گروپی پێناسەکردنی (شوێنەواربێت بە خاوەن شوێنەوار) [2] وە بە پێی ئەم مەرجە لۆژیکیە دروست نیە پێناسەی دەسکاری یاسایی بەوە بکەین کە: (ئاراستەی ویستە بەرەو پێك هێنانی ئاسەوارێك کە یاسا لەبەرچاوی دەگرێت و بە گرنگی دەزانێت) ، یان هاوتای ئەم پێناسەیە لەبەر ئەوەی هەموو ڕەفتارێکی خۆویستانە لە ڕەفتارەکانی مرۆڤ وتەیی بێت یان کرداری ڕەفتارەکانی لە ئاسەواری توانای سەر بە ویستی سەر بە هەست پێکردنەکەیەتی ، هەر کەسێك ویستی هەڵسێت بە کارێك یەکەمجار هەست پێکردنی پەیوەندی پێوە دەکات پاشان ویستی پاشان توانای ، کەوابوو ڕەفتار ئاراستەی توانا نیە ، بەڵکو ئاسەواری توانا ویستە. وە پێناسەی لۆژیکی دروست بۆ ڕەفتاری یاسایی (التصرف القانوني) : بریتیە لە: هەموو کارێك لە مرۆڤەوە دەردەچێت بە ویستێکی ئازادانەی هوشیارانە بە جۆرێك یاسا یان شەرع حوکم لەسەر ئاسەوارەکانی دەدات ، لە بەرامبەریدا ڕووداوی یاسایی کە لە غەیری مرۆڤەوە ڕوودەدات یان لە مرۆڤێکی لێنەهاتو یان زۆرلێکراو یان ناچار یان خەوتو یان لەهۆش خۆچوو و وێنەی ئەمانە یان لە مرۆڤێکی گاڵتەکەری واوە کە مەبەستی بە قسەکەی شوێنەوارێکی یاسایی نی یە. . دەر دەچێت ، کەواتە ڕەفتاری یاسایی: ڕەفتاری وتەیی و کرداریە خۆویستەکان دەگرێتەوە ، کورت هەڵهێنانی لە گرێبەست و ویستی تەنها دا و بە ڕووداو لە قەڵەمدانی دەسکاری یە کرداریەکانە بە ڕەهایی هەڵەیە لەیاسای لۆژیکدا.

---

[1]. أصول الإلتزامات للدكتور سليمان مرقصى ١٨٦.

[2]. البرهان للكلنبوى وشرحه تنوير البرهان ل ٩٨.

**مەرجی شەشەم** : دەبێت پێناسە لە بابەتی پێناسەی شت نەبێت بە حوکمەکەی[1] ، لەبەر ئەوەی ناسینی حوکم لەسەر ناسینی شتە بڕیار دراوەکە وەستاوە ، ئەگەر شتەکە بە حوکم پێناسە کرا ئەوا ئەستەمی لۆژیکی پێویست دەبێت ، چونکە بەندبوونی شت لەسەر شتێك کە لە سەری بەندە. . ئەوە بە حەتمی دەخوازێت شت لەسەر خۆی بوەستێت ، وە وەستانی شت لەسەر خۆی. . بە پێویستی دەخوازێت شت کە پێش خۆی بکەوێت ، دیارە پێویستیش بەتاڵە پوچە ، هەروەها پێویست کراویش ، وە بە پێی ئەم مەرجە ڕاست نیە پێناسە کردنی هەریەکە لە تەڵاقی گەڕانەوە (طلاق رجعي) و تەڵاق دانی جیابونەوە (طلاق بائن) بەو پێناسەیەی کە لە ماددەی (٣٨) دا هاتووە لە یاسای باری کەسێتی عێراقیدا.[2]
وە پێناسەی تەلاقی رجعی کردووە بەوەی: ئەوەیە کە بۆ مێرد دروستە ژنەکەی بگەڕێنێتەوە لە کاتی چاوەڕێی لە مێردەکەی بێ گرێبەست ، وە پێناسەی تەلاقی جیابوونەوەی بچووکی کردووە بەوەی: ئەو تەلاقەیە کە دروستە مێرد تەلاقدراوەکەی مارە بکاتەوە بە گرێبەستێکی نوێ. وە هەریەکە لەم دووانە بەهۆی حوکمەکەیەوە پێناسە کرا. کەوابوو حوکمی هاوسەرێتی لەگەڵ ژنەکەیدا دەست پێ بکاتەوە بەهۆی گەڕانەوەی بۆ پەرژینی ژن و مێردایەتی بێ گرێبەستێکی تازە لەماوەی چاوەڕێ کردنیدا ، چونکە تەلاقی ڕەجعی پاش کۆتایی هاتنی چاوەڕێیی دەبێتە جیابوەوە ، وە حوکمی تەلاقی جیابونەوەی ئەوەیە: بۆ مێرد هەیە کە ژنەکە بێنێتەوە بۆ لای خۆی بە گرێبەستێکی نوێ وەك گرێبەستی یەکەم ، شتێکی زانراوە قازی یان موفتی ناتوانێت حوکم بەم دوو فتوا بدات هەتاکو لە پێشدا نەزانێت کە تەلاقەکە ڕەجعی یە یان جیاکار ، ڕاست وایە کە بوترێت: تەلاقی ڕەجعی کۆتایی پێهێنانی پەیوەندی خێزانییە پاش چوونە لا بێ بەرامبەر بۆ یەکەم جار و دووەم جار ، وە ئەگەر مەرجێك لەم مەرجانە نەها تەدی. . ئەوا تەلاقەکە جیاکار دەبێت ، شایانی باسە کە هەموو تەلاقێکی ڕەجعی دەبێتە تەلاقی جیاکار بە کۆتایی هاتنی چاوەڕێی ژنە تەلاق دراوەکە بە تەلاقی ڕەجعی ، هەروەك یاسا دانەری عێراقی لە ماددەی

---

[1]. شرح تهذيب المنطق للعلامة الحسن بن حمد الاجلال ل ٦٢ تێیدا هاتووە (دروست پێناسە کردن بە شتێك کە لە سەر پێناسە کراوە کە وەستاوە ئەگەر وابو بە (دور) ناو دەبرێت .

[2]. ژمارە (١٨٨) بۆ ساڵی ١٩٥٩.

(٤٥) لە یاسای ناو براو دەڵێت: (کل تفریق قضائي للأسباب الواردة في المواد السابقة طلاقا بائنا بينونة صغرى) هەموو جیاکردنەوەیەکی دادوەری لەبەر ئەو هۆکارانەی کە لە ماددە پێشوەکاندا هاتوون بە تەلاقی جیابوونەوەی بچوکە دادەنرێت.

**مەرجی حەوتەم**: دەبێت پێناسەکە تاکە وشەیەك بێت ، ئەگینا پێناسەکە وشەیی زمانی دەبێت نەك زاراوەیی لۆجیکی ، بۆ نمونە وەك پێناسە کردنی بارمتە (رهن) .

**مەرجی هەشتەم**: دوور خستنەوەی وشە نامۆکان و ئەو وشانەی دوو واتا یان زیاتریان هەیە ، وە وشە بەکار هاتووەکان لەمانا خوازەییەکانیاندا لە پێناسەکاندا بەمەرجێك نیشانەیەکیان لەگەڵدا نەبێت کە مانای مەبەستی ئەوان دیاری بکات.

**مەرجی نۆیەم**: دەبێت پێناسەی شت بە خودیەکان (ڕەگەز و جیاکار) بێت بۆ ناسینی ڕاستی و چیەتی شتەکە ئەگەر دەگونجا ، ئەگینا پێویستە پێناسە بەو تایبەتیانەی شتەکە بێت کە جیای دەکاتەوە لە جگە لە خۆی[1] هەروەك بە درێژی باسی دێت لە باسی دووەمدا.

**مەرجی دەیەم**: پێویستە لە پێناسەکەدا ڕەگەز لە پێش جیاکارەوە بێت.[2] چونکە: **یەکەم**: هاوبەشە لە نێوان پێناسە و شتی تردا ، **دووەم**: جیاکەرەوەیە ، ئەم شتەی تر دەکاتە دەرەوەی بازنەی پێناسەکە ، وە ڕوونکردنەوەی جیاکردنەوەکە پاش ڕوونکردنەوەی هاوبەشی دەبێت.

---

[1]. البرهان للكلنبوى سەر چاوەی ڕابوردو ل ١١٥ و پاشی.
[2]. البرهان وشرحه تنوير البرهان ل ١٠٢.

## باسی دووەم:
## جۆرەكانی پێناسە

پێناسە جۆری زۆری هەیە ، لە دیدگا و تێڕوانینی جیا جیاوە ، هەندێكیان بە ناویەكداچوون (متداخلة) ، پێناسە لە رووی مل كەچبوونەوە بۆ یاسای لۆژیك دەبێت بە دوو بەشی سەرەكیەوە ئەوانیش: (پێناسەی لۆژیكی) و (پێناسەی نالۆژیكیە) ، ئەوەی گرنگە لای ئێمە تەنها بەشی یەكەمە كە پێوەرە لۆژیكیەكان دەبیات بەڕێوە ، بەلاّم بۆ زیاتر سود وەرگرتن ئامارە دەكەین بۆ هەندێك لە وێنەكانی پێناسەی نالۆژیكی كە ملكەچی یاسای لۆژیك نابێت و پێوەرەكانی لۆژیكی تێدا رەچاوناكرێت.

### چەند وێنەیەك لە پێناسە نالۆجیكیەكان

١_ **پێناسەكردن بە ئامارە (التعرف بالاشارة)** : وەك ئەوە فرۆشیار دەڵێت بە كڕیار: ئەم ئۆتۆمبیلەم پێ فرۆشتی ، دیاری دەكات بە ئامارەیی بێ روونكردنەوەی خودەكەی و تایبەتمەندییەكانی ، ئەم جۆرە لەدیاریكردن. . شەرع و یاسا بە گرنگ سەیری دەكات و پەیمانەكە بەڕاست و بەرهەم هێن دەزانێ بۆ ئاسەوارەكانی ، مادام كڕیارەكە ئۆتۆمبیلەكە دەبینێت بە تەواوی و قەبارە و ڕەنگ و نیشانە بازرگانیەكەی ، بەلاّم ئەگەر كەموكوڕیەكی تێدا بەدی كرد كە نرخەكەی كەمدەكاتەوە یان سودەكەی. . ئەوكاتە سەرێشكە لە نێوان كڕینیدا بە كەموكوڕیەكانیەوە یان هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستەكەدا.

٢_ **پێناسە كردن بە نمونە (التعریف بالمثال)** : زانایانی زمانی عەرەبی (نحو) پشتیان بەم جۆرە لە پێناسەكردن بەستووە ، بەڵكو هەندێك لە زانایانی لۆژیك وتویانە[١] :

---

[١]. البرهان للكلنبوی ل ١١٨ تێدا هاتووە ( لەبەشی پێناسە كردن بە نیشانەو وێنەی ناتەوا رونككرنەوەیە بە نمونە و دابەش كردن .

بێگومان پێناسە بە نمونە شێوەیەکە لە شێوەکانی پێناسەکردن بە نیشانە و وێنەی ناتەواو (الرسم الناقص ) هەروەك باسی دەکەین ، بێگومـان (ابـن مالـك) لـە (ألفیـە) یەکەیدا بکـەر (فاعل) ی بەهۆی نمونەوە پێناسە کردووە و وتویەتی[1]:

الفاعل الذی کمرفوعي أتى زیدٌ منیراً وجهُه نعمَ الفتی

بکەر لای زانایانی ڕێزمانی عەرەبی: ئەو ناوەیە کە کارێکی تـەواوی دەدرێتـە پـاڵ ، جـا گەردانکراو بێت (متصرف) وەك: (أتـى) لەڕستەی (أتـى زیـدٌ) دا ، یـان جەقبەستوو بێت (جامد) وەك: (نِعم الفتی) ، یان نیمچە کردار بێت وەك: (منیرًا) لە ڕستەی (منیرًا وجهُـه) دا. پێناسە کردن بـە نمونـە سـودێکی گـرنگ هەیـە لـە ڕووی فێرکردنـەوە ، چـونکە ئامێرێکـە هەمیشە پێویستمان پێی دەبێت بۆ دانە پاڵی واتا بـۆ لای وشـەکانی ، بـەڵکو ڕێگەیەکـە لـە پێش هەموو ڕێگەیەکی ترەوەیە.

٣_ پێناسـەی (نـەرێنی) وەك پێناسـەکردنی جوڵـە بـەوەی کـە: نەوەسـتانە یـان پێچەوانەکەی. وە پێناسەی دادگەری بەوەی: ئەو شتەیە کە: ستەم نیە وە هەروەها. .

٤_ **پێناسـە بـە هـاو واتـای وشـەکە:** کـە زانایـانی لۆژیـك نـاوی دەنـێن پێناسـەی وشەیی(لفظي) ، ئەویش لێکدانەوەی وشەیەکی ناڕوونە بە وشەیەکی مانـا ڕوونـی هاوواتـای وەك خۆی یان ماناکـەی ڕوونـتر بێـت ، چـونکە هـەموو پێناسـەیەکی زمـانی لـە سـەرەتای باسەوە پێش پێناسەی زاراوەیی دەگەڕێتەوە بۆ ئـەم شـێوە لـە پێناسـەی نـالۆژیکی ، وە پشـت دەبەسـترێت لـەم پێناسـەکردنەدا بـە فەرهەنگـەکان و ئەنسـکلۆپیدیا زمانیـەکان (الموسوعات اللغویة) لە باتی پشت بەستن بە لۆژیك.[2]

٥- پێناسە بە شاراوەتر (التعرف باالا خفی) یان وەك ئەو وابێت لە شاراوەیی و نادیاری و ئاشکراییدا: وەك پێناسەی وشـتر (الجمـل) بـە کەشـتی سـەحرا (سـفینة الصـحراء) ، وە پێناسەی شێر بە پاشای گیانداران.

---

[1]. تەماشای (الفیة ) ی ابن مالك بکە لێکدانەوەی (الأشمونی الحسن بن محمد) پەرلوێزی محمد صبان ب ٢ ل ٣٣.

[2]. وەك پێناسەی (الجریمة) تاوان: بە گوناه ، پێناسەی الموافق بە (حبس) بەند کردن ، گرێ بە: دژە کردنەوە وە هەروەها. . . .

٦_ پێناسه به خستنه پاڵ (التعرف بالتضايف) : وهك پێناسهی بهر هۆكار و هۆكاردار بهوهی كه شتێكه هۆی ههبێت ، وهك پێناسهی كوڕ بهوهی: ئهوهیه باوكی ههبێ ، یان باوك بهوهی: ئهوهیه كه كوڕی ههبێت ، یان پێناسهی مێرد بهوهی: ئهوهیه كه خێزانی ههبێت. . وه ههروهها.

٧_ پێناسهی سوڕانهوهیی (الدوری) : وهك پێناسهكردنی شت به حوكمهكهی ، وهك باسمان كرد له پێناسهی تهلاقی ڕهجعی و بائندا.

## پێناسه لۆژیكیهكان

**پێناسهی لۆژیكی**: بریتیه له پێناسهی زاراوهیی بۆ زاراوهیهك كه ڕهچاوی پێوهره لۆژیكیهكانی تێدا دهكرێت. زانایانی لۆژیك پێناسهی لۆژیكییان دابهش كردووه بۆ چهند جۆرێك و له چهند تێڕوانین و دیدگایهكی جیا جیاوهوه كه جیاوازن له ڕوونی دا ، وهك لهم ڕوونكردنهوهیهی خوارهوهدا دێت:

**یهكهم**: له ڕووی ئامانج و مهبهستهوه دابهشیان كردووه بۆ پێناسهی وشهیی و پێناسهی بێداركردنهوهیی (التنبيهي) [1] ، لهگهڵ ئهوهشدا پێناسهی وشهیی وهك لهمهوبهر وتمان. . لهلایهن زانایانی لۆژیكهوه لهو بازنهیه كراوهته دهرهوه كه یاسای لۆژیكی بهسهر بچهسپێت و خستویانهته ژێر یاسای زمانهوه.

أ_ **پێناسهی وشهیی (وهك باسكرا)** : بریتیه له لێكدانهوهی ماناو چهمكی وشهیهك به وشهیهكی لهو ڕوونتر له گهیاندنی مانادا ، وه سهرچاوه باوهڕپێكراوهكان بۆ ئهم جۆره پێناسهیه: ئینسلكۆپیدیا زمانیهكانه نهك سهرچاوه لۆژیكیهكان ، باسكردنیشی له زانستی لۆژیكدا تهنها بۆ بهرامبهر پێكردنیهتی لهگهڵ پێناسهی وشهیی دا.

ب_ **پێناسهی بێداركردنهوهیی**: بریتیه له ئامادهكردنی وێنهیهكی كۆكراوه له زهینی دوێنراودا كه لێی شاراهی بووه پاش ئهوهی كه لهوهو پێش له زهینیدا ههبووه ، وه به پێی ئهوه ئهم جۆره پێناسهیه ناچێته ناو خانهی بهدهست هێنانی نهزاناو له زانراوهوه ، بهڵكو تهنها ڕۆڵی پێناسه كردنهكه له هێنانهوه بیری ئهو شتهدایه كه ون بووه و خستنه بیری

[1]. البرهان ل ١١٩

دوێنراو ، لەگەڵ ئەوەشدا مل کەچی هەموو پێوەرە لۆژیکی و مەرجەکانیـەتی وەك هـەردوو پێناسەی وشەیی و ڕاستینی کە دێن .

**دووەم** : لە ڕووی زانیاری دەربارەی بوونی تاکەکانی پێناسە کراوەکەی لـە دەرەوەی زەین و نەبوونی لـە دەرەوەی زەینـدا پێناسـەی لـۆجیکی دەبێتـە دوو بەشـەوە ، **یەکەم**: پێناسەی (ناوی) و **دووەم**: پێناسەی ڕاستەقینی.

**أ_ پێناسـەی نـاوی (التعريـف الإسمـي)** : ئـەم پێناسـەیە تایبەتـە بـە هـەبووە زەینییەکانەوە ، هەروەك پێناسەی ڕاستینی تایبەتە بە هەبووە دەرەکییەکانەوە (ئەو شتە بەرجەسـتانەی لـە دەرەوەی زەینــدان) ، پێناسـەی نـاوی بریتیـە لـە پێناسـەکردنی زاراوەگـەلێکی زانسـتی پێـودانگی ، بـێ ئـەوەی بزانرێـت کـە تاکـەکانی بوونیـان هەیـە لـە دەرەوەی زەیندا ، ئیتر لە واقیعدا هەبن وەك پێناسـەی شـتێك لـە بەرجەسـتەکان (أعيـان) پێش پەی بردن بە بوونی. یان لە زەیندا نەبێت لەگـەڵ گونجـانی هـەبوونی وەك پێناسـەی پرۆژەیـەك کـە هێشـتا دروسـت نـە کرابێـت ، یـان لەگـەڵ نـەگونجانی هـەبوونی وەك پێناسەکردنی (إجتمـاع النقيضـين) : کـە بـریتین لـە دوو دژ . کـە بەیەکـەوە کۆنابنـەوە و بەیەکیشەوە لاناچن.[1]

شایانی باسە هەموو زاراوە یاساییەکان لەشـتە پێودانگییـەکانن و لـە پێـودانگی عـەقڵی یاسـا ناسـەکانن ، لەبـەر ئەمـە . بێگومـان پێناسـەی هـەموو زاراوەیـەکی یاسـایی: بـە پێناسەیەکی ناوی دەدرێتە قەڵەم .

**ب_ پێناسەکردنی ڕاستەقینەیی (التعريف الحقيقي)** : پێناسەیەکە بۆ شـتێك لـە دەرەوەی زەیندا هەبێت. کەوابوو پێناسە لۆژیکیەکان بۆ هەموو ئەو شـتانەی لـە دەرەوەی زەیندا بوونیان هەیە پێناسەگەلێکی ڕاستینن ، وەك پێناسەی گوێزراوە (المنقـول) بـەوەی: کە ئەو شتەیە دەگونجێت لە شـوێنێکەوە بگوازرێتـەوە بـۆ شـوێنێکی تـر ، یـان پێناسـەی خانوویەرە (عقار) بەوەی: ئەو شتەیە ناگونجێت بگوێزرێتەوە لە شوێنێکەوە بـۆ شـوێنێکی تر لەگەڵ پارێزگاریکردن لە شێوە و پێکهاتەکەی.

---

[1]. البرهان ل ١٢١

٣_ سێ یەم : لە ڕووی توخمەکانەوە دابەش دەبێت بۆ پێناسەی تەواو (الحد) و رەسم (الرسم) . [١] هەریەکە لە پێناسەی ناوی و ڕاستین بەشێوەیەکی سروشتی دەبنە چوار بەشەوە: پێناسەی تەواو (الحد التام) و پێناسەی ناتەواو ، ڕەسمی تەواو و ڕەسمی ناتەواو (الرسم الناقص) .

أ_ **پێناسەی تەواو:** پێناسەی شتە بە ڕەگەز و جیاکارە نزیکەکای (الجنس والفصل القريبين) وەك پێناسەی تاوان بەوەی: قەدەغەکراوێکە ئەنجامدانی سزای لەسەرە. قەدەغەکراو ڕەگەزە و هەموو قەدەغەکراوێکی شارستانی دەگرێتەوە کە بژاردن پێویست دەکات ، هەروەها قەدەغە کراوە تاوانکاریە سزاپێویست کارەکانیش ، (ئەنجامدانی سزای لەسەرە) جیاکارێکە تاوان جیادەکاتەوە لە کردار و گوفتارە قەدەغەکراوەکان (نادروستەکان) بەلأم نابێتە هۆکاری سزادان ، بەلکو چەند هۆکارێکن بۆ پێویست بوونی بژاردن ئەگەر ئەوانە زیانیان لێ کەوتەوە ، وە ناو نانیشی بە سنور (حد) . . لەبەر ئەوەیە ڕێگرە ، وە پێناسەی ناوبراو ڕێگرە لە هاتنە ژوورەوەی بێگانە بۆ ناو پێناسەکراوەکە ، وە ناوبردنی پێناسە باسکراوەکە بە (تەواو) لەبەر ئەوەیە پێناسەی شتەکەی کردوو بە هەموو خودی و ڕاگرەکانی. [٢]

ب_ پێناسەی ناتەواو (الحد الناقص) : ئەویش پێناسە کردنە بە ڕەگەزی دوور و جیاکاری نزیك یان تەنها بە جیاکاری نزیك ، وەك پێناسەکردنی تاوان بەوەی ڕووداوێکە سزا لەسەر ئەنجامدانی هەیە. کەوابوو (ڕووداو) ڕەگەزێکی دوورە ، چونکە ڕووداوی ڕەواو ناڕەوا دەگرێتەوە وە پێشی دەوترێت (سنور) . . لەبەر ئەوەی ڕێگرە لە هاتنە ناوەوەی بێگانە ، (ناتەواو) یشە لەبەر ئەوەی بە ڕەگەزی نزیك نیە. کەوابوو سنورداری تەواو و ناتەواو بۆ شتێك بە تەنها خودیەکان و پێکهێنەرەکانی دەبێت با پێودانگیش بن ، ئەگەر پێناسەکە بە خودی ڕووت نەبوو بەو جۆرەی بە خودیەکان (ڕەگەز و جیاکار) لەگەڵ تایبەتەکان بێت. . ئەوا پێناسەکە (ڕەسم) دەبێت نەك (سنور) ، وە وەکو پێناسەی تەواو و ناتەواو دەبێت.

---

[١]. البرهان : ل ١١٥ و پاشی وتنوير البرهان : ل ٩٣ و پاشی الرسالة الشمسية ل ٦٢ و تهذيب المنطق بشرح الخبيصي ل ٣٠ و منطق العرب ل ٥٥.

[٢]. تنوير البرهان : ل ٩٢.

ج_ ڕەسمی تەواو: ئەویش پێناسەکردنی شتە بە تایبەتیەك لە تایبەتیەکانی لەگەڵ ڕەگەزی نزیکدا یان توخم و جیاکاری نزیکدا ، وەك: دانەپاڵی تایبەتیەك لە تایبەتیەکانی تاوان بۆ پێناسە ناو براوەکە. وەك ئەوە بوترێت: تاوان قەدەغە کراوێکە سزا لەسەر ئەنجامدانی هەیە کە بە یاسای سزاکان دیاری کراوە ، بۆیە بە (ڕەسم) ناو دەبرێت: لەبەر ئەوەی پێکهاتووە لە خودییەکان و تایبەتیەکان ، لەبەر لەخۆگرتنی تایبەتی بەدەر لە چیەتەکە. . لە ناوەوە و دەرەوە لێکدراو دەبێت ، لێکدراو لە ناوەوە و دەرەوە دەچێتەدەرەوە ، بەڵام بە (تەواو) دانە قەڵەمی بۆ ناو بازنەی پێناسەکە. . لەبەر ئەوەیە پێناسە کراوەکە جیادەکاتەوە لەو شتانەی کە لەگەڵیدا بەشدارە لە ڕەگەزەکەیدا.

٥_ **ڕەسمی ناتەواو:** پێناسەی شتە بە تایبەتیەکانی نەك خودی یەکانی ، وەك پێناسەکردنی خاوەندارێتی بەوەی: ئەوەیە خاوەنەکەی سەرپشك دەکات یان دەستەڵاتی دەداتێ لە هەڵس و کەوت کردن و بەکارهێنان و سود وەرگرتن و گرتنەدەست دا. یان پێناسەکردنی بە تایبەتیەك لە تایبەتەکانی لە ڕەگەزە دوورەکەیدا ، وەك پێناسە کردنی مرۆڤ بەوەی کە بوونەوەرێکی بیرکەرەوەیە ، کەوابوو وشەی (بونەوەر) ڕەگەزێکی دوورە بۆ مرۆڤ و بێ گیان و ئاژەڵەکان و ڕووەکەکانیش دەگرێتەوە ، بەڵام سیفەتی بیرکردنەوە تایبەتمەندییەکە لە تایبەتیەکانی جیای دەکاتەوە لەو شتانەی کە هاوبەشە لەگەڵیدا لەم ڕەگەزە دوورەدا. بێ گومان هەوڵم داوە خۆم لە نمونە ڕزیوە دواکەوتووەکانی زانایانی لۆژیك دوور بخەمەوە کە لە هەموو سەرچاوە لۆژیکیەکاندا دووبارە دەبنەوە ، بۆنمونە دەربارەی سنورداری تەواو (الحد التام) ی (مرۆڤ) وتویانە : مرۆڤ ئاژەڵێکی بیرکەرەوەیە ، وە لە سنورداری ناتەواوی (مرۆڤ) دا وتویانە: مرۆڤ جەستەیەکی بیرکەرەوەیە. وە لە ڕەسمی تەواوی (مرۆڤ) دا وتویانە: زیندەوەرێکی گۆیای پێکەنیوە. وە دەربارەی ڕەسمی ناتەواوی (مرۆڤ) وتویانە: پێکەنیو ، یان مرۆڤ جەستەیەکی پێکەنیوە. لەو خستنە ڕووەی پێشوودا دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کە کۆمەڵێك جیاوازی بنەڕەتی بەدی دەکرێت لە نێوان ئەو جۆرانەدا کەباس کرا ، وەك:

١_ پێناسەکردن بە سنوری ناتەواو یان سنوری تەواو یان ناتەواو وێنەیەکی تەواو و ڕوون پێش کەشی زەینی مرۆڤ ناکات لە بارەی شتە پێناسە کراوەکەوە ، کەواتە پێناسەی تەواو. . وردەکاری و ڕوونی زیاترە لە پێناسەکردن بە سنورداری ناتەواو.

٢_ پێناسەکردن بە جگە لە سنوری تەواو چیەتی شتە پێناسە کراوەکە بە تەواوی روون ناکاتەوە ، بەڵکو تەنها لە بێجگە خۆی جیادەکاتەوە.

٣_ پێناسەکردن بە سنوری تەواو بەدەر نیە لە گرانی و ئاستەنگ ، لەبەر قورسی جیاکردنەوەی سیفەتە بنەڕەتیە خودیەکان و سیفەتە نابنەڕەتیەکان وارسی یەك شتن. لەبەر ئەوەی باسکردنی پێکهێنەری وەرگیراوی ناو پێناسەکەیە بەوەی کە خودی یە یان وارسی یە لە تایبەتیەکانیەتی و لە شتە پێوانگیەکانە و جیاکردنەوەی نیە. . پێوەرێکی بابەتی یە لە پێناسەی زاراوە زانستی یەکاندا بە پێچەوانەی ئەو شتانەی کە لە دەرەوەی زەینی مرۆڤدان ، لەوێدا پێوەرێکی ئاشکرای بابەتی هەیە ، ئەویش ئەوەیە کە: هەرشتێك کە بە خودی خۆیەوە ڕاوەستێت لە پێکهێنەرەکانی هەر شتێك. . ئەوە جەوهەرە و خودی یە ، وە هەر شتێك بە جگە لە خۆیەوە ڕاوەستاوە. . ئەوە وارسی گشتی یە یان تایبەتیەکە لە تایبەتیەکانی .

٤_ هەندێجار لە پێناسەیەکدا چەند جیاکار یان چەند تایبەتیەك بەدی دەکرێت ، کەوابوو هەموو بەندە لەبەرچاو گیراوەکان لە پێناسەکاندا دەکرێت بە جیاکارگەلێکی جیاکەرەوە دابنرێت بۆ پێناسەکراوەکە یان کۆمەڵە تایبەتێك کە پێناسەکراوەکە جیادەکاتەوە لەو شتانەی هاوبەشن لەگەڵیدا لە ڕەگەزەکیدا.

# باسی سێ یەم:
# دابەش کردنە لۆجیکیەکان و گرنگییان
# لە ڕۆتینی لێکۆڵینەوە زانستی یەکاندا[1]

زانایانی لۆژیك پێیان وایە کە دابەشکردن شێوەیەکە لە شێوەکانی پێناسەکردن بە ڕەسمی ناتەواو ، خاوەنی پەرتوکی البرهان في المنطق) دەڵێت: (ڕونکردنەوە بەنمونە و دابەشکردن. . لەوێنەی ڕەسمی ناتەواون ) . [2]

## دابەشکردن لە زمان و زاراوەدا

**لە زمانی عەرەبیدا**: دابەش کردن (التقسیم) چاوگی (قَسَّم) یە لە بابی (فَعَّل) ، و بەمانای بەش بەش کردن و جیاکردنەوە دێت ، دەوترێت: (قَسَّمَ الشیءَ) : بەش بەشی کرد ، (وَقَسَّمَ الدهرَ) : پرژوبلاوی کرد ، (وَقَسَّمَ فلان أمرَه) : ئەندازەگیری کرد و خەملاندی ، وە بیری لێکردەوە کە چی بکات؟. (تقسیم الشی من الأعیان تجزئتە) : دابەشکردنی شتە بەرجەستەکان: پارچە چارچە کردنیانە. وە لە چەمکە هەمکییەکان دابەش کردنی هەمەکیە بۆ بەشە جیاکانی یان دژەکانی. لە زاراوەدا: لێکۆڵەران لایان وایە[3] کە دابەشکردن ڕێچکەیەکە دەگونجێت لە پێناسەکردنی شتەکاندا بەکار بهێنرێت ، لەوانەیە ئەفلاتون یەکەم

---

[1]. ڕاستتر وایە بوترێت الأبحاث العلمیة ، بە لام لەم دەربڕینە لامداوە بۆ ئەو هەڵە باوە لەسەر ئەو بنەمایە کە ئەم باشترە لە ڕاستی ناباو.

[2]. الکلنبوي : ل ۱۱۸ مامۆستا شێخ عومەری قەرەداغی قسەی لەسەر کردووە و فەرمویەتی : پاشان مەبەست بە دابەش کردن (التقسیم ) دابەش کردنی پێناسەکراوە (معرف) بۆ بەشەکانی وەك دابەشکردنی هەمەکی (کلی) بۆ خودی و ورس چونکە لە هێزی هەمە کیدایە شتێکە دابەش دەبێت بۆی ، ئەویش پێناسەیە بە تایبەت . . . . هتد .

[3]. المنطق التقلیدی ، للدکتور مهدی فضل الله ل ٨٤

کەسێك بێت کە بەم واتایە بەکاری هێنابێت. لە دیدگای منەوە: بێگومان دابەشکردن لە لێکۆڵینەوە زانستیەکاندا. . ڕێکخستنی لێکۆڵینەوەی بابەتەکەیە لەبواری ڕۆتینیەوە بە دابەش کردنی بۆ ئەو بەشانەی کە دەکەونە ژێریەوە ، کردنیان بە ناونیشان بۆ دەروازە و بەندەکان و باسەکان و لقەکان و. . . هتد

لەبەر ئەمە کە ڕەچاوکردنی ڕێساکانی لۆژیك گرنگیەکی گەورەی هەیە لە لێکۆڵینەوەی بابەتدا لە بواری بابەتیەوە هەر کاتێك بە تەواوی ڕێکخرا لە لایەنی ڕۆتینیەوە ، بە جۆرێك لێکۆڵینەوەکە دووربێت لەتێکەڵکردن و دووبارە کردنەوە و هێنانە ناوەوەی شتانێك کە لەدەرەوەی بابەتەکەن و کردنە دەرەوەی ئەو شتانەی لە بازنەی بابەتەکەدان. لەژێر ڕووناکی ڕێساکانی لۆژیکدا. . بابەتی هەموو لێکۆڵینەوەیەکی زانستی دابەشکراوە و ئەو بەشانەی لێی دەبنەوە و دەچنە ژێر چەمکە هەمەکیەکەی چەند بەشێکن ، و پەیوەندی لە نێوان ئەم بەشانەدا لێك جیابوونە (التباين) ، چونکە بەشدار و خاوەن بەش جیان لەگەڵ بەشدارەکەیدا ، بەم پێ یە دروست نیە باسکردنی بابەتێك لە بەشێکی سەربەخۆدا ، کەچی لە ڕاستی یەکەیدا بچێتە ناو بەشێکی سەر بەخۆی ترەوە. پەیوەندی لە نێوان دابەشکراو و هەریەك لە بەشەکانی گشتی بوون و تایبەت بوونی ڕەهایە لە ڕووی بەدیهاتن و بوونەوە ، هەرکات بەش بەدیهات. . بەشکراو لەگەڵیدا بەدی دێت بێ پێچەوانەی هەمەکی ، لەبەر ئەوەی بەشکراو گشتی ترە بەڕەهایی ، هەروەك بەش تایبەتترە بەڕەهایی ، وە بەشکراو هەندێجار بەدی دێت لەگەڵ یەکێك لە بەشەکانی دی بێ ئەوان. بۆ نمونە وشە دابەش کراوە ، وە ( ناو ، کردار ، پیت) بەشی ئەون لە زانستی نەحودا ، هەرکات ناو بەدیهات یان کردار یان پیت. . وشە بەدی دێت بێ پێچەوانەی هەمەکی ، هەندێجار بۆ نمونە لە کرداردا وشە بەدی دێت ، بێ ناو و پیت ، هەر بەو جۆرە تاوان لە یاسادا دابەش دەبێت بۆ چەندان جۆر تاوان بە چەند تێڕوانین و دیدێکی جیا ، وەك کوشتن و دزی و ناپاکی کردن لە سپاردە و هاو وێنەیان. هەموو کوشتنێك تاوانە بەڵام هەموو تاوانێك کوشتن نیە ، کەواتە ناونیشانی لێکۆڵینەوەی زانستی دابەشکراوە و ناونیشانی دەروازەکانی. . بەشەکانیەتی. بۆیە پێویستە ناونیشانی هەموو دەروازەیەك لەناونیشانی بابەتەکە دەرنەچێت ، هەروەها پێویستە ناونیشانەکانی بەشەکانی دەروازەیەك. . بچنە ژێر ئەم دەروازەیەوە ، چونکە لەو تایبەتترە بەڕەهایی ، لەبەر ئەوە ناکێت بێ ئەو بێتە دی. هەمان قسەش بکە لە

ناونیشانەکانی باسەکان دا بۆ هەر بەشێك لە بەشەکان و ناونیشانەکانی باسەکان بۆ هەر لێکۆڵینەوەیەك. شایانی باسە بێ ئاگایی خوێندکاران لە خوێندنی بالآدا لە ڕێساکانی دابەش کردنی لۆجیکی لە ڕێکخستنی نامەدا لە لایەنی ڕۆتینیەوە کایگەریەکی خراپی گەورەی هەیە لە ناتەواوی نامەکە و تێکەڵکردنی بەشەکانی و دووبارەکردنەوەی هەندێك باس دا ، یان هێنانە ناوەوەی هەندێك بابەت کە لە دەرەوەی باسەکەن و کردنە دەرەوەی هەندێك باس کە دەبێت لە ناوەوەی باسەکەدا بن.

## جۆرەکانی دابەش کردن

دابەش کردن دەبێتە چەند جۆرێکەوە بە چەند تێڕوانینێکی جیاواز وەك ئەمانەی خوارەوە:

**یەکەم: لە ڕووی پێوەرەوە دابەش دەبێت بۆ:** دابەش کردنی (عەقڵی) و دابەش کردنی (لێکۆڵینەوەیی) : إستقرائی ، دابەش کردنی پێودانگی (إعتباری) .

**أ_ دابەش کردنی عەقڵی:** دابەش کردنێکە لە نێوان ئەرێ و نەرێدا وەك: گومانلێکراو یان بێتاوانە یان تاوانبارە ، چونکە یان ئەوەیە تاوانبارکردنەکەی بە بەڵگەی وەرگیراوە یان نا ، **دووەم**: بێتاوانە ، و **یەکەم**: تاوانبارە. وەك: وشە: یان ناوە یان کردارە یان پیتە ، چونکە یان واتایەکی سەربەخۆ لە خۆیدا دەگەیەنێت یان نا ، **دووەم: پیتە** ، **یەکەم**: یان ماناکەی بەرامبەری دەکات لەگەڵ یەکێك لە سێ کاتەکەدا یان نا ، **دووەم: ناوە** ، **یەکەم: کردارە و هەروەها**. . . کەوابوو دابەشکردنی عەقڵی ئەوەیە کە: عەقڵ تەنها بە تێڕوانین لە دابەشکردنەکە جەخت دەکات لەسەر دابەش بوونی بەشکراوەکە بۆ لای چەند بەشێك.

**ب_ دابەش کردنی لێکۆڵینەوەیی (الاستقراء)** : دابەشکردنێکە پێوەرەکەی لێکۆڵینەوەی مەیدانی و ئاماری و خوێندنەوەیە ، ئەویش یان تەواوە یان ناتەواو:

**١_ لێکۆڵینەوەی تەواو (الإستقراء التام)** : بەڵگە هێنانەوەیە لەسەر بڕیاری هەمەکی بە گەڕان بە ناو هەموو بەشەکانیدا[١] ، وەك حوکمدان بەوەی: هەموو زیندەوەرێك . . دەمرێت ، بە بەڵگەی لێکۆڵینەوەی مەیدانی بەڵگە نەویستەوە بۆ هەموو بەشەکانی لە مرۆڤ

---

[١]. البرهان : ل ٢٩٨.

و ئاژەڵ و دار و درەخت و ڕووەك دا ، لێکۆڵینەوەی تەواو بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە لە سەلماندندا.

**٢_ لێکۆڵینەوەی ناتەواو:** بەڵگە هێنانەوەیە لەسەر بڕیاری هەمەکی بەلێکۆڵینەوە لە زۆربەی بەشەکانی ، وەك بڕیاردان لەسەر ئەوەی کە هەژاری هۆکاری سەرەکی یە لە ئەنجامدانی تاوانە ئابوریەکاندا پاش ئامارێکی ورد بۆ لێکۆڵینەوەی بەشەکانی ئەم هەمەکیە ، لێکۆڵینەوەی ناتەواو بەڵگەیەکی گومانی یە ، هەڵدەگرێت پێچەوانەکەی بسلێمێنرێت ، شایانی باسکردنە کە (إستقراء) بە هەردوو بەشەکەیەوە دەگەڕێتەوە بۆ باوەڕکردەییە لۆژیکیەکان ، باس لێکردنیشی لێرەدا تەنها لەڕووی دابەشکردنەوەیە نەك بەڵگەکاری و بەڵگەهێنانەوە.

**دووەم : لە ڕووی سروشتی دابەشکراو و بەشەکانیەوە:** دابەش کردن دابەش دەبێت لە ڕووی سروشتی دابەش کراو و بەشەکانیەوە بۆ: دابەش بوونی هەموو. بۆ بەشەکانی ، و دابەش کردنی هەمەکی بۆ هەندەکیەکانی:

١_ دابەش کردنی هەموو بۆ بەشەکانی: کە بریتی یە لە: بەدەست هێنانی ڕاستەقینەی شت بە ناوبردنی ئەو بەشانەی کە لێیان پێك دێت ، جا ئەگەر دابەشبووەکە شتێکی بەرجەستە بوو کە لە دەرەوەی زەینی مرۆڤدا هەیە. . دابەش کردنەکە دابەش کردنی هەمووە بۆ بەشەکانی ، کەواتە بەش کردنی هەموو (الکل) واتە: بەش بەش کردنیەتی (شیتەڵکردنیەتی) بۆ بەشە پێکهێنەرەکانی ، وە ئەو شتەی دابەشبوون هەڵدەگرێت پێی دەوترێت بەشکراو و ئەو بەشانەی کە بەشکراوەکە بۆی دابەش دەبێت پێیان دەوترێت بەشەکان ، وە هەر بەشێك لەوان پێی دەوترێت هاوبەش (قسیم) بە گوێرەی بەشەکانی تر ، وە هاوبەشی شت جیایە لێی وەك دابەش بوونی ئاو بۆ ئۆکسجین و هایدرۆجین ($h^2+o$) ، وە ئەم جۆرە لە دابەش کردن لەم لێکۆڵینەوەیەدا کە تایبەتە بە لۆژیکی تیۆریەوە. . مەبەست نیە و پەیوەندی بە لۆژیکی پراکتیکەوە هەیە.

**٢_ دابەش کردنی هەمەکی بۆ بەشەکانی (هەندەکیەکانی)** [1]: ئەویش بریتی یە لە خستنەپاڵی چەند بەندێکی جیاواز یان جۆریەجۆر بۆ دابەشکراوەکە بۆ دەست خستنی

---

[1]. رسالة الآداب في علم آداب البحث والمفاظرة_ محمد محي الدين عبدالحميد ل ١٧.

چەند بەشێکی جیاواز و پێچەوانە بە ژمارەی ئەو بەندانە ، مەبەست لەم دابەشکردنە لێکۆڵینەوەی هەموو بەشێکە بە شێوەیەکی سەربەخۆ بۆ بەدی هێنانی ئامانجە مەبەستەکە لێی. وەك دابەشکردنی بابەتێکی لێکۆڵینەوەی زانستی بۆ لق و پۆپەکانی کە لێی دەبنەوە و دەکەونە بارنەیەوە ، وەك دابەشکردنی کوشتن بۆ جۆرەکانی (چەشنەکانی) لە کوشتنی بە ئەنقەستی دەست درێژ کارانە ، و کوشتنی بە هەڵە ، کوشتنی نیمچە ئەنقەست: (لێدانێك دەبێتە هۆی مردن) ، کوشتنی ڕەوا ، جگە لە چەشنەکانی تری کوشتن بۆ لێکۆڵینەوەی گونجاندنی و ڕوونکردنەوەی حوکمی تایبەت پێیەوە و دانانی هەموو چەشنێك لە ژێر دەقێکی تایبەت بە خۆیدا. [١]

لایەنەکانی لێکچوون و جیاوازی لە نێوان دوو دابەشکردنەکەدا:

دابەشکردنی هەموو بۆ بەشەکانی لەگەڵ دابەشکردنی هەمەکی بۆ بەشەکانی. . ساز و گونجاون لە چەند ڕووەوە و جیاوازیشن لە یەکتری لە چەند ڕووی ترەوە:

أ_ **بوارەکانی لێکچوونیان** : پێویستە لە هەریەك لەم دوو دابەشکردنەدا ئەم مەرجانە هەبن:

١_ پێویستە هەموو بەشەکانی دابەشکراوەکە بگرێتەوە یان هەموو هەندەکیەکانی بگرێتەوە و یەك بەشی لێ دەرنەچێت.

٢_ دەبێت ڕێگربێت لە هاتنە ناوەوەی بەشێکی تر کە لە بەشەکانی دابەشکراوەکە نەبێت.

٣_ پێویستە هەموو بەشێك جیا بێت لە هاوبەشەکەی.

**ب_ بوارە جیاوازەکان :**

أ_ هەموو بەشێك لە دابەشکردنی (هەموو) بۆ لای بەشەکانی جیاوازە لەگەڵ دابەشکراوەکەیدا لە ڕووی چەمکەوە ، بەڵام کۆ دەبێتەوە لەگەڵیدا لە ڕووی بەدی هاتنەوە بە پێچەوانەی بەش لە دابەشکردنی هەمەکی بۆ هەندەکیەکانی. لەبەر ئەوەی ئەو تایبەتترە بە ڕەهایی لە دابەشکراوەکەی.

---

[١]. مەبەست لە هەندەکی : بەشی ڕاستە قینە یە کە لە کە سێکدا کورت هەڵدێنێت یان یەك ڕو دلو دا .

٢_ نابێت هەموو (الكل) بدرێتە پاڵ بەشەکەی ، بۆنمونە نا وترێت: بزوێنەر ئۆتۆمبیلە ، بەڵام دەتوانین دابەشکراو ببڕدرێت بەسەر بەشەکانی دا لە دابەشکردنی هەمەکی بۆ بەشەکانی ، بۆ نمونە دەوترێت: کوشتن تاوانە ، دزی تاوانە. . . هتد.

٣_ نابێت لە دابەشکردنی هەموو بۆ بەشەکانی لە نێوان بەشەکاندا پیتی جیابوونەوە دابنرێت کە ئەویش پیتی (إما) یە واتە یان ، یاخود پیتێکی تر هەمان مانا بگەیەنێت. کەواتە ناوترێت: ئاو هایدرۆجینە یان ئۆکسجین ، بە پێچەوانەی دابەش کردنی هەمەکی بۆ هەندەکیەکانی ، بۆ نمونە دەوترێت: گەرەنتی یا گەرەنتی دەستە یاخود گەرەنتی گرێبەست یان لە ناوبردن.

**جۆرەکانی دابەشکردنی هەمەکی بۆ هەندەکیەکانی:** دابەشکردنی هەمەکی بۆ هەندەکیەکانی لە ڕووی پەیوەندی لۆژیکی یەوە لە نێوان بەشەکانیدا دەبێتە دوو بەشەوە:

**یەکەم: دابەشکردنی ڕاستەقینەیی.**

**دووەم: دابەشکردنی پێودانگی.**

**١_ دابەش کردنی ڕاستەقینەیی:** ئەو دابەشکردنەیە کە بەشەکان تێیدا جیابن لە زەینی مرۆڤدا و لە دەرەوەی زەینی مرۆڤدا ، واتە لەواقیعدا و لەڕاستیدا ، بەو پێیە کە عەقڵ بۆ هەموو بەشێك ڕاستەقینەیەکی دیاریکردووە کە جیایە لە حەقیقەتی بەشەکانی تر ، وە بە هۆیانەوە جیا دەبێتەوە لە جگە لە خۆی ، بە جۆرێك لە دەرەوەی زەین شتێك نیە کە بگونجێت ڕاستەقینەیی یە لێکجیاکانی تێدا بێتە دی یا بەپێی چەند پێودانگی جۆر بە جۆریش بێت ، بۆ نمونە: دابەشکردنی تاوان بۆ جۆرەکانی لە کوشتن و دزی و ناپاکی و سیخوڕی و بەرتیل و ساختەکردن و وێنەی ئەوانە. دابەشکردنی ڕاستەقینەیی دوو جۆر لەوانە لە ڕووداوێکدا کۆنابێتەوە ، چونکە ڕاستەقینەی هەر تاوانێك جیاوازە و جیایە لەگەڵ ڕاستەقینەی تاوانێکی تر دا لە جۆرێکی تر ، وەك ئەوە لە بابەتە ئەندازەییەکاندا دابەش کردنی گۆشە بۆ گۆشەی (تیژ) و وەستاو و (قائمة) و کراوە (منفرجة) ، بێگومان عەقڵ بۆ هەر یەکێك لەم بەشانە ڕاستەقینەیەکی داناوە کە جیای دەکاتەوە لە دوو جۆرەکەی تر ،

کە بە هۆیەوە جیابونەوەیەك لە نێوان هەمووداا (الكل) بەدی دێت بە جۆرێك وێنا ناکرێت کە لە دەرەوەی زەینی مرۆڤدا یەك گۆشە هەبێت کە تیژ و کراوە و وەستاو بێت لە یەك کاتدا.[1]

٢_ **دابەشکردنی پێودانگی (الإعتباري)** : ئەو دابەشکردنەیە کە بەشەکان تێیدا جیاوازن لە زەینی مرۆڤدا تەنها لای عەقڵ. بەڵام دەگونجێت لە دەرەوەی زەین شتێك هەبێت ڕاستەقینەکانی بەشەکانی تێدا بێتە دی بەچەند پێودانگ و دیدێکی جیاواز. کورتەی قسە: پەیوەندی لۆژیکی لە نێوان بەشەکانی هەمەکیدا کە دابەش کرابێت بە دابەشکردنێکی ڕاستەقینەیی جیاییە ، وە لە بەشەکانی (هەموو) دابەش کراوەکە بە دابەشکردنێکی پێودانگی. . جیاواز بوونە ، ئەگەر بەشەکانی لێکترازابوون لە عەقڵ و دەرەوەدا. . هەموو بەو شێوەیەی ڕوونمان کردەوە لە دابەش کردنی ڕاستەقینەدا. . ئەوا بە لێکجیا دەدرێنە قەڵەم ، کە دروستە بەهەر بەشێك لەو بەشانە بوترێت کە: جیایە لەوی تر یان لە جگە لە خۆی. ئەگەر تەنها لە زەینی مرۆڤدا جیابوون نەك لە دەرەوە و واقیعدا. . پێیان دەوترێت جیاواز.

بەرهەمی جیاوازی نێوان دوو دابەشکردنەکە:

ئەم جیاوازی یە لۆژیکیەی نێوان ئەم دوو دابەشکردنە گرنگی گەورەی هەیە لە چارەسەرکردنی ڕاجیایی نێوان زانایانی یاسادا لە زۆرێك لە دابەش کردنە یاساییەکاندا ، وەك لەم نمونانەی خوارەوەدا هاتووە :

**یەکەم**: ڕاجیایی لە دابەشکردنی بەرپرسیارێتی مەدەنی بۆ گرێبەستی (العقدیة) و کەمتەرخەمی (التقصیریة) ، یاسازانەکان ڕای جیاوازیان هەیە دەربارەی ئەم دابەشکردنە: هەندێکیان ڕایان لەسەر جووت کردنی بەرپرسیارێتی مەدەنی و پێویست بوونی جیاکردنەوەیە لە نێوان بەرپرسیارێتی مەدەنی گرێبەستی و بەرپرسیارێتی مەدەنی کەمتەرخەمی ، هەندێکیشیان نکوڵی لەم دوانەییە دەکەن و باوەڕی بە یەکێتی بەرپرسیارێتی هەیە ، هەر لایەك کۆمەڵێك بەڵگەی دەقی یاسایی و بەڵگەگەلێکی عەقڵی

---

[1]. رسالة الأداب سەرچاوەی پێشو ل ٢١ _ ٢٢.

دێنێتەوە بۆ بەهێزکردنی بۆچوونەکەی. بەشێك لە بەڵگەکانی پشتیوانانی دوانەیی ئەمانـەی خوارەوەن:

١_ جیاوازی سروشتی هەڵـە لـە هـەردوو بەرپرسـیارێتیەکەدا ، لـە بەرپرسـیارێتی گرێبەستیدا دەگونجێندرێت بەوەی بەجێ نەهێنانی ئـەرکێکی گرێبەست کردنیـە بەرامبـەر گرێبەسـتکارەکەی تـر ، کەچـی لـە بەرپرسـیارێتی کەمتەرخەمێتیـدا. . بـەجێ نـەهێنانی ئەرکێکی یاسایی یە بەرامبەر کەسانی تر بە ڕەهایی.

٢_ جیاوازی لە پابەندگەکەدا ، لە بەرپرسیارێتی کەمتەرخەمێتیدا ، جێگەی پابەندبوون هێنانـەوەی بەڵگـە ئاشـکرا پێویسـتەکانە پـێش گرێبەسـت کـردن و ئـەنجام نـەدانی هـیچ تەڵەکەیەك یان فێڵێك کە زیان دەدات لە گرێبەستکارەکەی تر ، هەروەك لە بەجێ نەهێنانی بـە ناپـاکی کـردن دەبێـت لـەو سپاردەیەدا یـان بـە شـارینەوەی کەموکوڕیـەکانی شـتە فرۆشراوەکە بۆ نمونە ، کەچی پابەندگە لە بەرپرسـیارێتی گرێبەسـتێتیدا جێبـەجێ کردنـی گرێبەستەکەیە بەو جۆرەی داوا کراوە.

٣_ لەماوەی بژاردنی زیاندا لە بەرپرسێتی گرێبەستێتیدا بەجێ نەهێنەر پابەنـد ناکرێـت بە بژاردنێکی ماددی ڕاستەوخۆی چاوەڕوان کراو نەبێت لە کاتی گرێبەست کردنەکـەدا ، بـە مەرجێك بەجێ نەگەیاندنی پابەندبوونەکە لە فێڵ کـردن یـان هەڵەیـەکی گـەورەوە دروسـت نەبووبێ ، لە کاتێکا لە بەرپرسیارێتی کەمتەرخەمێتیدا دەربارەی زیانەکە پرسـیار دەکرێـت بە ڕەهایی ئیتر زیانەکە ماددی بێت یان مەعنەویەکی چاوەڕوانکراو یان نا.

٤_ لەبەر پرسـیارێتی گرێبەسـتێتیدا مەرجـە شـیانی گرێبەسـت کردنـە بـە پێچـەوانەی بەرپرسیارێتی کەمتەرخەمێتی یەوە بێت ، کە تێیدا جگە لە توانستی جیاکردنەوە بە مـەرج ناگیرێت بەڵکو جاری وا هەیە توانست و شیان بە ڕەهایی بەمـەرج ناگیرێـت ، هـەروەك لـەو یاسایانەی کاریگەرن بە فیقهی ئیسلامیەوە هەیە.

٥_ لە ڕووی سەلماندنەوە زیان گەیاندن بەتەنها بە جێبەجێ کردنی پابەنـدبوون بەسـە بۆ بەڵگە بوون لەسەر گریمانەکردنی هەڵە. چونکە بـاری گرانـی سـەلماندنی نـەبوونی هەڵـە قـەرزار توشـی بەرپرسـیارێتی گرێبەسـتێتی دەکـات ، بـە پێچـەوانەی بەرپرسـیارێتی کەمتەرخەمێتیەوە ، بێگومان باری قورسی سەلماندنی هەڵە تێیدا دەکەوێتـە سـەر کەسـێك داوای دەکات بە پشت بەستن بە بەردەوامی و مانەوەی بێتاوانی بناغەیی.

٦_ لەڕووی ورپاكردنەوەوە شیاو بوون و شایستە بوونی قەرزدەرەكە بۆ بژاردنەوە پێویستە لە پێشدا وریا بكرێتەوە لە بەرپرسیارێتی گرێبەستێتیدا بە پێچەوانەی بەرپرسیارێتی كەمتەرخەمیێتی.

٧_ لە ڕووی ماوەی بەسەرچوونەوە ، ماوە بەسەر چونێك كە لابەری داوای بەرپرسیارێتی كەمتەرخەمیێتی یە تێپەڕ بوونی سێ ساڵە ، لە بەرواری زانینی بەهەڵە زیان لێ كەوتوەكەوە ئەو زیانەی لێی كەوتووە ، بە پێچەوانەی بەر پرسیارێتی گرێبە ستێتیەوە ، كەوابوو ماوە بەسەرچوونێك كە كاریگەری هەبێت تێیدا. . ماوە بەسەرچوونی درێژە واتە ١٥ساڵ لە ڕۆژی ڕوودانی كارە نارەواكەوە.

٨_ لە ڕووی هاوكارییەوە ، پێویستە بوونی هەبێت لە نێوان بەرپرسیارێتی مەدەنی لە حاڵەتی چەندێتی لە بەرپرسیارێتی كەمتەرخەمێتیا ، بە پێچەوانەی گرێبەستێتیەوە كە هیچ بوونی نیە مەگەر بەدەق.

٩_ دەكرێت ڕێكەوتن بكرێت لەسەر بەخشین لە بەرپرسیارێتی گرێبەستێتی دا ، بە پێچەوانەی كەمتەرخەمێتیەوە كە بەخشین و لێبوردن تێیدا بەتاڵە لەبەر ئەوەی دژی یاسای گشتی یە.

١٠_ دادگای تایبەت بە وردبوونەوە لە بابەتەكە دادگایی دلوا لەسەر تۆماركراوەكەیە لە بەرپرسیارێتی گرێبەستێتیدا ، بەڵام دادگای شوێنی ڕوودانی كارە زیاندەرەكەیە لە بەرپرسیارێتی كەمتەرخەمێتیدا .

١١_ لە ناكۆكی یاساكاندا ئەو یاسایەی كە پێویستە بچەسپێندرێت لە بەرپرسیارێتی كەمتەرخەمێتیدا. . یاسای ئەو دەوڵەتەیە كە هۆكاری پابەندبوونەكەی تێدا ڕوویداوە ، بەڵام لە بەرپرسیارێتی گرێبەستێتیدا یاسای ئەو وڵاتەی كە گرێبەستەكەی تێدا تەواو كراوە لەبەرچاو دەگیرێت.[1]

[1]. الستاذ الدكتور حسن علی ننون سەرچاوەی پێشو ل ٦١_ ٦٤ الدكتور احمد محمد سعد مستشفی الخاص عن أخطاء الطبیب ومساعدیه ل ١٨٦ الدكتور احمد سلامة نظریة الا لتزام الكتاب الأول مصادر الإ لتازم ط ١٩٧٥ ل ٢٥٧.

پشتیوانانی بیرۆکەی یەکێتی بەرپرسیارێتی و دابەش نەبوونی بۆ گرێبەستێتی و کەمتەرخەمێتی هەستاون بە بەرپەرچ دانەوەی ئەم بەڵگانە سەرەڕای پشتبەستن بە بەڵگەکانیان ، کە بوارمان نیە بۆ خستنە ڕوویان ، سەرباری ئەوەی کە سود لەم ناکۆکی و راجیایانەدا نیە لەبەر ئەوەی لەسەر تێکەڵکردنی دابەشکردنی راستەقینەیی و دابەشکردنی پێودانگی ، چونکە دابەشکردنی بەرپرسیارێتی مەدەنی گرێبەستێتی و کەمتەرخەمێتی دابەش کردنێکی پێودانگی و دیدگاییە و راستەقینەیی نیە ، کەوابوو هەردووکیان جیاوازن لە هەندێك بڕیار و ڕەگەز و پێکهێنەردا لەبەر جیاوازییان لە زەیندا ، وە پێکدەگەن لە چەند کارێکدا چونکە جیانین لە دەرەوەی زەیندا. کەواتە ئەم جیاوازیانە نا لۆژیکین لەبەر دوو هۆکار:

**یەکەمیان:** تێکەڵکردن لە نێوان دابەشکردنی راستەقینەیی و دابەشکردنی پێودانگی.

**دووەم:** تێکەڵکردن لە وەپاڵدانی لۆژیکیدا لە نێوان دوو بەرپرسیارێتیەکەدا لە ڕووی چەمك و بەدی هاتنەوە ، کەوابوو هەردوك جیان لە ڕووی چەمکەوە ، هەروەك لە هەندێك حوکم و پێکهێنەردا یەك دەگرنەوە بە پێی بەدیهاتن لە چەند دیدگایەکی جۆر بەجۆرەوە .

**دووەم:** راجیایی لە دابەشکردنی مافی داراییدا بۆ مافی ماددی و مافی کەسی[1]:

بێگومان هەندێك لە زانایانی یاسا هەوڵی هەرەس پێهێنانی ئەم دابەشکردنەیان داوە ، پاشان پشتیوانانی ئەم ڕێچکەیە ڕای جیاوازیان خستوەتە ڕوو دەربارەی دیاریکردنی سروشتی یەکبوون لە نێوانیاندا ، هەندێکیان مافی ماددی تێکهەڵکێش کردووە لە مافی کەسیدا وەك دیاری کردنی سروشتی یەك بوون لە نێوانیاندا ، هەندێکی تریشیان ، مافی ماددی تێهەڵکێش کردووە لە مافی کەسیدا و هەموو مافە داراییەکانیان بە مافی کەسی لە قەڵەمداوە ، لەسەر ئەو بناغەیەی کە ئەم مافانە تەنها پەیوەندی نێوان کەسەکانن. کەچی ڕێچکەیەکی پێچەوانە مافی کەسێتی گەڕاندۆتەوە بۆ مافی ماددی لەسەر ئەو بناغەی کە هەموو ڕەگەزەکانی ئۆباڵی دارایی کە لە دیدی یاساناسەکاندا پێك دێت لە دوو ڕەگەزی ئەرێنی (مانەکان بەڕەهایی) و نەرێنی (پابەندییەکان) ، پاشان دەڵێت گرنگ نیە کێ لایەنی حەقە ، بەڵکو گرنگ شوێنەکەیەتی ، وە شوێنی مافی کەسی لە ڕووی گرنگیەوە هەمان

[1]. استاذنا شاكر ناصر (رحمة الله عليه) الحقوق العينية الأصلية ل ٥٠_٥٢.

شوێنی مافی ماددی یە ، وە هەندێکیان لایان وایە ئەو دابەش کردنەی باسمان کرد ڕاستە و جیاکردنەوە لە نێوان مافی ماددی و کەسیدا لەم ڕووانەی خوارەوەدایە[1] :

١_ جیاوازیان لە چەمك و چیەتدا ، چەمکی (مافی ماددی و چیەتەکەی) بریتی یە لە: دەستەڵاتێکی ڕاستەوخۆی کەسێکی دیاری کراوە بەسەر شتێکی دیاریکراودا ، کە دەسەڵاتی مومارەسەکردنی مافی دەستکاری و بەکارهێنان و سودوەرگرتن و هەڵگرتنی دەداتێ ، وەچەمکی (مافی کەسی) بریتی یە لە: دەسەڵاتێکی بڕیاردراو بۆ کەسێك پێش کەسێکی تر ، دەستەڵاتی دەداتە کەسی یەکەم کە کەسی دووەم ناچار بکات شتێك بدات یاخود ڕێگری بکات لە کارێك.[2]

٢_ بۆ خاوەنی مافی (ماددی) هەیە مافی خۆی بەکار بهێنێت بێ نێوانکار ، بە پێچەوانەی مافی (کەسی) چونکە بۆ خاوەن قەرز نیە هەڵسوکەوت بکات لە مافی کەسی خۆیدا بێ نێوانکاری قەرزارەکە.

٣_ لە ڕووی پێکهێنەرەکانەوە ، پێکهێنەرەکانی مافی کەسی سێ دانەن: خاوەن ماف ، کەسێك مافەکەی بەسەرەوەیە و بابەتی مافەکە ، کەچی لە مافی (ماددی) دا دوو پێکهێنەر هەیە: خاوەنی ماف و بابەتەکەی .

٤_ لە ڕووی شوێنەوە: شوێنی مافی ماددی شتێکی دیاری کراوە لە خوددا ، لە کاتێکدا شوێنی مافی کەسی: کردنە یان نەکردنە یان شتێکە قەرزار پێوەی پابەندە بۆ خاوەن قەرز هەیە لێی وەرگرێتەوە.[3]

ڕاجیایی لە دابەشکردنی مافی دارایی بۆ مافی ماددی شتی و کەسی هەمدیس لە سەر تێکەڵکردنی دابەشکردنی ڕاستەقینەیی و دابەشکردنی پێودانگی بنیات نراوە لە لایەکەوە و لە نێوان جیایی بە پێی چەمك و جیایی بە پێی بە دیهاتن دا لە لایەکی ترەوە. کەواتە ئەم دابەشکردنە پێودانگیە لەبەر ئەمەیە هەردوو بەشەکە جیاوازن لە چەمك لە زەیندا و پێك دەگەنەوە لە هەندێ ڕەگەز و حوکمدا لە دەرەوەی زەیندا. ئەگەر دابەشکردنەکە

---

[1]. لە لایەن گرانی م/ شاکر ناصر سەر چاوەی ڕابوردوو
[2]. استاذنا سليمان موقص المدخل للعلوم القانونية ل ٢٥٣
[3]. استاذ عبد المنعم البدراوي المدخل القانون ل ٧٢٣

ڕاستەقینەیی بووایە. . ئەوا ئەم پێکگەشتنە نەدەبوو بە هیچ شێوەیەك لە شێوەکان: نە لە زەیندا و نە لە دەرەوەی زەیندا.

**سێ یەم**: دابەش بوونی یاسا بۆ یاسای گشتی و یاسای تایبەت:

دابەشکردنێکی پێودانگی و دیدگاییە و دابەش کردنێکی ڕاستەقینەیی نیە ، لەبەر ئەمە لە ڕووی چەمکەوە لە زەیندا جیاوازن و یەکدەگرنەوە لە واقیع و دەرەوەی زەیندا بە پێی دیهاتن لە هەندێ شتدا.

**یاسای گشتی لە ڕووی چەمکەوە**: بریتیە لە کۆمەڵێك ڕێسا کە قەوارەی دەوڵەتێك ڕێك دەخات و ئەو پەیوەندیانەش کە دەوڵەت لایەنە تێیاندا بەو سیفەتەی خاوەن دەسەلاتە.

**چەمکی یاسای تایبەتیش**: بریتیە لە کۆمەڵێك ڕێسا کە پەیوەندی نێوان تاکەکان ڕێك دەخات یان نێوان ئەوان و دەوڵەت بەو سیفەتەی کە کەسێکی ئاسایی یە) .[1]

وە لەسەر بناغەی جیاوازی لە چەمکدا جیاوازیان هەیە لە ڕووی لایەنەکانی پەیوەندیەکانەوە ، وە لە ڕووی مەبەست لێیان و بابەت و سروشتی ڕێساکانیانەوە ، بەلاَم لەگەڵ ئەوەشدا کە دابەشکردنەکە دابەشکردنێکی ڕاستەقینەیی نیە. . نێوانێکی ڕەها لە نێوان دوو دابەشکردنەکەدا نیە.

ڕاگر (لیۆن دکی) [2] دەڵێت: خۆپاراستن پێویستە لە هەڵەیەکی بلاَو بە گشتی کە ناوەڕۆکەکەی دروست کردنی ناوبڕیکی ڕەهایە لە نێوان یاسای گشتی و یاسای تایبەتدا ، هیچ گومانێك نیە لە پێویستی جیاکردنەوە لە نێوان ئەم دوو لقەی یاسادا ، بەلاَم ئەوە هەیە دەبێت دیوارێك دروست نەکرێت کە نەتوانرێت تێپەڕێنرێت لەنێوانیاندا ، ئەوەی کە بیرۆکەیەکی یاساییە. . هەروا بەردەوام بوونی هەیە چ لەیاسای گشتیدا چ لە یاسای تایبەت دا. ئەم یاساناسە گەورەیە سەرەڕای نەخوێندنی زانستی لۆژیك ، بەلاَم لەگەڵ ئەوەشدا بەبیری قوڵی پەی بەوە بردووە کە دابەشکردنی یاسا بۆ یاسای گشتی و یاسای تایبەتی. . دابەشکردنێکی پێودانگی یە نەك دابەش کردنێکی ڕاستەقینەیی ، کەوابوو جیایی بەپێی

---

[1]. عبد المنعم البدراوی ، المرجع السابق ٧٢٣.

[2]. دروس في القانون العام ، الأستاذ العميد ليون دكي ، ترجمة: د. رشدي خالد: لا ١٥

چەمکە نەك بەدیهاتن ، وە بە پێی زەینە نەك دەرەوەی زەین ، هەروەها مامۆستای هێژا دکتور (حسن ذنون) بە بلیمەتیە بێ وێنەییەکەی خۆی پەی بەم ڕاستیە بردووە کاتێك هەڵوێستی خۆی روونکردەوە دەربارەی دوو بیرۆکەی یەکبوون و دوانەیی دوو بەرپرسیارێتیەکە [1] ، چونکە بەڕوونی لە جیاوازی ئەم دوو بەرپرسیارێتی یە دواوە بە پێی چەمك و چیەت و تایبەتیەکانیان و یەکگرتنەوەیان لە هەندێك خاڵدا بەپێی بەدیهاتن و ڕاستی ئەم دووانە یەك دەگرنەوە بە پێی بەدیهاتن لە دەرەوەی زەین دا سەرەڕای جیاییان لە زەینی مرۆڤدا .

---

[1]. لە پەرتوکی المبوط فی المسؤلیة ب ١ ل ٧١.

# پوختەی بەند

مەبەستە وێناکردەییە لۆژیکیەکان و پەیوەندیان بە پێناسەکانی زاراوە یاساییەکانەوە بۆ پێناسە چەند مەرجێکی لۆژیکین ، لەوانە: دەبێت پێناسە و پێناسەکراو یەکبن لە خوددا و جیاواز بن لە ڕەچاوکردندا ، دەبێت پێناسەکە ئاشکراتر بێت و دەبێت گشتگر و ڕێگریێت ، وە دەبێت بە شوێنەوار و حوکم نەبێت. پێناسەش چەند جۆری هەیە ، لەوانە پێناسەی لۆژیکی و نالۆجیکی ، وە لۆژیکیش وشەیی و ناوی و بێدارکردنەوەیی و ڕاستەقینەیی یە ، ڕاستەقینەییش سنورداری تەواو و سنورداری ناتەواو و ڕەسمی تەواو و وڕەسمی ناتەواوە ، وە دابەش کردن بەشێکە لە ڕەسمی ناتەواو ، دابەش کردنیش چەند جۆرێکە: عەقڵی و لێکۆڵینەوەیی ، دابەشکردنی هەموو . بۆ بەشەکانی ، وە دابەشکردنی هەمەکی بۆ هەندەکیەکانی ، وە لەم بەشەیە دابەشکردنی بابەتی توێژینەوەی زانستی بۆ دەروازەکان و بەندەکان و مەبەست و باسەکان. دابەشکراو گشتی ترە بەرەهایی لە بەشەکانی ، وە بەشەکان تایبەتترن بەرەهایی ، وە هەموو بەشێك جیایە لە هاوبەشەکەی. کەوابوو نەچوونە ناویەك و نە دووبارە بوونەوە لە بەشەکاندا نیە ، دابەش کردن ڕاستەقینەیی و پێودانگین ، وە دابەش کردنە یاساییەکان هەمویان پێودانگین.

## سەرچاوەکان

**یەکەم : تەفسیرەکانی قورئان و فەرموودەی پیرۆز**

١_ تفسير الرازى : محمد الرازى الشهير بخطيب الرى .

٢_ صحيح مسلم : الإمام أبوالحسن مسلم بن الحجاج النيسابورى.

**دووەم : الفقه الإسلامى وأصوله :**

٣_ الإختيار لتعليل المختار : الامام عبد محمود الموصليى .

٤_ إعانة الطالبين : العلامة أبو بكر الدمياطى .

٥_ الأنوار : العلامة يوسف الأردبيلى .

٦_ بداية المجتهد : ابن رشد .

٧_ تبيين الحقائق شرح كنز الدقائق : عثمان بن على الزيعلى .

٨_ تحفة المختار : ابن حجر الهيتمى .

٩_ التوضيح شرح التنقيح : صدر الشريعة ، مع التلويح : التفتازانى .

١٠_ جمع الجوامع : ابن السبكى ، وشرح للجلال المحلى ، مع حاشية البانى .

١١_ حاشية الدسوقى على الشرح الكبير : الشيخ محمد عرفة .

١٢_ حاشية رد المحتار : ابن عابدين ، على الدر المختار شرح تنوير الأبصار .

١٣_ الروضة البيهة شرح اللمعة الدمشقية : الشهيد زين الدين العاملى .

١٤_ الفروق : القرافى (الإمام أحمد بن إدريس ) .

١٥_ مجلة الأحكام العدلية .

١٦_ المحلى ، ابن حزم الظاهرى ( الإمام على بن أحمد) .

١٧_ مواهب الجليل شرح مختصر الخليل : الخطاب .

**سێیەم : لۆجیك و فەلسەفە (المنطق والفلسفة ) .**

١٨_ إحصاء العلوم : الفارابى ، نشر عثمان محمد .

١٩_ البرهان : العلامة إسماعيل الكلنبوى ، مع حاشية الشيخ عمر القرداغى .

٢٠_ تنوير البرهان : الشيخ حسن الموصلى .

٢١_ تهذيب المنطق : التفتازانى ، بشرح الخبيصى مع حاشية الشيخ العطار .

٢٢_ الدماغ البشرى : الدكتور طارق إبراهيم حمدى .

٢٣_ شرح تهذيب المنطق : العلامة حسن بن أحمد الجلال .

٢٤_ علم المنطق : الأستاذ أحمد عبده خير الدين .

٢٥_ القواعد المنطقية فى شرح الرسالة الشمسية : العلامة السيد الشريف الجرجانى .

٢٦_ مقاصد الفلاسفة : الغزالى .

٢٧_ المنطق التقليدى : الدكتور مهدى فضل الله .
٢٨_المنطق الصورى ومناهج البحث فى العلوم الرياضية والطبيعية : للدكتور على عبدالمعطى .
٢٩_ منطق العرب من وجهة نظر المنطق الحديث : الدكتور عادل فاخورى ، الطبعة الثانية دار الطليعة ، بيروت .
٣٠_ المنطق فى شكله العربي : الشيخ محمد المبارك عبدالله ، مطبعة علي صبيح .
٣١_ الموسوعة الفلسفية المختصرة : ترجمة فؤاد كامل وجلال العشري وعبد الرشيد الصادق .

**چوارەم : سەر چاوە یاسایی یەكان .**

٣٢_ أصول الالتزامات : الدكتور سليمان مرقس .
٣٣_ الالتزامات في الشريعة الإسلامية والتشريعات المدنية العربية : المؤلف .
٣٤_ التعليق على نصوص القانون المدني المصري : الأستاذ أنور طلبة .
٣٥_ الحقوق العينية الأصلية : الأستاذ شاكر ناصر.
٣٦_ دروس في القانون العام : الأستاذ العميد ليون دكي ، ترجمة .د رشيد خالد.
٣٧_ شرح عقد البيع في القانون المدني العراقي : الدكتور مالك دوهان الحسن .
٣٨_ عقد البيع دراسة مقارنة : الدكتور كمال قاسم ثروت .
٣٩_ القانون المدني العراقي والأردني والليبي والكويتي واليمني .
٤٠_ المبسوط في المسؤولية المدنية : الدكتور علي حسن ذنون .
٤١_ مجموعة الأعمال التحضيرية المصرية .
٤٢_ المدخل للعلوم القانونية : الأستاذ سليمان مرقس .
٤٣_ المدخل للقانون الخاص : الدكتور عبدالمنعم البدراوي .
٤٤_ المذكرة الإضاحية للقانون المدني المصري .
٤٥_ المسؤلية الجنائية : الدكتور محمد مصطفى القللي .
٤٦_ المسئوولية المدنية بين التقليد والإطلاق : الأستاذ إبراهيم الدسوقي .
٤٧_ مسؤولية المستشفى الخاص عن أخطاء الطبيب ومساعديه : الدكتور أحمد محمد سعيد .
٤٨_ مصادر الإلتزام : الدكتور عبد المجيد الحكيم .
٤٩_ مصادر الحق : الأستاذ الدكتور عبدالرزاق السنهوري .
٥٠_ نظرية الإلتزام _ الكتاب الأول ، مصادر الإلتزام : الدكتور أحمد سلامة.
٥١_ النظرية العامة للإلتزامات: الأستاذ الدكتور حسن ذنون.
٥٢_ النظرية العامة للإلتزام وفق القانون الكويتي: الدكتور عبد الحي حجازي.
٥٣_ الوسيط: للأستاذ الدكتور السنهوري.

**پێنجەم: فەرهەنگ و كتێبەكانی زمانەوانی:**

٥٤_ ألفية ابن مالك بشرح الأشموني ، مع حاشية محمد صبان.

٥٥_ الصحاح في اللغة والعلوم تجديد صحاح العلامة الجوهري ، المصطلحات العلمية والفنية: تقديم الشيخ عبدالله العلائي ، تصنيف مرغشيلي و أسامة مرغشيلي.

٥٦_ لسان العرب: ابن منظور ، جمال الدين محمد بن مكرم الأنصاري (٦٣٠ — ٧١٨هـ) طبعة مصورة من مطبعة بولاق.

٥٧_ الموسوعة العربية الميسرة.